# ئەمە ( باوکم )ە !

**نووسینی:** موحەممەد سەعید ڕەمەزان بووتی

**وەرگـــــێڕانـــــی :** قـــاســـم ســـــەلام

**دیزاینی ناوەوەو بەرگ :** زەردەشـــت کاوانـــی

**ژمـــارەی لاپـــەڕە :** ٣٧٦ لاپەڕە ١٤ * ٢١ سم

**نۆرەی چـاپ :** چاپی یەکەم ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان**
**ژمارە سپاردنی ( ٧٨٥ ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە**

# ئەمە (باوکم) ە!


نوســـینی

موحەممەد سەعید ڕەمەزان بووتی

وەرگێڕانی

قاســـم ســـەلام

## پێشەکی وەرگێڕ

قاسم سەلام (٦/٦/ ٢٠٢٠)

بەنـاوی خـوای بەخشـندەی بەبەزەیـی، صەڵات و سـەلام لەسـەر پێغەمبـەری خاتـەم و شـوێنکەوتووانی تـا ڕۆژی دوایی...

ئـەم کتێبـە یەکێکـە لـە ناوازەتریـن کتێبەکانـی نـاوبراو ڕەحمەتی خـوای لێبـێ، هـەروەك خـۆی لـە پێشـەکیەکەیدا ئامـاژەی پێکردووە کـە: بـەراوورد بـە کتێبەکانـی تـری خەڵکێکـی زۆر زیاتـر باوەشـیان بۆ ئـەم کتێبـە کردۆتـەوە.

بەنـدە وەك وەرگێـڕ هـەم سـوودو هـەم چێژێکـی زۆرم لەخوێندنـەوەو وەرگێڕانیـدا بینیـوە، ئومێـد دەکـەم تـۆی خوێنەر زۆر زیاتـر سـوودی لـێ ببینـی و چێـژی لـێ ببـەی، سـەرەڕای ئـەوەی کتێبەکـە لـە ڕواڵەتـدا باسـی ژیـان و بەسـەرهاتی زانـاو پیاوچاکـی کـورد (مـەلا ڕەمـەزان)ی باوکـی زانای پایەبـەرز موحەممەد سـەعید ڕەمـەزان بووتیـە، بـەڵام جگـە لـە شـارەزابوون لـە ژیاننامـەی ئـەم پیـاوە گەورەیـە، خوێنـەر لەمـاوەی خوێندنـەوەی کتێبەکـە چەنـد دەسـتکەوتێکی تریشـی دەبـێ.

یەکـێ لـەو دەسـتکەوتانە شـارەزا بوونـە لـە ژیانـی خـودی نووسـەر، کـە بریتییـە لـە زانـای گـەورە (موحەممـەد سـەعید

ڕەمــەزان بووتــی) لەبــەر ئــەوەی باوكــی ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ تەمەنێكــی زۆری بــووەو (١٠٤) ســەدو چــوار ســاڵ ژیــاوە، لــە زۆربــەی هــەرە زۆری وێســتگەكانی تەمەنیشــیدا تاقانــە كوڕەكــەی هاودەمــی بــووەو ڕێــگای لەگــەڵ بڕیــوە، بۆیــە لەكاتــی خــوێندنەوەی ئەم كتێبەدا جگە لە باوكی شارەزای ژیانی ئەویش دەبی

یەكێكــی دیكــە لــە دەســتكەوتەكانی ئــەم كتێبــە بریتییــە لــە لایەنــە ئیمانییەكــەی، بەدڵنیاییــەوە دانیشــتن لەگــەڵ پیــاو چــاكان و باســكردنیان و خوێندنــەوەی ژیانیــان مایــەی دابەزینــی خێــرو بەرەكەتــی ئیلاهییــە، ڕوون و ڕاشــكاوانە دەڵێــم: هــەر كەســێك ئــەم كتێبــە بخوێنێتــەوە زۆر بــە ئاشــكرا هەســت بــەم بەرەكەتــە دەكات، هەروەهــا لەناخــەوە گــڕو تیــن و هیممەتــی خــوا پەرســتی و خۆشویســتنی خــوای بــۆ زیــاد دەبــێ.

یەكێكــی دیكــە لــە دەســتكەوتەكانی خوێندنــەوەی ئــەم كتێبــە بریتییــە لــە لایەنــە زانســتییەكەی، ڕاســتە نووســەر باســی ڕووداوو بەســەرهاتەكانی ژیانــی باوكــی دەكات ڕەحمەتــی خــوا لــە هەردووكیــان، بــەڵام لەمــاوەی باســەكەدا چەندیــن بــواری جیــا جیــای زانســتی شــەرعی دەوروژێنــێ و شــەن و كەویــان دەكات.

چەندیــن ســوودو قازانجــی دیكــەی مەعنــەوی لــەم كتێبــەدا هەیــە مــن بــۆ خوێنەریــان جــێ دەهێڵم، هــەر خوێنەرێكــی بەڕێز بە ئەنــدازەی ئامــادە بوونــی دڵ و دەروونــی لەكاتــی خوێندنــەوەی كتێبەكــەدا ئــەم ســوودو قازانــج و دەســتكەوتە مەعنەویانــە بەدەســت دێنــێ.

ماوەتەوە چەند خاڵێك وەك ڕێخۆشكردن بۆ خوێنەر بخەمە ڕوو:

١)- لەكاتی وەرگێڕاندا هەوڵم داوە هاوسەنگی بپارێزم لەنێوان پابەند بوون بە وشەو ڕستەكانی نووسەرو داڕشتنی خۆم، لەمەشدا لەوانەیە هەندێ جار لایەنێك زاڵ بووبێ بەسەر لایەنێكی تر، بەڵام لەهەمووی گرنگتر ڕەچاوی تەواویی ویست و مەبەستی نووسەرم كردووەو بەهیچ شێوەیەك نەمهێشتووە لەو چوار چێوەیە دەرچێ.

٢)- لە كردنە كوردی دەقە شیعریەكاندا زیاتر بەلای شیكردنەوەدا چوومە نەك وەرگێڕانی دەقاو دەق، چونكە شیعرەكان زاراوەی جۆراو جۆری تەسەوفیان تێدایە، ئەم زاراوانەش جیا لەمانا ڕواڵەتیەكەیان مانای شاراوەو پەنهانیان لەخۆ گرتوون، لە بەكوردی كردنی هەندێ دەقی شیعریش خۆم بواردووەو بەپێویستم نەزانیوە بكرێ بەكوردی خوێنەر لەماوەی خوێندنەوەیدا درك بەمە دەكات.

٣)- دوای وەرگێڕانەكەش سێ جار كتێبەكەم بەتەواوی و زۆر بەوردی لە بەرگەوە بۆ بەرگ خوێندۆتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی دوو مامۆستاو برای ئازیزیش پێداچوونەوەیان بۆ كردووە، پێم خۆشە لێرەوە وەك وەفایەك ناویان تۆمار بكەم: (زمناكۆ مەسعود، ئوسامە عەبدولغەنی)، خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە.

٤)- بۆ كردنە كوردی ئایەتەكانیش بەزۆری پشتم بە (تەفسیری ئاسان)ی مامۆستا بورهان بەستووە، لەهەندێ شوێنیش سیاقی قسەكانی نووسەر بریتیی بووە لە لێكدانەوەی ئایەتەكە بۆیە بەپێویستم نەزانیوە دووبارە لە تەفسیرەكەدا بیهێنم، تەوفیق و سەركەوتنیش هەر لەلایەن خواوەیە،

به دڵنیاییەوە وەرگێڕانەکەم خاڵی نییە لە هەڵەو کەم و کوڕی، لەهەر کەم و کوڕییەك سەرەتا داوای لێبوردن و چاوپۆشی لەخوای بەخشەر دەکەم، پاشان داوای لێبوردن لە نووسەری کتێب و خوێنەران دەکەم، هەر چاکی و باشیی و ڕوونیەك لە کتێبەکەدا، بۆخوا دەگەڕێتەوەو بریتییە لە فەزڵ و منەت و گەورەیی ئەو بەسەر بەندەکانیەوە، ئێوەش لەدوعای خێر بێبەشمان مەکەن.

## پێشەكی چاپە نوێیەكە

موحەممەد سەعید رەمەزان بوتی
دیمەشق ٢٧ شوال ١٤١٥ك
٢٨ی ئاداری ١٩٩٥ز

خــوای پــەروەردگار ویســتی وابــوو ئــەم كتێبــە بــەراورد بــە كتێبەكانــی دیكــەم، زۆر زیاتــر ببێتــە جێــی پەســندی هــەم خەڵكانــی ئاســایی، هــەم خەڵكانــی تایبــەت، نــەك هــەر ئەوەنــدە بەڵكــو بــووە جێــی ســەرنجی زۆرێــك لەوانــەش كــە پابەنــد نیــن بــە گوێڕایەڵــی خــوای پــەروەردگارو هەرگیــز بــەلای توێژینــەوە یاخــود خوێندنــەوەی كتێبــی ئیســلامیدا ناچــن.

هیــچ گومانــی تێــدا نییــە نهێنــی ئــەم بایــەخ پێــدان و پەســند كردنــەش لەبــەر بابەتــی كتێبەكەیــە، كــە بریتییە لــە باســكردنی ژیان و بەســەرهاتی باوكــم، جگــە لــەم هــۆكارە هیــچ هۆكارێكــی دیكــە بەدی ناكــەم كــە پەیوەنــدی بــە بەندە (نووســەری كتێبەكــە)وە هەبــێ، ئەگەر خــوای باڵادەســت بــە نێوەندگیرێكــم قەبــوڵ بــكات كــە لەڕێگــەی ئــەم كتێبــەوە بتوانــم ون بووێــك ڕێنوێنــی بكــەم، لادەرێــك بخەمــەوە ســەر ڕێــگای ڕاســت، بێئاگایــەك بەئــاگا بهێنمــەوە، ئــەوا بۆمــن زۆر گەورەتــرو پــڕ بایەخــترە لــە قازانجێكــی زۆری دونیایــی، بــۆ مــن لــە هەمــوو گەنجینــەو زێــڕو زیــوو خێــرو بێرێكــی دونیایــی گەورەتــرە.

هەنــدێ لــە خوێنــەران پێیــان گوتــم: خۆزگــە لــەم كتێبــەدا هەندێ لــەو فەتــواو بۆچوونــە زانســتیانەی باوكــت دەهێنــا كــە تێگەیشــتنی

فراوانـی ئـەو دەردەخـەن، وەك چـۆن خـۆی (واتـە: باوكـم) پێشـتر بـە زانسـتی زۆرو تێگەیشـتنی فـراوان ناسرابـوو.

منیـش لەوەڵامـی ئـەو كەسـانەدا گوتـم: ئەنجامدانی ئـەو كارەی ئێـوە دەیڵێـن یـەك پاسـاوی هەیـە، ئەویـش بریتییـە لـە ئامـاژە كردن بـە زانسـتی زۆری باوكـم، بانگەشـە بـۆ ئـەوە بكـەم كـە زانیاریـە فیقهیەكانـی وردو دەقیـق بوونـە!

مـن دەزانـم ئـەم بانگەشـەیە بانگەشـەیەكی دونیاییـە، باوكـم هەتـا لـە ژیانـدا مابـوو ئەمـەی پێخـۆش نەبـوو، هەرگیـز دوای مردنیشـی پێـی خـۆش نابـێ، بۆیـە هـەر یەكێـك ئـەم كتێبـەی خوێندۆتـەوە یـان دەیخوێنێتـەوە، بـا بزانـێ مـن بـۆ ئـەوە ئـەم كتێبەم نەنوسـیوە تا بەشـان و باڵـی باوكمـدا هەڵبڵێـم، بـۆ ئـەوە نەمنوسـیوە بمـەوێ قودسـییەت و پیرۆزیـی پـێ بـدەم، یاخـود باسـی چاكـی و باشـیەكانی بكـەم و سـەرنجی خەڵكـی بـۆ ڕابكێشـم، بەڵكـو من لـەم كتێبـەدا مێژونوسـێك زیاتـر نیـم، واقیعێـك تۆمـار دەكـەم و هەقیقەتێـك بەیـان دەكـەم كـە لە ڕابـردوودا ڕوویـداوە، ژیانـی ئینسـانێك دەنووسـمەوە، بۆیـە بەغەیـری ڕاسـتگۆیی و وردی لـە قسـەكردن لەبارەیـەوە بـەلای شـتێكی دیكـەدا ناچـم، لـەم سـۆنگەیەوە مـن بەرپرسـیار نیـم لـە بـوون و نەبوونـی سـازان و تەوافـوق لەنێـوان واقیعـی ئـەم ژیاننامەیـەو حـاڵ و بـارو دۆزەخـەكان، لەگـەڵ میزاجـی هەنـدێ یاخـود زۆرێ لەخەڵكـی.

بـەڵام مـن داوا لەخـوای باڵادەسـت دەكـەم كـە هەمومـان ڕێـزدار بـكات بەناسـینی هـەق و دەسـت پێـوە گرتنـی، وە بەناسـینی پووچـی و خـۆ لـێ پاراسـتنی، هـەر هەمومـان بـە ڕێـگای ڕەزامەنـدی خۆیـدا ببـات، بەڕاسـتی خـوا باشـترین داوا لێكـراوە.

## پێشەکی

دیمەشق / (٢١)ی (ربیع الأول)ی ١٥١٥ك
٢٦ی ئەیلولی ١٩٩٤ز

زۆر دوو دڵ بووم لە دەستپێشخەری کردن بۆ نووسینی ئەم کتێبە، ماوەیەکی زۆر پرسیارم لەخۆم کرد لەبارەی هۆکاری نووسینی ئەم کتێبەو پاڵنەرە شاراوەکانی، ئایا چ شتێك پاڵم پێوە دەنێ بۆ نووسینی ئەم کتێبە؟ نەك هەر ئەوە بەڵکو ماوەیەکی زۆر پرسیارم لەخۆم دەکرد ئایا تا چەند باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ بەم کارە ڕازی دەبێ!!

ئەمڕۆ بەگوێرەی ساڵنامەی کۆچی چوار ساڵ و نیو تێدەپەڕێ بەسەر وەفاتی باوکم، تا -ئەمڕۆ بەیانی- بەتەواویی بڕیاری نووسینی ئەم کتێبەم لەلا یەکلا نەبویەوە، گەورەترین هۆکاری ئەم دوو دڵیەشم کە ئەم ماوە زۆرەی خایاند، ئەوەبوو کە: لەم سەردەمەدا هەندێ لە خەڵکی دەبینم زۆر جەخت لە: باس کردن و زەق کردنەوەی شوێنەوارو پاشماوەی مردووەکانیان دەکەنەوە، بە ئەنقەست لە قەبارەی خۆی زیاتر گەورەی دەکەن و زێدەڕۆیی لە پێداهەڵگوتنی دەکەن، بۆ ئەم مەبەستەش شێوازی هونەری سەیرو سەمەرە بەکار دەهێنن، مەبەستیشیان لەم کارە بریتیە لە بەدەست هێنانی شتێکی دونیایی بەڵام لە ژێر پەردەی کارێکی ئاینی، زۆرێك لەو جۆرە کەسانە دەبینم

زەق كردنـەوەو پێـدا هەڵگوتنـی مردووەكانیـان كردۆتـە هۆكارێـك بـۆ بەدەسـت هێنانـی پلـەو پایـەو فەخـر بەخـۆ كـردن، دوای كۆچـی دوایـی مردووەكانیـان لەبـەرو بوومەكـەی دەخـۆن.

بەشـێوەیەكی گشـتی لەمـڕۆدا وای دەبینـم نووسـینی (كـوڕ) لەسـەر ژیـان و گوزەرانـی (بـاوك)ی بۆتـە هونەرێكـی جیـاوازو نایـاب لـە هونەرەكانـی بانگەشـە كـردن و گرنگـی دان بەخـود، ئـەم بانگەشـە بۆخـود كردنـەش لەسـەر نـاوی ئـەو بـاوو باپیرانـە یاخـود ئـەو شـێخ و مامۆسـتایانە بونیـات دەنرێ كـە دونیایان جێهێشـتووەو وەفاتیـان كـردووە، واتـە: بـاس كردنـی ژیانـی بـاوك، یـان ژیانـی شـێخ و مامۆسـتا، بـۆ مەبەسـتی بانگەشـە بۆخـۆ كـردن و فەخـر بەخـۆ كردنـە، قازانجـی ئـەم كارە دەچێتـە گیرفانـی منداڵەكانیـان یاخـود موریدەكانیـان كـە میراتگـری كـۆچ كردووانـن، ڕێـك وەك ئـەو قەبرانـەی كـە لەدیـوی دەرەوەیانـدا ڕازێنراونەتـەوەو بـەرز كراونەتـەوە گوایـە ئەمـە ڕێزێكـە بـۆ ئـەو مـردووەی كـە لەنـاو گۆڕەكـەدا پاڵكەوتـووە، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا ئـەم كارە بۆتـە نیشـانەی خۆبەگـەورە زانیـن و فەخـر بەخـۆ كردنـی میراتگـران و نزیكانـی مردووەكـە، كـە هێشـتا لەژیانـدان و بـە ئـارەزووی خۆیان لەخۆشـی و شـادیەكانی دونیـادا كەڵـك وەردەگـرن.

ئـەم دیـاردە ناشـیرینەی باسـم كـرد بـە ئەندازەیەكـی زۆر ئـەو حـەزو ئـارەزووەی كـەم دەكردمـەوە كـە هەمبـوو بـۆ نووسـینێكی تێـرو تەسـەل لەسـەر ژیانـی باوكـم، هەروەهـا ئـەم دیاردەیـە ئـەو وەسوەسـەیەی لـە دەروونمـدا شـیرین كردبـوو كـە منیـش لـەم كارەدا كـە نووسـینەوەی ژیاننامـەی باوكمـە هەمـان مەبەسـتم هەیە،

ئـەوەم بەخەياڵـدا دەهـات كـە باوكـم - مـن دەمزانـى چەنـد خـۆى دەپاراسـت و چەنـد بـێ نيـاز بـوو لـە خـۆ دەرخسـتن و سـتايش كـران و بەگـەورە گيـران- بـەم كارەم ڕازى نابـێ، نـەك هـەر پێـى ڕازى نابـێ بەڵكـو لەوانەيـە ببێتـە هـۆكارى تـوڕە بـوون و ئەزيـەت دانيشـى، مـن بۆچوونـم وايـە كـە مـردووان وەكـو زينـدووان هـەم تــوڕە دەبــن و هــەم ڕەزامەنــد دەبــن، هــەروەك چـۆن ئێـش و ئازاريـان پێـدەگات، شـادى و ئاراميشـيان بەسـەردا دێـت.

ئەمـە لەگـەڵ ئـەوەى زۆربـەى ئـەو برادەرانـەى كـە باوكميـان دەناسـى پێشـنيارى ئەوەيـان دەكـرد بگـرە زۆر پێداگيريـان دەكـرد بەشـێك لـە ژيانـى باوكـى ڕەحمەتيـم بـۆ خەڵـك بنووسـمەوە، بـەزۆر شـت پاڵيـان پێـوە دەنـام و هانيـان دەدام، بـەڵام ترسـى زياتـرم لـە نووسـينى ئــەم كتێبــە بــەراورد بــە ئــارەزووى نووسـينى، وەك خـۆى مايـەوە، تـا ئـەوەى ڕۆژێـك قسـەى باوكـم لەبـارەى چەنـد زانايەكـى چاكـەكارى كـورد بيركەوتـــەوە كـە بەگوتـەى ئـەو كەسـانى زۆر جيـاواز بـوون هـەم بەهـۆى زانسـتى زۆريـان، هـەم ناسراويـش بـوون بەتەقـواو پيـاو چاكييـان، باوكـم ڕەحمەتـى خواى لێبـێ كاتـى خـۆى باسـى هەنـدێ لـە ژيـان و سـيفات و ڕەوشـتە جوانەكانـى ئەوانـى بـۆ كردبـووم، هـەر كاتـێ باسـى دەكـردن داخ و حەسرەتـى خـۆى دەردەبـڕى لەبـارەى ئـەوەى كـە خەريكـە ئـەو ڕەوشـتە جـوان و سـيفاتە نايابانـەى ئـەوان لـە بيـرو زيهنـى خەڵكيـدا بسـڕێتەوەو نەمێنـێ، خۆزگـەى ئـەوەى دەخواسـت كـە ژيانـى ئـەو كەسـانە پارێزگاريـان لـێ بكرايـەو بنووسرايانـەوە، بـۆ ئـەوەى ببيونايـە بـە دەرس و وانـە بـۆ نەوەكانـى داهاتـوو.

لە دڵی خۆمدا گوتم: وا گومان نابەم باوکم لەپێشتر بێ لەمن بەم داخ و حەسرەتە، وەك چۆن ئەو هەقی خۆی بوو هەست بە پێویستیی نووسین بکات لەبارەی ئەو زاناو پیاو چاکانە بۆ ئەوەی خەڵکی لە سیفاتی جوانیان کەڵك وەربگرن و بیانکەن بە پێشەنگ و چاو ساغ بۆ ژیانیان، منیش بەهەمان پاڵنەری ئەو، بەهەقی خۆمی دەزانم هەست بەهەمان پێویستی و زەڕوورەت بکەم بەرامبەر نوسینەوەی ژیانی ئەو زانایە (کە باوکمە)، بێگومان باوکیشم یەکێکە لەوان، خۆ ئەگەر ئەو بوارەم بۆ نەڕەخسابێ لەبارەی ژیانی ئەو زانا گەورانەوە بنووسم بەهۆی ئەوەی نەمبینیون و زانیاریم لەبارەیانەوە نییە، ئەوا دەتوانم لەبارەی باوکم و ژیانەکەی بنووسم، بەڵکو من لەهەموو خەڵك شارەزاترم بە ژیان و سلووك و هەڵسوکەوتەکانی ئەو.

بەم شێوەیە لە قسەی باوکم لەبارەی ئەو زانا چاك و باشانە ئیلهامی ئەوەم وەرگرت کە مۆڵەتم دەدات لەسەر ژیانی بنووسم، بە سیفەتی ئەوە نا کە باوکمە، بەڵکو بە سیفەتی ئەوەی کە یەکێکە لەو زانایانەی کە ئەو خۆزگەی دەخواست ژیان و ڕەوشت و ئاکاری بەرزیان بنووسرایەتەوە بۆ ئەوەی ببونایەتە بیر خەرەوەو ئامۆژگاری بۆ نەوەکانی داهاتوو.

بێگومان هەژمار کردنی باوکم لەڕیزی زانایان لە باوەڕو یەقینی منەوە سەرچاوەی گرتووە، بێ گوێدانە ئەوەی کە باوکم چۆن تەماشای دەروون و حاڵی خۆی دەکرد، چونکە ئەو خۆی وا دەبینی و قەناعەتی وابوو کە یەکێکە لە خەڵکە ئاسایی و عەوامەکە.

ئنجـا سـەرەڕای ئـەوەی گەیشـتمە قەناعـەت كە پێویسـتە لەسـەر ژیانـی باوكـم بنووسـم، لەلایەكـی تـرەوە ڕاوێژیشـم بـە هەنـدێ لـەو كەسـانە كـرد كـە وا گومانیـان پـێ دەبـەم ئەهلـی صـەڵاح و تەقـوان لـەم شـارە، بۆشـم ڕوون كردنـەوە كـە باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ ئـەوەی لـێ قەدەغـە كـردووم لەبـارەی شـتە شـاراوەكان و حاڵـە تایبەتەكانـی لەگـەڵ خـوا بـۆ خەڵـك بـاس بكـەم، بۆچوونـی ئەوانیـش سـەبارەت بـەم كارە ئەوەبـوو كـە كارێكـی پیـرۆزەو سودبەخشـە بەمەرجێـك هـەم مەبەسـت تێیـدا خـوا بـێ، هـەم باسـكردن و وەسـف كردنیشـی وەك ئـەو واقیعـە بـێ كـە تێیـدا ژیـاوە بـێ زیـادو كـەم، یاخـود بـێ گەورەكـردن و زێدەڕۆیـی تێـدا كـردن، وەڵامیشـیان بـۆ ئـەم قسـەیەی مـن كـە باوكـم ئـاگاداری كردوومەتـەوە لـەوەی كارە شـاراوەكانی ئـەو بـۆ خەڵـك بـاس نەكەم ئەوەبـوو كـە: ئەمـە بـۆ ئـەو كاتـە بـووە كـە لەژیانـدا مابـوو، بـۆ ئـەو كاتـە بـوو كـە لـە دینداریيەكـەی خـۆی دەترسـا بەرامبـەر بـە شـەڕو خراپـەو مەترسیەكانی نەفـس، بـەڵام ئێسـتا ئـەو لـە دونیـای تەكلیـف دەرچـووەو بـەدەم ئـەو شـتەوە چـووە كـە لەدونیـادا ڕووی تێكردبـوو، بۆیـە باسـكردنی هـەر شـتێكی تایبـەت نابێتـە مەترسـی لەسـەری.

دوای ئـەوە دووبـارە ئـەو حـەزەم لـەلا زینـدوو بوویـەوە كـە خـۆم یـەكلا بكەمـەوە بـۆ نووسـینی ژیاننامەكـەی ڕێـك وەك ئـەوەی لەبارەیـەوە دەیزانـم، وە لەچـوار چێـوەی واقیـع و خـۆ دوور گرتـن لـە بەگـەورە گرتنـی و داتاشـینی نازنـاوی خەیاڵـی بـۆی، لەجیاتـی هەمـوو ئەمانـە ئامانـج شـارەزا كردنـی خوێنەر بـێ لەبـارەی واقیعی

ژیانـی شەخسـی ئـەوو، هەروەهـا پەیوەندیـە كۆمەڵایەتیەكانـی و، بەسـەرهاتەكانی ژیانـی بـەو شـێوەیەی كـە تێیـدا ژیـاوە، بـێ هیـچ جـوان كـردن و ڕازاندنەوەیـەك، بەدڵنیاییـەوە خـۆ دوور گرتـن لـە زێدەڕۆیـی كـردن لـەم بابەتانـە زیاتـر پێگـەو مەكانەتـی هەقیقـی ئـەو كەسـەی كـە لەسـەر ژیانـی دەنـووسرێ لـە بیـرو مێشـكی خوێنـەر وێنـا دەكات.

نابـێ مەبەسـت و ئامانـج لـە كارێكـی وادا شـانازی بەخـۆ كردن و خـۆ بەگـەورە گرتـن بـێ، واتـە: باسـكردنی ژیـان و بەسـەرهاتی ئـەوان و تایبەتمەندیەكانیـان بـەكار بهێنرێـن بـۆ شـانازی بەخـۆ كـردن و خـۆ بەگـەورە زانیـن، ئەگـەر ئـەو نیەتـە لـەم كارەدا هەبـێ -پەنـا بەخـوا- شـتێك نییـە جگـە لـە سـەرچاوەی ئێـش و ئـازار بـۆ باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ، بەڵكـو پێویسـتە تاكـە مەبەسـتی ئـەم كارە پەنـدو ئامـۆژگاری وەرگرتـن بـێ لە حـاڵ و ژیان و بەسـەرهاتی كەسـێكی دیكـە بەوریایـی و ئـاگا لێبوونـەوە، لەسـۆنگەی باسـكردن و خوێندنـەوەی ژیانـی ئـەو پیـاو چاكـو صاڵحانـە كـە بـە نامۆیـی و غەریبـی لەدونیـادا ژیـان، پێویسـتە ئینسـان وریایـی و ئاگایـی خۆی وەربگـرێ لـە فێـڵ و تەڵەكـەی شـەیتان و ئـەم ژیانـی دونیایـە، هەروەهـا فێـری پێویسـتیی و گرنگـی ڕوو كردنـە ئـەو شـتە بـێ كـە لەپێناویـدا دروسـتكراوە، كورتـەی قسـان ئەوەیـە مەبەسـت لـە ژیانـی پیاوچـاكان گـوێ گرتنـە لـەو فەرمایشـتە خواییـەی كـە دەفەرمـووێ: ﴿لِمِثۡلِ هَٰذَا فَلۡيَعۡمَلِ ٱلۡعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾﴾ واتـە: دەبـا بـۆ ئـەم نـازو نیعمـەت و كامەرانییـە ئەوانـەی كـە كارو كۆشـش دەكـەن بـا بـۆ ئـەم دەسـتكەوتانە بیكـەن. الصافـات.

بەڵـێ، بـەم شـێوەیە ڕەغبـەت و ئـارەزووی نووسـینێكی وردوو واقیعانـەم لەسـەر ژیانـی باوكـم لا گەڕایـەوە، لەبـەر هیـچ شـتێكی دیكـە نـا جگـە لـەو نیـەت و ئامانـج و مەبەسـتانەی كـە ئامـاژەم پێ كـرد، سـەرەڕای ئـەم پاڵنەرانـەش كـە باسـم كـرد بـۆ نووسـینی ئـەم كتێبـە هـەر تەسـلیمی ئـەو ئـارەزووە نەبـووم بەڵكـو پەنـام بـردە بـەر ئەنجامدانـی نوێـژی ئیسـتیخارە بـەو شـێوەی كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فێـری كردوویـن، نوێژەكـەم كـرد، پاڕامـەوە، داوای كۆمەكیـم كـرد، داوام لەخـوا كـرد بـەرەو خێـرو چاكـە ئاڕاسـتەم بـكات و ئیلهامـم پـێ بـداو بمخاتـە سـەر ئـەو ڕێگایـەی كـە خـۆی پێـی ڕازییـە، ئەوەتـا ئێسـتاكە بەوپـەڕی سینە فراوانیـەوە ڕووم كردۆتـە نووسـینی كتێبەكـە، وەك چـۆن داوام لەخـوا كـرد سـینەم بكاتـەوە بـۆ دەسـتپێكردنەكەی، ئـاواش داوای لـێ دەكـەم یارمەتیـم بـدات و كۆمەكیـم بـكات تـا تـەواو بوونەكـەی، بـەو شـێوازەی كـە خـۆی پێـی ڕازیـە.

خـوای پـەروەردگار لەپشـتی ویسـت و مەبەسـتەكانەوەیەو، هەمـوو خێـرو بێرێـك بەدەسـتی ئـەوە، وە تەنهـا پشـت بـەو دەبەسـترێ.

## لەدایك بوون و، چۆنیەتی گەورەبوون و، بەدوای زانستدا گەڕانی

بەگوێرەی تۆمارەکانی ناسنامە لەدایك بوونی باوکم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨٨٨)ز ، لەگوندێکی بچووك بەناوی (جیلکا)، سەر بە جەزیرەی بۆتان، بەعەرەبی پێی دەگوترێ: جەزیرەی ئیبن عومەر، ئەم ناوچەیە دەکەوێتە نێو وڵاتی تورکیا، لەنزیك سنووری سووریا، بەرامبەر شارۆچکەی عەین دیواری سووریا[١].

باوکم لە دایك و باوکێکی کورد هاتۆتە دونیاوە، باوکی ناوی عومەر بووە، باپیری ناوی موراد بووە، سەبارەت بە درێژ بوونەوەی نەسەبی باوکم، لەدوای باپیریەوە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی دیکە نازانم، پێشتر هەندێ پرسیارم لەو بارەوە کردووە بۆ ئەوەی شارەزا بم، بەڵام پێم وابوو کە پێویست بەوە ناکات زۆر گرنگی بەمە بدەم، بەهۆی ئەوەوە کە پێم وایە مەحاڵە ئینسان بتوانێ بێ هەڵەو کەم و کوڕی درێژبوونەوەی نەسەبی باب و باپیران و ڕابردووی خۆی شارەزا بێ، باشتر

---

(١) ناوی تەواوی ڕەمەزانە، بەڵام بەمەلا ڕەمەزان ناسراوە، زۆرێك لەخەڵکی وادەزانن ناوی مەلا بووەو ڕەمەزان ناسناویەتی، بۆیە پێیان دەگوت: شێخ مەلا.

وایـە واز لـەم لێکۆڵینەوەیـە بێنـێ لەبـەر ئـەوەی تەحقیـق کـردن لـە مەسـەلەیەکی وادا قـوڕس و گرانـە، لەسـۆنگەی ئـەو قسـەیەی (إبن الـوردي) لـە (لامیـة) بەناوبانگەکەیـدا کـە دەڵـێ:

لا تَقُل أَصلي وَفَصلي أَبَداً .... إِنَّما أَصلُ الفَتي ما قَدْ حَصَل

واتـە: هەرگیـز مەڵـێ ئەصـڵ و بنەچـەی مـن وایـەو وایـە، ئەصڵ و بنەچـەی هـەر کەسـێك بەرهەمـی ئـەو کارانەیـە کـە ئەنجامـی داوون و ئەنجامیـان دەدات، کەواتـە: دەبـێ پێگـەی ئینسـان بەهـۆی ئـەو کارانــەوە لەبەرچــاو بگیــرێ کــە ئەنجامیــان دەدات، نــەك بەهـۆی بـاب و باپیرانـی[1].

**قۆنـاغی مـنداڵی:**

باپیــری باوکــم پیاوێکــی جوتیــار بــوو زۆربــەی کاتەکانــی لــەکاری کشــتوکاڵ کــردن و پێویســتیەکانی ئــەو پیشــەیە بەســەر دەبـرد، منـداڵ و نەوەکانـی کارێکـی دیکـەی باشـتر لەمەیـان شـك نەدەبـرد، هـەر منـداڵ و نەوەیەکـی گـەورە دەبـوون و پێدەگەیشـتن، بەگوێـرەی توانـا ڕوویـان دەکـردە یارمەتـی دانـی ئـەو لـەکاری کشـتوکاڵی و خزمـەت کردنـی زەوی و زار، باوکیشـم لـەو تەمەنـەدا وەك هـەر منداڵێکـی تـر ئـەم کارەی بـۆ ببـوو بەهەلێك بـۆ عەجوولی و بزێـوی کـردن، کـە پێویسـتیەکی ئـەو قۆناغەیـە، بـەڵام دایکـی کـە زۆر ئەهلـی تەقـواو چاکـە بـوو، سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی بینێـرێ

---

[1] کـوردەواری خۆمـان جوانیـان گوتـووە: کـە خـۆت کوسـەی ڕیشـی باوکـت بەتـۆ چـی؟ (وەرگێـڕ).

بـۆ خوێنـدن و زانسـتخوازی، لەکۆتاییـدا بـۆ ئـەم مەبەسـتە توانـی پیاوەکـەی ڕازی بـکات و منداڵەکەیـان ببەنـە بـەر خوێنـدن.

باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ دەیگـوت: [ماوەیـەك لەنێـوان ئـەم دوو کارەدا مامـەوە لەلایـەك ئـارەزووی باپیـرم بـۆ کارکـردن لەگەڵیـدا لـە کشـتوکاڵ و خزمـەت کردنـی زەوی، لەلایەکـی تـر سـوربوونی دایـك و باوکـم بـۆ خوێنـدن و گـەڕان بـەدوای زانسـتدا، بـەڵام مـن لـەو ماوەیـەدا حـەزو ئـارەزووی خـۆم لـە خـۆڕزگار کـردن لـە کـۆت و زنجیـری خوێنـدن و نووسـین دەبینیـەوە، هەمـوو جـارێ لەگـەڵ منداڵانـی وەك خـۆم دەردەچـووم بـۆ گەمـەو گاڵتـە کـردن و کات بەسـەر بـردن لەنێـو شـینایی و زەویـە کشـتوکاڵیەکان بـە پاسـاوی ئـەوەی گوایـە باپیـرم بانگـم دەکات بـۆ ئـەوەی یارمەتی بـدەم لـەکاری جوتیـاری، ئـەوەی وای کردبـوو حـەز بەخوێنـدن و نووسـین نەکـەم و لێـی دوور بکەومـەوە: ئـەو کات خوێنـدن و نووسـین شـتێکی گرنگـی پێـدراو نەبوو لەلایـەك، لەلایەکـی دیکەوە کارێکـی ئاسـانیش نەبـوو، چونکە ئـەو هۆکارانـە بەردەسـت نەبوون کـە منـداڵ هـان دەدەن تـا بـەدوای خوێنـدن و نووسـین بکـەوێ، جارێکیـان باوکـم چـوو بـۆ جەزیـرە بـۆ ئـەوەی قەڵـەم و مەرەکـەب و وەرەقـەم بـۆ بکـڕێ، منیـش لەخۆشـییان بێئـەوەی هەسـت بـە مانـدو بـوون بکـەم بـەردەوام چاوەڕێـی گەڕانەوەییم دەکـرد، لەناکاو هاتـەوە بەقەڵـەم و مەرەکـەب و هەنـدێ وەرەقـەوە، کـەل و پەلەکانی لەکۆشـی دانـام، لـەو سـەردەمەدا ئـەو شـتانە دەگمـەن بـوون بۆیـە بەگەیشـتنیان زۆر دڵخـۆش بـووم].

گونـدە كوردییەكانـی ناوچـەی ئەنـادۆڵ بەدەسـت بـڵاو بوونەوەی نەزانـی و نەفامییـەوە دەیاننالاَنـد، پێویسـتی زۆریـان بـە زانیـاری و ڕۆشـنبیری هەبـوو، خوێندنـگا فەرمیـەكان لـەو ناوچانـەدا ژمارەیـان زۆر كـەم بـوو، بـەڵام لەبەرامبـەردا كـوردەكان شـەوق و ئارەزووێكـی زۆریـان هەبـوو بـۆ زانیـن و فێر بوونـی زمانـی عەرەبی و زانسـتەكانی شـەریعەتی ئیسـلامی، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لەنێـوان خۆیانـدا یارمەتـی یەكتریـان دەدا بـۆ دامەزرانـدن و بونیاتنانـی چەنـد حوجرەیـەك كـە بـەزۆری سـەر بەمزگەوتەكانـەوە بـوون، پێیـان دەگوتـرا: مەدرەسـە، وەك ئـەوەی كـە ئێرانیـەكان شـوێنێكیان هەیـە پێـی دەڵێـن: (حەوزەی عیلمـــی)، ئـــەو حوجرانـــە پێشـــوازیان لـــەو كەســانە دەكـــرد كـــە ئـــارەزووی خـــۆ یـــەكلا كردنەوەیـــان هەبـــوو بـــۆ بەدەســـت هێنانـــی زانسـتی شـەرعی و فێـر بوونـی زمانـی عەرەبـی و ئاییـن، ئەوانەشـی كـە دەرسـیان بـە قوتابیـەكان دەگـوت، زانایانـی خۆبەخـش بـوون كاری تاقـەت پڕوكێنـی فێركردنیـان بـەو پـەڕی خۆشـحاڵیەوە ئەنجـام دەدا بەجێبەجـێ كردنـی سیسـتەمی حەلەقاتـی زانسـتی و كۆبوونـەوە لـەدەوری شـێخێك، خەڵكـی گونـدەكان ژەمـە خواردنەكانیـان بـۆ ئـەم قوتابیانـە خسـتبووە ئەسـتۆی خۆیـان، خواردنیـان پـێ دەدان و جـل و بەرگەكانیـان بـۆ دەشوشـتن و خزمەتـی شایسـتەیان دەكـردن، ئەمەشـیان لەسـۆنگەی هەسـت كـردن بـوو بـە جێبەجـێ كردنـی واجبێكـی سەرشـانی خۆیـان، بـێ ئـەوەی منـەت بەسـەر قوتابیەكانـەوە بكـەن، گوندەكانـی جەزیـرەی ئیـبن عومـەر ئـەم جۆرە مەدرەسـانەی زۆر بـوو، لـە خەمـی قوتابیـەكان دابـوون، لەنێـو ئـەو مەدرەسـانەداو لەنێوانـی ئـەو قوتابیانـەدا زانـای گـەورە دەردەچـوون.

بەم شێوەیە ویستی خوا وابوو باوكم هەر لە منداڵیەوە لە كاری جوتیاری و خزمەتكردنی زەوی و زارو كار كردن لەگەڵ باوك و باپیری دابڕێ، ڕوو بكاتە فێربوونی نووسین و خوێندنەوەی قورئان، پاشان پەیوەندی بكات بە یەكێك لەو مەدرەسانەی كە باسم كرد.

بەشێوەیەكی وردو دوورو درێژ شارەزاییم لە واقیعی ژیانی قوتابیەتی ئەو نییە، بەڵام ئەوە دەزانم كە زیاتر لەجارێك بۆی باس كردووم چەند گوندێكی جۆراو جۆری كردووەو لە مەدرەسەكانی ئەو گوندانە خوێندوویەتی، لەسەر دەستی زیاتر لە شێخێك زانستی وەرگرتووە لە زیاتر لە مەدرەسەیەك، لەهەر یەكێك لەو مەدرەسانە ئەو شتەی خوێندووە كە هەستی كردووە پێویستیەتی، ڕێگای وەرگرتنی زانستیش لە ڕابردوودا بەم شێوەیە بوو، بەر لەوەی ئەو دەزگا زانكۆییانەی ئەمڕۆ هەن شوێنی ئەو مەدرەسانە بگرنەوە.

ئێستا من ناوی سێ لەو شێخانەم بیر ماوە كە باوكم دەرسی لەلا خوێندوون، هەر یەكەیان لەشوێنێك نیشتەجێ بوون، یەكێكیان: شێخ موحەممەد سەعید سەیدا بوو، بە شێخ سەیدا بەناوبانگ بوو، دووەمیان: سەید موحەممەد فندكی بوو، باوكم زۆر باسی دەكرد كە پیاوێكی زۆر ئەهلی عیلم و زۆر خاكی بوو، من لە كۆتایی چلەكان هەلم بۆ ڕێككەوت و بینیم، لەو كاتەی كە بەدیمەشقەوە تێدەپەڕی بەرەوماڵی خوا بەمەبەستی بەجێگەیاندنی فەریزەی حەج، سێیەمیان: مەلا

عبدالسـلام بـوو، باوكـم بـەردەوام بـە سـيدا مـلا عبدالسـلام بانگـی دەكـرد، واتـە: ئوسـتازم مـەلا عبدالسـلام.

**شێوازی كوردەكان لە خوێندنی زانستی شەرعی:**

عەجەمــەكان بەشــێوەیەكی گشــتی و كــورد بەتایبەتــی لەنێــو زانســتە شــەرعیەكاندا زیاتــر گرنگــی بــە (علومــی ئالــە) دەدەن، واتـە: زانسـتی زمانـی عەرەبـی بەهەمـوو بەشـەكانیەوە وەك: نەحـوو صـەڕف و بەلاغـەو، مەنتـق و، زانسـتی وەزع و، مەقولاتـی عـەشر، هەركەسـێ ڕوو بكاتــە داوا كردنــی زانســت لەهــەر یەكێــك لــە مەدرەسـە كوردیـەكان، دەبـێ بـەر لەهەمـوو شـتێك فێـری (زانسـتی صـەڕف) ببـێ، پاشـان دەچێتـە سـەر بەشـەكانی تـری ئـەم زانسـتە، پاشــان دەبــێ بچێتــە ســەر زانســتی نەحــو بەخوێندنــی زنجیــرە كتێبێكـی قـوڕس و گـران، كـە غەیـری كـورد كـەم (نەتـەوەی دیكە) هەیـە گرنگـی بـەو كتێبـە قـوڕس و وشـكانەی نەحـو بـدات، كۆتـا كتێـب لـەو زنجیـرە كتێبـە كـە پێویسـتە قوتابـی بیخوێنـێ كتێبەكـەی (جامی)یـە (الجامـي [1] عـلى الكافيـة لابـن الحاجـب) (٦٤٦)ك وەفاتـی كـردووە.

دەربـارەی زانسـتەكانی دیكـەی شـەریعەتی ئیسـلامیی گرنگـی بە عەقیـدە دەدەن، كۆتـا كتێـب كـە لـەو بـارەوە دەخوێـنرێ بریتییـە لـە عەقیـدەی نەسـەفی، پاشـان گرنگـی بـە تەفسـیر دەدەن لەگرنگترین

---

(١) نـاوی: نورالديـن عبدالرحمـن بـن أحمـد الجامـي سـاڵی (٨٩٨)ك وەفاتـی كـردووە، نـاسراوە بـە مـەلا جامـی.

ئـەو تەفسـيرانەش كـە دەيخوێنـن و گرنگـى پـێ دەدەن تەفسـيرى قـازى بەيضاويـە[1]، دواى تەفسـير گرنگـى بـە زانسـتى فيقـە دەدەن، ئـەوەى بەپلـەى يەكـەم لـەو بـارەوە پشـتى پـێ دەبەسـتن پەرتووكەكـەى پێشـەواى موحەققيـق ئيـبن و حەجـەرى هەيتەميـە[2] بەنـاوى (تحفـة المحتـاج في شرح المنهـاج)ى ئيـمام نـەوەوى لـە فيقهـدا، ئـەم كتێبـە كۆتـا كتێبـە لـە زانسـتى فيقـە دەخوێـنرێ، لەزانسـتى ئوصولـى فيقهيـش دەگەڕێنـەوە بـۆ شـەرحى جەلالەددينـى مەحەللى لەسـەر كتێبـى (جمـع الجوامـع)ى ئيـبن و سـوبوكى، جگـە لـەو زانسـتانەى كـە باسـمان كـرد، زانسـتەكانى ديكـەى وەك: زانسـتى فەرمـوودەو سـيرەو زانسـتى قورئـان و فيقهـى موقـارن و تەصـەووف و ئـەدەب كەمـتر گرنگيـان پـێ دەدرێ، نـەك هـەر گرنگـى كەمـى پـێ دەدرێ بەڵكـو دەتوانيـن بڵێيـن هەگبـەى زۆربـەى زانايانيـان لـە فەرمـوودەو زانسـتەكانى فەرمـووده بەتاڵـە ياخـود كەمـە.

هـۆكارى ئـەوەى كـە گرنگـى زياتـر بـە علومـى ئالـە دەدەن، دەگەڕێتـەوە بـۆ هەسـت كردنيـان بـە كۆسـپ و ئاسـتەنگى عەجـەم بوونيـان، وە پێيـان وايـە ناتوانـن بەسـەر ئـەم بەربەسـتەدا زاڵ بـن ئەگـەر بەزانسـتى زمانـى عەرەبييـەوە خەريـك نەبـن، بەتايبـەت زانسـتى صـەڕف، لەڕوانگـەو بۆچوونـى ئـەوان صـەڕف كليلـى فێربوونـى قسـە كردنـە بەزمانـى عەرەبـى، لەنێو زانسـتى صەڕفيشـدا

---

(١) قـازى عەبدوڵـڵاى كـوڕى عومـەرى بەيزاويـە سـاڵى (٦٨٥)ك وەفاتـى كـردووە.

(٢) نـاوى: شـهاب الديـن أحمـد بـن علـي بـن حجـر المكي سـاڵى (٩٧٤)ك وەفاتـى كـردووە.

بەتایبـەت (تصریـف الأفعـال)، هیـچ گومانـی تیـدا نییـە کـە هونـەری مانـاو دەربڕیـن و عیلمـی بەدیـع[١] لـەو زانسـتە تەواوکاریانـەن کـە دەتوانـرێ بەهۆیانـەوە زاڵ بیـت بەسـەر بەربەسـتی (عەجـەم)ی بـوون.

گرینگـی دانیشـیان بـە زانسـتەکانی {(المنطـق) و (المناظـرة) و (الوضـع)} هۆکارەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ زانسـتەکانی عەقیـدەو تەفسـیر، چونکـە عەقیـدەو تەفسـیر پـڕن لـە بەڵگـەی لۆژیکـی، کەواتـە: پێویسـتە بـۆ شـارەزا بـوون لـە عەقیـدەو تەفسـیر گرنگـی بـەم سـێ زانسـتەی سـەرەوە بـدرێ.

بۆیـە پێویسـت بـوو باوکیشـم پابەنـدی ئـەو مەنهەجـە بـێ کـە باسـم کـرد، ئەمـەش وای لێکـرد گرنگـی یەکەمـی بـۆ زانسـتی نەحـو صـەڕف و بەلاغـە بـێ، کـە پێـی دەگوتـرێ: علومـی ئالـە، وە بەگوێـرەی ئـەو مەنهەجـە تەقلیدیـەش بەس بـوو بـۆ هـەر بابەتێـك لـە زانسـتە شـەرعیەکان یـەك کتێـب بخوێـنرێ، بـەڵام باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ (دوای خوێندنـی علومـی ئالـە) لەسـەر ئـەو مەنهەجـە تەقلیدیـە نەمایـەوە.

هـەر کاتـێ باسـی زانسـتخوازی و ئـەو شـوێنانەی بکردایـە کـە بەمەبەسـتی وەرگرتنی زانسـت ڕووی تێکردووە، دەیگـوت: {زۆربەی قوتابیـەکان لـە زانستی شـەرعیدا گرنگیان بـەو شـتانە دەدا کە دەبنە هـۆکاری ڕەوان بێـژی و زمـان پاراوی ئینسـان لە قسـە کردنـدا، زۆر

---

(١) علـم البدیـع: زانسـتێکە بەهۆیـەوە ڕووەکانـی جـوان قسـە کـردن شـارەزا دەبیت.

گرنگیـان بـەو شـتانە دەدا كـە دەویـان گـەرم دەكات بـۆ موناقەشـەو دەودەوانـێ كـردن، بـۆ ئـەوەی شـانازی بەسـەر نزیكانـی خۆیانـەوە بكـەن بـە وروژانـدن و باسـكردنی بابەتـە وردو نامـۆكان و قسـە كـردن لەسـەر بابەتـە قـورس و شـاراوەكان، بـەڵام گرنگـی دانـی مـن جگـە لـە: ئەزبەركردنـی مەتنـەكان و خوێندنـی ئـەو كتێبانـەی كـە مەنهەجـی مەدرەسـەكان بـوون زیاتـر بـەلای جـوان خوێندنـی قورئـان و تەجویـدو تەرتیـل بـوو، زۆر هەوڵـم لەگـەڵ خـۆم دەدا كـە بەپەنهانـی قورئـان ئەزبـەر بكـەم، وە فیعلـەن توانیـم لـە تەمەنێكـی كەمـدا هەمـوو قورئـان ئەزبـەر بكـەم، لـە زانسـتی فیقهیشـدا زیاتـر گرنگیـم بـەو عیبـادەت و حوكمانـە دەدا كـە دەبوونـە مایـەی زیاتـر پاراسـتنی سـلووك و ڕەفتـارم، وە كتێبەكانـی تەصـەووف ببـوە جێـی ئومێـدم و سـەرنجیان ڕاكێشـابووم، یەكەمینـی ئـەو كتێبانـەش لـەو بـارەوە (إحیـاء علـوم الدیـن)ی ئیمامـی غەزالـی بوو، دەسـتم خسـت و خـۆم یـەكلا كـردەوە بـۆ خوێندنـەوەی، بەهەمـان شـێوە سـەرقاڵیش بـووم بـە توێژینـەوە لەبـارەی ژیاننامـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، وە ئـارەزووی زۆر ئەنجامدانـی نوێـژە سـوننەتەكان و عیبادەتەكانـم لـەلا درووسـت بـوو، ئومێـدی گـەورەم ئەوەبـوو كاتێكـم لەشـەودا هەبـێ و بەفرسـەتی بگـرم بـۆ ئەنجامدانـی شـەونوێژ، كاتێكیـش ئـەو ئومێـدو هیوایەتـەم هاتـە جـێ ئەوەنـدە دڵخـۆش بـووم پێشـتر بەهیـچ شـتێك ئەوەنـدە دڵخـۆش نەبووبـوم}.

باوكـم دەیگـوت: {زۆربـەی قوتابیـەكان گاڵتەیـان بـەو شـتانەی مـن دەهـات، تۆمەتـی گەرمـە تەریقەتـی و زۆر لەخـۆ كـردن و هەنـدێ جـار چاولێكردنـی گـەورە مامۆسـتاكانیان دەدا پاڵـم،

دەتوانـم بڵێـم: هەنـدێ جـار ئـەو كارانـەی منیـان بـە هەڵاتـن لـە: ئەزبـەر كردنـی مەتنـی زانسـتەكان لەقەڵـەم دەدا، گوایـە مـن لەبـەر ئـەوەی ناتوانـم لەگـەڵ ئەوانـدا بەقوڵـی بچمـە نێـو مەسـەلە زانسـتیەكان و ورد ببمـەوە، بۆیـە پەنـا بـۆ ئـەو شـتانە دەبـەم}.

هەروەهـا باوكـم دەیگـوت: {لەڕاسـتیدا مـن زۆربـەی كاتەكانـم لـە خوێندنـەوەی قوڕئـان و ئەزبەركردنـی ئـەزكارو ئـەورادەكان و پەرستشـە سـوننەتەكان و شـەونوێژو واجبەكانـی تـر بەسـەر دەبـرد، لەهەمـان كاتـدا قوتابیەكانـی تـر زۆربـەی كاتەكانـی خۆیـان بـە ئەزبەركردنـی مەتنـی زانسـتەكان و ئامـادە كردنـی دەرسـەكان و زۆر دووبـارە كردنـەوەو پێداچوونـەوە (مراجعـە) بەسـەر دەبـرد، ئەمـەش وای كردبـوو لـەڕووی بەدەسـت هێنانـی زانسـت و لەبـەر كردنـی مەتـن و ئەحكامـەكان بـەراورد بـەوان بەپـاش كـەوم}.

باوكـم دەیگـوت: {ماوەیـەك بـەم شـێوەیە مامـەوە، ئەمـەش وای كردبـوو زۆربـەی مامۆسـتاكان و قوتابیـەكان وا هەسـت بكـەن كـە توانـام كەمـە لـە بەدەسـت هێنانـی زانسـت و، ئـەوەی فێـری بوومـە شـتێكی كـەم و سـنووردارە، رۆژێكیـان یەكـێ لـە مامۆسـتاكان[1] هاتـە لامـان یـەك یـەك پرسـیاری لـێ دەكردیـن و تاقیكردنـەوەی پێ دەكردیـن، كاتـێ نـۆرە گەیشـتە مـن بەئـارەزووی خـۆی پرسـیاری لێكـردم لـەو شـوێنانەی كـە قورسـن، خـوای پـەروەردگار ئیلهامـی وەڵامدانـەی پرسـیارەكانی پـێ بەخشـیم، تەماشـای كـردم و گوتـی:

---

(١) باوكـم هەمـوو جـار نـاوی ئـەو مامۆسـتایەی خـۆی دەگـوت، بـەڵام بەداخـەوە مـن ناوەكـەم لەبیـر نەمـاوە.

لەڕاستیدا تۆ زانـا نیـت و وەڵامـەكان نازانیـت، بـەڵام لـە پڕێكـدا خـوا پێـی فەرمـووی: ببـە بەزانـاو بـووی بەزانـا!}..

باوكــم دەربــارەی زانســتخوازی زیاتــر لــە جارێــك ئــەم بەســەرهاتەی ســەرەوەی بـۆ بـاس كـردووم، بـۆ ئـەوەی بەهـۆی ئەم بەســەرهاتەوە مانــای ئــەو ئایەتــەم بــۆ ڕوون بكاتــەوە كــە خــوای پــەروەردگار دەفەرمــووێ: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ ﴿٢٨٢﴾﴾[1] البقـرة، هەروەهـا بـۆ ئـەوەی وریـام بكاتـەوە لـەوەی كـە: لـە داوا كردنـی زانسـت دانەبـەزم بـۆ ئـەو ئاسـتەی بیكەمـە هـۆكاری نـان پەیـدا كـردن، وەك زۆرێـك لـە فێرخـوازان و زانسـتخوازانی ئەمـڕۆ.

چەندیــن جــار ئەمــەی بــۆ گێڕاومەتــەوە دەیگــوت: {شــەوی هەینیــم كردبــووە شــەوی پشــوودان لــە ماندوێتــی خوێندنــی هەفتەیــەك، زۆبــەی قوتابیــان ئــەم شــەوەیان بەهــەدەر دەدا بــە پاسـاوی ئـەوەی كـە ڕۆژی مۆڵـەت و پشـوو وەرگرتنـە، شـەوانی هەینـی دەمانـەوەو نەدەخەوتـن هـەر خەریكـی كات بەسـەر بـردن و گەمـەو گاڵتـە دەبـوون و شـەوەكەیان بـەم شـێوەیە بـەڕێ دەكـرد، هەتـا زۆر مانـدوو دەبـوون و بـەو پـەڕی ماندووێتیـەوە دەچوونـە سـەر جێـگای خەوتنیـان، لـە ئەنجامـدا بەهـۆی درەنـگ كەوتـن و ماندوبـوون نوێـژی بەیانیـان لەكیـس دەچـوو، لەژێـر پێخەفەكانیـان دەمانـەوە تـا كاتێكـی درەنگـی دوای خۆرهـەڵات} باوكـم بەخـەم و ئەسـەفێكی زۆرەوە ئـەم قسـەیەی دەكـرد، كـە چـۆن دەبـێ قوتابیانی

---

(١) خـۆ پارێـز بـن خـواش فێـری ئـەو شـتانەتان دەكات (كـە خێـری تێدایـە بـۆ دونیـاو پاداشـتی قیامەتیـی لەدوایـە).

شـەریعە باشـترین و گەورەتریـن شـەوی هەفتـە کـە شـەوی هەینییە بــەم شـێوەیە بـەڕێ بکـەن، لـە گەمــەو گاڵتــەو شـتی بـێ سـوود بەسـەری ببـەن و پاشـانیش گـوێ بـەوە نـەدەن کـە نوێـژی بەیانیـان لەکیـس دەچـێ و لەکاتـی خۆیـدا ئەنجامـی نـادەن!

**نەخۆشییەکی قورس و ... خەونێکی سەیر:**

باوکــم لــەو قۆناغــەدا تووشـــی نەخۆشــیەکی قــورس بــوو، بەجۆرێـك باوکمـی تـا لێـواری مـەرگ بـرد، زۆربـەی خەڵـك وای بــۆ دەچــوون کــە نەخۆشــیەکی ڤایرۆســی بــێ، لەیــادم نەمــاوە باسـی کردبـێ لەچەنـد سـاڵیدا تووشـی ئـەم نەخۆشیە بـووە، بـەڵام گومانـم نییـە لـەوەی ئـەو کات هێشـتا تەمەنـی نەگەیشـتبووە (٢٠) بیســت ســاڵ.

باوکــم ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ دەیگــوت: فریشــتەی گیــان کێشــانم بەچاوەکانـی سـەرم بینـی، لـەو کاتـەی کـە نەخۆشـیەکەم زۆر قــورس بووبــو!

ئەوەتــا مــن لەســەر زمانــی خــۆی ئــەم بەســەرهاتە سـەیرەتان بـۆ بـاس دەکـەم، خـودی خـۆی زیاتـر لەجارێـك بەسـەرهاتەکەی بـۆ بـاس کردوویـن، ئـەو برایانـەش کـە زۆر دەهاتـن بـۆ سـەردان و مەجلیســی باوکــم لەدەمــی باوکمــەوە چەنــد جارێــك ئــەم بەســــەرهاتەیان بیســـتووە.

بەسەرهاتەکە لە زاری (باوکم)ەوە ڕەحمەتی خوای لێبێ:

{تـا دەهـات زیاتـر نەخۆشـییەكەم لەسـەر قـورس دەبـوو، بـە ئەندازەیـەك ماڵەوەمـان بێئومێـد بـوون لـەوەی چـاك ببمـەوە، ڕۆژێكیـان كـە لەسـەر جێـگای نەخۆشـیەكەم كەوتبـووم كۆمەڵێـك كەسـیش لـە ناسـیاوان و خەڵكانـی دیكـە كـە هاتبـوون بۆ سـەردانم لـە دەورم بـوون، لـەو كاتـەدا پیاوێكـی زۆر بەهەیبەت هاتـە ژوورەوە كەسـێكی دیكەشـی لەگەڵـدا بـوو لەپشـتیەوە وەسـتابوو، وا پێدەچوو یارمەتیـدەر یـان خزمەتـكاری بـێ، هەوڵـم دا لەبـەری هەڵسـم و دەسـتەكانی مـاچ بكـەم، چونكـە لـەو باوەڕەدابـووم كەسـێكی چـاك و خـاوەن فەزڵـە، بـەڵام گەڕایـەوەو گوتـی: ئێمـە كارمـان بەتـۆ نییـە، ئێمـە كارمـان بـە (یاسـین)ی[1] دراوسـێتە ئەومـان دەوێ، دوای ئـەو قسـەیە هەردووكیـان لەپێـش چـاوم ون بـوون، دانیشـتووانی مەجلیسـەكە سـەیریان كـردم و گوتیـان: ئەمـە بـۆ وات كـرد، بۆچـی ئـاوا شـۆك بوویـت؟ چ شـتێك وای لێكردی كـە دەم بـۆ زەوی ببەیت و ماچـی بكەیـت؟ منیـش گوتـم: مـن زەویـم مـاچ نەكـردووە، بەڵكـو هەوڵمـدا دەسـتی ئـەو شـێخە مـاچ بكـەم كـە هاتـە ژوورەوە، بـەڵام ئـەو گەڕایـەوەو گوتـی: مـن مەبەسـتم (یاسـین)ە، لەنـاكاو بـووە هـات و هـاوارو گوتیـان: یاسـین وەفاتـی كـرد، هـات و هـاوارو دەنگـی گریـان لەماڵەكـەی ئەوانـدا بـەرز بوویـەوە!!}.

باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ گوتـی: {پاشـان ئـەو شـێخە بەهەیبەتـە بـۆ جـاری دووەم هاتـەوە لام، پیاوەكـەی دیكەشـی هـەر

---

(١) ئەویـش گەنجێـك بـوو، نەخۆشـیەكی قورسـی گرتبـوو، ماڵـی بەتەنیشـت ئـەو ماڵـەوە بـوو كـە باوكمـی تێـدا دەژیـا.

لەگەڵـدا بـوو شـتێكی بەشـانی خـۆی دادابـوو بەپێسـتی ئـاژەڵ دەچـوو، ئەوجارەیـان ڕووی تێكـردم و بـەرەو ڕووم هـات، بەدەسـتی خـۆی قۆڵـی گرتـم، تـرس و لەرزێكـی زۆر دایگرتـم، هـاوارم كـردو داوای یارمەتیـم لـە باوكـم كـرد، تەماشـام كـرد باوكـم وا ڕامدەكێشـێ بـۆ ئـەوەی منـی لـێ بسـتێنێتەوە، پاشـان دوو كەسـەكە دیـار نەمـان، سـەیری ئەوانـەی دەورو بـەری خـۆم كـرد ئەوانیـش بەهـۆی منـەوە كەوتوونەتـە ترسـێكی زۆرەوە، یەكێكیـان پێـی گوتـم: ئـەو شـەڕەت لەگـەڵ كـێ بـوو؟ منیـش ئـەوەی بینیبـووم بـۆم گێڕانـەوە، دواتـر زانیـم باوكـم كاتـێ گوێـی لـە هـاواری مـن بـووەو ئـەو ترسـەی لـێ بینیـوم نـەزری كـردووەو گوتوویەتـی: (ئەگـەر خـوا ئـەم كـوڕەم شـیفا بـدات، ئەوەنـدە سـەر ئاژەڵـە دەكەمـە خێـر) خـوای پـەروەردگار شـیفای دام و مـرازی باوكیشـم هاتـە جـێ و لـەو نەخۆشـیە درمـە ڕزگارم بـوو].

بیـرم دێ كـە جـاری یەكـەم ئـەو بەسـەرهاتەی بـۆ گێڕامـەوە پرسـیارم لـێ كـرد: بـەڵام خـۆ هاتنـی فریشـتەی گیـان كێشـان نیشـانەی ئەوەیـە ئـەو كەسـە تەمەنـی تـەواو بـووەو ئەجەلـی هاتـووە، خـۆ ئەگـەر كەسـێكیش كاتـی تـەواو بووبـێ هیـچ دوعـاو هیـچ نەزرێـك سـوودی پـێ ناگەیەنـێ؟!

باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ پێـی گوتـم: [دیـارە ئـەو كاتـەی ئـەوان هاتونەتـە لام ئـەو كاتـە نەبـووە كـە خـوای پـەروەردگار ئەجەلـی منـی تێـدا نوسـیوە، بـەڵام لەوانەیـە خـوای پـەروەردگار هێنانـی فریشـتەی گیـان كێشـان و پیشـاندانی بەمـن، بـۆ ئـەوە

بووبـێ زیاتـر هەقیقەتـی مردنـم لـەدڵ و دەروونـدا بچەسـپێنێ، بـۆ ئـەوەی ببێتـە هـۆكاری ئـەوەی لەهەمـوو كات و سـاتێكدا خـۆم ئامـادە بكـەم بـۆ مـردن} پاشـان پێـی گوتـم: {ئەجـەل دوو جـۆرە، ئەجەلێـك كـە گەڕانـەوەی بـۆ نییـە، لەگـەڵ ئەجەلێكـی هەڵـواسراو، ئـەوەی كـە گەڕانـەوەی بـۆ نییـە ئـەوە تەنهـا خـوا خـۆی دەیزانـێ، ئـەوەش كـە هەڵـواسراوە ئەگـەری گۆڕانـی هەیـە بەویسـتی خوایەو، گۆڕانەكـەش بەهـۆی هۆكارەكانـە بـەو شـێوەیەی كـە خـوا خـۆی دەیـەوێ، ئـەوەی دووەمیـان كـە ئەجەلێكـی هەڵـواسراوە لەوانەیـە خـوا كەسـە تایبەتەكانـی لـێ ئـاگادار بكاتـەوە}.

## بەژداری كردنی لە جەنگی جیهانی یەكەم، ئەنجامدانی هاوسەرگیری و، حەج كردنی بۆ ماڵی خوا

**جەنگی جیهانی یەكەم و بەژداری كردنی باوكم تیایدا:**

كاتــێ جەنگــی جیهانــی یەكــەم لەســاڵی (١٩١٤)ز ڕوویــدا، باوكـم لـە گـەڕان و سـوڕان بـەدوای زانسـتدا گەڕایـەوە، لەشـوێنی سـەرەكی خـۆی جێگیـر بـوو، واتـە: گەڕایـەوە بـۆ ماڵەكـەی خۆیـان لـە گونـدی جیلـكا، هـەر لـەوێ بـووە ئیـمام و مامۆسـتای قوتابیانـی زانسـتی شـەرعی مزگـەوت.

زۆر بیــری لــەو جەنگــە دەكــردەوە كــە پریشــكی ئاگرەكــەی بـڵاو ببویـەوەو داگیرسـابوو، ئامانجـی ئـەو جەنگـەش لەنـاو بردنـی خەلافەتـی ئیسـلامیی بـوو كـە ئـەوكات كۆتـا هەناسـەكانی تەمەنـی هەڵدەكێشـا، دوای بیـر كردنـەوەو تێڕامانێكـی زۆر باوكـم گەیشـتە ئـەو قەناعەتـەی كـە سـەرەڕای ئـەوەی خەلافـەت پارچـە پارچـە بـووەو تووشـی كۆمەڵێـك هەڵەو پەڵـەو لادان بـووە، بەڵام ئاڕاسـتەی ئـەم جەنگــە مەترســیەكی گەورەیــە لەســەر جیهانــی ئیســلامیی لەلایـەن وڵاتـی ڕوسـیا، كـە ئامانجـی ئەوەبـوو سـنوورێكی فراوانـی خەلافــەت بكاتــە پارووبــەك و قووتــی بــدات، یەكێكــی تــر لــە ئامانجەكانـی بریتیـی بـوو لـە فـراوان كردنـی دەسـەڵات و حوكمـی

قەیسەر بەسەر ناوچەكەدا، ئیتر باوكم گەیشتە ئەو باوەڕەی پێویستە مسولمانان لەهەموو كونج و كەلەبەرەكانی چوارچێوەی خەلافەتی ئیسلامیی نەفیری عام لێبدەن بۆ دوور خستنەوەی ئەو مەترسیەو پارێزگاری كردن لە ولاتانی مسولمانان.

لە سۆنگەی هەست كردن بەو بەرپرسیارێتییە زۆری پێنەچوو بوو بە موجاهیدێكی خۆبەخش لەو جەنگە، بۆ ئەم مەبەستە لەسەری پێویست بوو خودی خۆی هەموو پێداویستی و خەرجیەكانی سەربازیی خۆی دابین بكات، دوای مەشقێكی سادەو ساكار لە هەندێ لە سەربازگە نزیكەكان، خۆی و كۆمەڵێكی دیكەیان ڕەوان كردن بۆ چەند شوێنێكی نزیك لە سنووری ڕوسیا لە نزیك (وان) و (بەتلیس) و ناوچەكانی دەریای ڕەش.

بەژداری كردنی باوكم لەم جەنگە ئەزموونێكی قورس و فاشیل بوو، لەبارەی بەژداری كردنەكەی پێی گوتم: (من وای بۆ دەچووم بەبەژداری كردنم لەم جەنگە كارێكی جیهادی ئەنجام دەدەم و خواش لەسەر ئەم كارە پاداشتم دەداتەوە، بەلام تەماشام كرد لەبری ئەوەدا خەریكە وا تووشی كەمتەرخەمی دەبم لە ئەنجامدانی گەورەترین واجب و بناغەی هەموو عیبادەتەكان كە بریتییە لە نوێژ كردن، ئەو ئەفسەرەی بەرپرسی ئێمە بوو ئەنجامدانی نوێژی لێ قورس كردبووین، زیاتر لەجارێك هەوڵی ئەوەی دەدا قەدەغەم بكات لە ئەنجامدانی گرنگترین ڕوكنی ئایین كە نوێژە، ئەوەش ناچاری كردم پێی بڵێم: من سەربازێكی فەرمی نیم لە سەربازگەكەی تۆ،

مـن کەسـێکی خۆبەخشـم، بـۆ جیهـاد کـردن هاتـووم، هەروەهـا هەمـوو خەرجیەکانـی کارەکـەی خۆشـم گرتۆتـە ئەسـتۆی خـۆم، بێئـەوەی هیـچ منەتێکـی ئێـوە هەڵگـرم، تەنهـا لەپێنـاوی خـوادا، بـەچ هەقێـك ڕێگریـم لـێ دەکـەی لـە جێبەجـێ کردنـی فەرمانـی خـوا؟ مـن بۆهیـچ شـتێك نەهاتـووم لەگەڵتـان بـەژدار بـم، جگـە لـە بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدی خـوا؟!}.

هەروەهـا وەسـفی ڕەوشـت و هەڵـس و کەوتـی زۆربـەی سـەربازو ئەفسـەرەکانی دەکـرد، کـە چـۆن لەڕاسـتە ڕێـی خـواو ئاینـی ئیسـلام لایاندابـوو، کەوتبوونـە نێـو گونـاح و تاوانـەوە، سـەرەڕای گونـاح و تـاوان کەوتبوونـە نێـو فاحیشـەو خراپەکاریـش، دەیگـوت: {جارێکیـان پرسـیارم لـە یەکێکیـان کـرد لەبـارەی نـاوی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کەچـی نەیزانـی نـاوی چییـە!!}.

بیـرم نەمـاوە مـاوەی مانـەوەی لەوێـدا چەنـدی خایانـدوە، بـەڵام ئـەوە دەزانـم بەبـێ ئومێـدی و بـێ هیوایـی گەڕایـەوە، دوای ئـەو بـەژداری کردنـەش دڵنیـا بـوو قەناعەتـی تـەواوی بـۆ درووسـت بـوو کـە سـەرەنجامی خەلافەتـی ئیسـلامیی لەناوچوونـە، چونکـە هیـچ کاتێـك ناوونیشـانی قەبـەو گـەورەی بـێ نـاوەڕۆك نەبۆتـە شـوورەو قـەڵا بـۆ پاراسـتنی ئوممـەت، وە هەرگیـز ناوونیشـانی گـەورەی بـێ نـاوەڕۆك شـوێنی ڕەوشـت و ئـاکارو هەڵـس و کەوتـی جـوان و بەرچـاو ڕوونـی ناگرێتـەوە.

سـەبارەت بـە بـارو دۆخـی سـەخت و نالەبـار و ناهاوسـەنگی سـوپاش باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ دەیگـوت:

{چوونمـان بـۆ سـنووورەكانی وان و بەتلیس لەوەرزی زسـتان بوو، سـەربازگەش یارمەتـی نەدەدایـن بـەو شـتانەی کـە پێویسـتمان بـوو بـۆ وەرزی زسـتان، تەنانـەت سـەرەتاییترین خزمەتگوزاریەكانیـان بـۆ دابیـن نەدەكردیـن، بـۆ ئـەوەی خۆمـان لـەو سـەرماو سـۆڵ و بەفـرە زۆرەی ناوچەكـە بپارێزیـن، تاكـە شـتێك بـۆ ئـەوەی خۆمـی لـێ بپارێـزم لـەو سـاردو سـەرما زۆرە بریتـی بـوو لـەو چاكەتـە قوڕسـەی کـە هەمبـوو، شـەوو ڕۆژ لەبـەرم بـوو، هەنـدێ جاریـش ناچـار دەبـووم بیـدەم بەهەنـدێ لـەو سـەربازانەی کـە حاڵیـان خـراپ بـوو لەبـەر سـەرما، لـەو کاتانـەش بـێ چاكـەت و بـێ بەتانـی دەمامـەوە}، هەروەهـا ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ دەیگـوت: {ئـەو ڕۆماتیـزی ئەعصابـەی کـە تـا ئێسـتاش و لەسـەردەمێکی زووەوە بەدەسـتی دەناڵێنـم هۆكارەكـەی ئـەو ڕۆژانـە بـوو کـە تووشـی ئـەو سـەرماو سـۆڵە زۆرە بـووم و سـەرما لێیـدام، هەنـدێ جـار چەنـد سـەعاتێکی زۆر بەپـێ لەنێـو بەفـردا دەڕۆیشـتم}.

**پێکهێنانی ژیانی هاوسەری:**

دڵنیـا نیـم لـەوەی کـە ئایـا هاوسـەرگیری کردنـی باوکـم بـەر لـە دەرچوونـی بـوو بـۆ بـەژداری کردنـی لـەو جەنگـە، یاخـود دوای گەڕانـەوەی بـوو، گرنـگ ئەوەیـە لـەو ماوەیـەدا ژیانـی باوکـم لـە سـەڵتیەوە گـۆڕا بـۆ ژیانـی خێزانـداری، کچێکـی لـە نزیکانـی خـۆی خواسـت، کـە ئەویـش دایکـی منـە نـاوی (مەنجـی) بـوو، شـتێکی ئەوتـۆ لـە هەواڵـی هاوسـەرگیریەكەی نازانـم، بـەڵام دایکـم زۆر جـار باسـی کەشـخەیی و جوانـی خـۆی دەكـرد لەسـەردەمی

گەنجێتـی، پێدەچـێ ئـەوەی زیاتـر بووبێتـە جێـی سـەرنجی دایکـم لەڕۆژانـی خوازبێنیەکـەی گرنگـی دان و تایبەتمەنـدی دینـداری باوکـم بووبـێ، ئەمـە سـەرچاوەی ڕازی بـوون و غیبتـەی ئەوبـووە، وای لـێ کـردووە ڕازی بێـت بـە باوکـم، زۆر جـار باوکمـی بینیـوە کـە ماوەیەکـی زۆر لەنێـو باخچەیەکـی نزیـك ماڵـی خۆیـان دانیشـتووەو قورئانـی خوێنـدووەو ئـەو ویردانـەی کـە لەبەریەتـی لـەوێ دووبـارەی کردۆتـەوە.

بەهەرحـاڵ ژیانـی خێزانـی ئـەوان خاڵـی نەبـووە لـە کێشـەو ئاسـتەنگ، باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ هەمـوو گرنگـی پێدانێکی بـۆ زانسـت و دەرس گوتنـەوەو ئـاگادار بوونـی قوتابیەکانـی بـوو، پێشـتر ڕوونـم کـردەوە کـە سیسـتمی خوێنـدن لـەلای کـوردەکان پشـتی بـە بازنـەی زۆری یـەك لـەدوای یـەك دەبەسـت، کـە چەنـد قوتابیـەك بـەدوای یەکـدا دەهاتـن بـۆ دەرس خوێنـدن، لەوانەیـە جـاری وا بووبـێ لـە حەلقەیەکـدا تەنهـا یـەك قوتابـی هەبووبـێ.

ئەمـە گرنگتریـن کار بـوو باوکمـی سـەرقاڵ کردبـوو، دایکیشـم پێـی هەراسـان بووبـو، هەروەهـا دایـك و باوکـم منداڵیـان بـۆ نەدەمایـەوە، هـەر منداڵێکیـان دەبـوو دوای ماوەیەکـی کـەم دەمـرد، دوای ئـەوەی کۆتـا منداڵیـان دەبـێ، -نازانـم چەنـد سـاڵ دوای هاوسـەرگیریەکەیان- ئـەو کەسـەی کـە ئێسـتا ئـەم دێڕانـە دەنووسـێ[1]، باوکـم منداڵەکـە هەڵدەگـرێ و دەیبـات بـۆ لای یەکێـك لـە مامۆسـتاکانی، ئـەو مامۆسـتایە لای باوکـم زۆر بەڕێـزو

---

(١) شێخ بوطي مەبەستی خۆیەتی ڕەحمەتی خوای لێبێ (وەرگێڕ).

گەورە بوو، باوەڕی بەچاكی و خواناسی ئەو مامۆستایەی هەبوو، ناوی شێخ سەعید بوو كە ناسرا بوو بە ( شێخ سەیدا) ئەو شێخە دوعا بۆ منداڵەكەی باوكم دەكات و ئەو شتانەشی بۆ دەكات كە سوننەتە بۆ منداڵ بكرێ، وە هەرخۆی ناو لە منداڵەكە دەنێ (محمد سعيد)، ئەگینا باوكم پێی خۆش بوو ناوم لێبنێ: (محمد فضيل).

## چوونی بۆ ماڵی خوا:

هێشتا ساڵێك بەسەر لەدایك بوونمدا تێپەڕی نەكردبوو، تاسەی شەوق و تامەزرۆیی لەناخی باوكمدا كڵپە دەستێنێ بۆ سەفەری ماڵی خواو زیارەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆ ئەم مەبەستە هەر زوو ئامادەكاریەكانی دەست پێ دەكات، ئەو كات گەشت كردن لە جەزیرەی بۆتانەوە بۆ ماڵی خوا بەچوون و هاتن زیاتر لە پێنج مانگی دەخایاند، حاجیەكان بەسەر پشتی وڵاخ و بەنێو دەریادا ئەو ماوەیەیان دەبڕی.

هەر لەو ساڵەدا تامەزرۆ بوونی باوكم بۆ ماڵی خوا دەچێتە بواری جێبەجێ كردن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی دایكم زۆر داوای لێ دەكات ئەم سەفەرە دوا بخات و لەگەڵ تاقە منداڵە تازە لەدایك بووەكەیدا بەدیار قەدەرێكی نادیارەوە جێی نەهێڵێ.

وا پێدەچێ گەشتەكە پڕ بووبێ لە زەحمەتی و ماندوێتی، یەكێ لە قورسی و زەحمەتیەكانی ئەم گەشتە ئەوەبوو ئەو پیاوەی كە خاوەنی وشتر بوو باوكم پێشتر لەگەڵی پێكهاتبوو

بـە بڕێـك پـارە بـۆ ئـەوەی بیگەیەنێتـە شـاری مەككـە، كەچـی بـەر لەگەیشـتنیان بەشـاری مەككـە بـە ماوەیەكـی زۆر، كابرا بەوشـترەوە هەڵـدێ، ئەمـەش باوكـم ناچـار دەكات ئـەو مـاوە دوورو درێـژە بەپـێ ببـڕێ، بـەڵام باوكـم كاتـێ ئـەم بەسـەرهاتەی بـۆ بـاس دەكردیـن زۆر بەخۆشـحاڵی و ڕازی بوونـەوە دەیگێڕایـەوە، دڵـی بـەوە خـۆش بـوو كـە بەپـێ بـەرەو ماڵـی خـوا ڕۆیشـتووە، لەبـەر ئـەوەی یەكـێ لـە ئومێدەكانـی باوكـم كـە خەونـی پێـوە دەبینـی ئەوەبـوو بەپـێ بچێتـە نێـو حەرەمـی مەككـە واتـە: ئـەو ماوەیـە بەپـێ ببـڕێ، هەمووجـار دەیگـوت: {خـوا ئـەو فـەزڵ و ڕێـزەی پێـدام كـە خـەوم پێـوە دەبینـی، بـێ ئـەوەی دەسـتی خۆمـی تێدابـێ و پلانێكـی پێـش وەختـەی بـۆ داڕێـژم}.

لەمـاوەی جێبەجـێ كردنـی ئەركەكانـی حـەج، یـان دوای ئەنجامدانـی فەریزەكـە - بـاش بیـرم نایـە - خەوێـك دەبینـێ كـە تاقـە منداڵـە بچووكەكـەی كـە هێشـتا نەبۆتـە سـاڵێك مـردووە، كاتـێ لەخەوەكـەی خەبـەری دەبێـتەوە، خەوەكـە زۆر كاریگـەری لەسـەر درووسـت دەكات، وا خەیـاڵ دەكات كـە خەوەكـەی خەوێكـی ڕاسـتەو ئـەو منداڵەشـی وەك ئەوانـی دیكـەی مـردووە، ئەمـەش زۆر خەمبـارو خەفەتبـاری دەكات، بیـر لـەوە دەكاتـەوە بەیەكجـاری نیشـتیمانەكەی خـۆی جێبێڵـێ و نەگەڕێتـەوە، واز لـە مـاڵ و خێزانەكـەی بێنـێ، بەتەنیشـت شـاری مەككـە یاخـود مەدینـەدا بمێنێتـەوە، ئەوەی مـن لەباوكم گەیشـتبم ئـەو بیركردنەوەیە هێنـدەی نامێنـێ ببێتـە بڕیـارو بچێتـە بـواری جێبەجـێ كـردن، بەڵام لەكۆتاییـدا خـوای پـەروەردگار لـەم وەسوەسـەو خەیاڵاتـە ڕزگاری

دەكات، لەو بیركردنەوەیەی كە خەریكە دەچێتە بواری جێبەجێ كردن پەشیمان دەبێتەوە، فەریزەی حەج جێبەجێ دەكات و دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەكەی، لەڕێگادا هەموو كەل و پەلەكانی لێ ون دەبێ تەنانەت ئەو دیاریانەش كە لەوێوە بۆ خزم و كەس و نزیكانی كڕیبووی، بەهۆی ئەوەی بەهەڵە دەخرێنە كەشتییەكەوە كەبەرەو هیندستان دەچێ.

باوكم دەگاتەوە گوندی جیلكا بۆ ئەوەی ببینێ كە ئایا منداڵەكەی سەلامەتە یاخود نا؟ دەبینێ هەموو شتێك لەشوێنی خۆیەتی و منداڵەكەی هیچی لێ بەسەر نەهاتووە، بەڵام بەشێوەیەك گەڕایەوە كە هیچ شتێكی (لەدیاری و كەل و پەل) بەدەستەوە نەبوو بۆ خزم و نزیكانی دوای سەفەرێكی دوورو درێژی پێنج مانگی.

**ئەو نەخۆشیەی وای لێكرد كتێبێك بنووسێ:**

هێشتا بەتەواوی ماندوبوونی سەفەری لەلەشدا دەرنەچوبوو، وەك پێویست پشووی نەدابوو، تووشی نەخۆشیەكی توند بوو، لەبەر ئێش و ئازاری نەخۆشیەكە ماوەیەكی زۆر كەوتە سەر جێگا.

خەمی گەورەی باوكم لەو ماوەیەدا ئەوەبوو كە بمرێ و ئەو منداڵە بچووكە لەدوای خۆی جێبێڵێ، لە گوندێكدا كە پڕیەتی لە نەخوێندەواری و نەفامی و دوور بوون لە پابەندیی بەدین و ڕەوشت، دەترسا كە بمرێ و منداڵەكەی موحتاجی كەسێك بێت پەروەردەیەكی جوان و تەندروستی بكات.

دوای ئـەوەی لەنەخۆشـیەکەی ڕزگاری دەبـێ و دووبـارە لـەش ساغی بـۆ دەگەڕێتـەوە ئامانجـی یەکـەم و خەمی گـەورەی ئەوەدەبێ کـە خـۆی یـەکلا بکاتـەوە بـۆ نووسـینی کۆمەڵێـك ئامـۆژگاری و وەسـیەت لەپێنـاو پـەروەردە کـردن و ئاڕاسـتە کردنـی کـوڕە بچووکەکـەی، کتێبێکـی بـۆ بنووسـێ تـا ئـەوەی کاتـێ چاوەکانـی بـەڕووی دونیـادا دەکاتـەوەو هـەراش دەبـێ دەسـتی پێـوە بگـرێ و ئامـۆژگاری و وەسیەتەکانی جێبەجـێ بـکات، ئەمـەش لەترسـی ئـەوەی نەوەکـو دوبـارە نەخـۆش بکەوێتـەوەو هەلێکـی لـەم جۆرەی بـۆ نەڕەخسـێ نەتوانـێ وەسـیەت و ئامۆژگاریەکانـی لـەدو توێـی نامیلکەیەکـدا بنووسـێ.

باوکـم بۆچونـی وابـوو ئەگـەر بێـت و تاقـە کوڕەکـەی لەپـاش خـۆی دەسـتی لـە نووسـینێکی لـەم شـێوەیە گیربـێ کـە بنەماکانـی پـەروەردەی تێـدا نـووسراوە کـە ئـەم خـەو بـەوە دەبینـێ بتوانـێ منداڵەکـەی لەسـەر ئـەو بنەمایانـە پـەروەردە بـکات، ئـەوا دەبێتـە باشـترین جێگـرەوەو سـەبووری بـۆ ئـەو، لـەدوای مردنـی.

بـەم شـێوەیە باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ خـۆی یەکلا کـردەوە بـۆ نووسـینی کتێبەکـە، -وەك دواتـر خـۆی بـۆی بـاس کـردم- کـە بریتـی بـوو لـە نووسـینی چەنـد وەسـیەت و ئامۆژگاریـەك، دواندنەکـەش بـۆ منداڵـە بچوکەکـەی بـوو کـە هێشـتا فامـی نەکردبـوو، بـۆ ئـەوەی ئەگـەر لەداهاتـوودا فامـی کـردو گـەورە بـوو بینـی باوکـی نەمـاوە، ئـەوا ئـەو کتێبـە بکاتـە شـوێنگرەوەو بیخوێنێتـەوە، خـۆی بـە ئامـۆژگاری و وەسـیەتەکانی نێـوی پابەنـد

بـكات، سـوپاس بۆخـوا كتێبەكـە تـەواو بـوو، هەمـوو ئـەو شتانەی کـە ئـەو بەپێویسـتی دەزانـی لـە داهاتـوودا بەمنداڵەكـەی بڵـێ بـە دەسـت و خەتـی خـۆی لـە كتێبەكـەدا تۆمـاری كـردن، پاشـان خـوای باڵادەسـت فەزڵـی ئـەوەی لەگـەڵ كـرد، ئـەم وەك بـاوك بـۆ منداڵەكـەی بهێڵێتـەوە تـا گـەورە دەبـێ، بەڵكـو كوڕەكـەی گەیشـتە ئـەو تەمەنـەی كـە باوكـی بەسـەرهاتی نەخۆشـیەكەی خـۆی بـۆ بـاس بـكات، كـە چـۆن كاتـی خـۆی ئـەو نەخۆشـیە هانـی داوە بـۆ نووسـینی ئـەو وەسـیەتانە لـەو نامیلكەیـەدا، گەیشـتە ئـەو تەمەنـەی کـە منداڵەكـەی لەبەرامبەریـدا دابنیشـێ و زیاتریـش لـەوەی كـە لەدوتوێـی نامیلكەكـەدا بەدەسـت و خەتـی خـۆی نوسـیویەتی بەمنداڵەكـەی بڵـێ، نـەك هـەر ئەوەنـدە بەڵكـو بەدەرسـیش لـەلای بخوێنـێ.

پاشـان باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ ئـەو ئامۆژگاریانـەی کـە بۆمـن نوسـیبوونی هێنـدەی تریشـی لـێ زیـاد كـرد، بـەڵام بـە داڕشـتنێكی تـازە بـۆ ئـەوەی هـەر كەسـێك بیخوێنێتـەوە خـۆی تێـدا ببینێتـەوە، ئنجـا لـەدوو توێـی كتێبێكـی بچووكـدا بەچـاپ گەیەنـرا، لەوانەشـە دووبـارە چـاپ بكرێتـەوە بـە چاپێكـی نـوێ و جوانـتر.

**ڕووكردنە بەندايەتی و پەرستش، بەشێوەیەكی توندو تۆڵ و گەرم و گوڕ:**

دواتــر لەدايكمــم زانيــەوە ئــەو ســەفەرەیماڵــی خــوا، وای لەباوكـم كـرد دوای گەڕانـەوەی زياتـر سـام و هەيبـەت و گەورەيـی خـوا لەناخيـدا ڕەگ و ڕيشــەی خــۆی داكوتــێ، بــووە هــۆكاری گـەرم و گـوڕی و گـڕو تينـی زياتـر لـە بەندايەتـی كردنـی بـۆ خـوا سـبحانە و تعــالی، هەروەهــا بــووە هــۆی زياتــر ڕووكردنــە زيكــرو يــادی خــواو خوێندنــەوەی قوڕئــان، ئەمــە ســەرەڕای بــەردەوام بوونـی لەسـەر وانـە گوتنـەوەو چاودێـری كـردن و پـەروەردە كردنی قوتابيەكانــی، هەروەهــا دايكــم باســی خەڵوەتەكانــی باوكمــی بــۆ دەكــردم كــە ماوەيەكــی زۆری لــە خەڵــوەت كــردن بەســەر دەبــرد، باسـی ئـەوەی بـۆ دەكـردم كـە چـۆن باوكـم دوای ئـەو سـەفەرە خــۆی بــۆ خــوا يــەكلا دەكــردەوەو دەچــووە خەڵوەتــەوە، ئــەم خەڵوەتانـەش حاڵـی زۆر سـەرنج ڕاكێشـی لـە باوكمـدا درووسـت كردبــوو لەبەرامبــەر خــوادا.

دايكــم بــۆی گێڕامــەوە: {جارێكيــان باوكــت حاڵێكــی بــۆ درووسـت بـوو لـە سـام و هەيبـەت كـردن لـە خـوا ئـەو ڕۆژە لەگەڵ هيـچ كەسـێك گفتوگـۆی نەدەكـرد، لـە مـاڵ چـووە دەر بـێ ئـەوەی لا بەهيــچ لايەكــدا بكاتــەوە، لەحاڵێكـدا بـوو وەك ئـەوەی شـێت بووبـێ، پێشـتر حاڵـی وام لێـی نەبينيبـوو، منيـش بەدوايـدا چـووم بـۆ ئـەوەی بزانـم بـۆ كـوێ دەڕوا، سـەيرم كـرد باوكـت بەپەلـە بەرەو قەدپاڵــی چيــاكان هەنــگاو دەنــێ، منيــش هيچــم لەدەســت نەهــات ئەوەنەبـێ بەشـوێن قوتابيانـی مزگـەت بنێـرم بـۆ ئـەوەی پەلـە بكـەن و خۆيــان بگەيەنــن بــە مامۆســتاكەيان}.

من لەبارەی هەقیقەتی ئەم بەسەرهاتە پرسیارم لەباوكم كرد، ئەویش بە پێكەنینەوە گوتی:

{بەڵێ، دایكت نكوڵی دەكردو سوور بوو لەسەر ئەوەی بڵاوی بكاتەوە كەمن شێت بوومە، شێتیەك لە ئارادا نەبوو، ئەوەی بەسەرم هات هەست و شعور كردنم بوو بەهەندێ سیفاتی خوای بەرزو مەزن بەجۆرێك هەموو دەروونی پڕ كردبووم، بێ ئاگای كردبووم لەدونیا، ئەم حاڵە هەڵچوونێكی دڵ و دەروون بوو بێ ئەوەی ویستی خۆمی لەسەربێ، هۆكاری قسە نەكردن و دوور كەوتنەوەكەشم لەبەر ئەوەبوو نەوەك سەرقاڵیەكانی ژیان، یان قسەیەكی دونیایی ئەو حاڵەم لێ تێك بدات كە تێیدا بووم، هەر ئەمەش بوو وای كرد دایكت وابزانێ كە شێت بوومە}.

من ئێستا دەتوانم ئەو شوێنەوارە بهێنمەوە بەرچاوی خۆم كە بریتی بوو لە چوار كۆنە دیواری ڕووخاوی بێ سەقف، لە ناوەندی ڕووبەرە زەویەكدا كە هیچ شتێكی دیكەی بەدەورەوە نەبوو، واتە كەوتبووە شوێنێكی چۆڵ، باوكم هەندێ جار منی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ ئەو شوێنە، لەوێ وازی لێ دەهێنام تا لەدەورو بەری ئەو دیوارانەدا بۆخۆم یاری بكەم و سەرقاڵ بم، خۆیشی لەسەر پارچە حەسیرێكی بچووك لەو زەویە چۆڵەو لەنێو ئەو چوار دیوارە ڕووخاوە دادەنیشت و ڕۆدەچووە نێو قورئان خوێندن، پێم شك نایە لەو خەڵوەتانەیدا حاڵێكم لێ بینیبێ هاوشێوەی ئەوەی دایكم باسی كرد، من ئەو كات -وەك دواتر زانیم- تەمەنم لەنێوان دوو بۆ سێ ساڵان بوو، شتێكی وا

سەرنجێڕاكێشـی ئـەو ڕۆژانـەم نایەتـەوە بیـر، جگـە لـەو كاتژمێـرەی نێـو گیرفانـی كـە جـار جـارە سـەیری دەكـرد، جارێكیـان بینیـم میلەكـەی دەسـوڕاند بـۆ ئـەوەی دووبـارە پـڕی بكاتـەوە، منیـش پرسـیارم لێكـرد بۆچـی وا دەكات؟ پێـی گوتـم: كاتژمێرەكە برسـیەتی، ئەمیـش لەسـەری پێویسـتە بـەم شـێوەیە خواردنـی بـۆ ئامـادە بـكات، ئـەم وەڵامـەی باوكـم لـە بیـرو ئەندێشـەمدا ماوەتـەوە تـا ئەمـڕۆ، بـێ ئـەوەی ئـەو كاتـە شـتێك لەمانـای قسـەكەی تێبگـەم.

مـن ئێسـتا پرسـیار دەكـەم: ئایـا چ شـتێك ئـەو گۆڕانكاریـەی لەژیانـی باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ درووسـت كـرد؟ چ شـتێك وای لێكـرد بـەم شـێوەیە قـووڵ بێتـەوە بەنێـو ئـەو هەسـت و شـعورە بـەرزو ناسـكانە، كـە پێشـتر حاڵـی لـەم جـۆرەی بەخـۆوە نەبینـی بـوو؟ لەگـەڵ ئـەوەی كـە باوكـم وەك پێشـتر باسـم كـرد لەژیانـی قوتابێتـی خـۆی جیـا بـوو لـە زۆربـەی قوتابیەكانـی تـر، بـەوەی كـە زۆر لای كردبـووەوە بـەلای خـوا پەرسـتی و تەزكیـەو دیراسـە كردنـی تەصـەووف و گرنگـی دان بـە لەبـەر كردنـی قوڕئـان، بـەڵام مەبەسـتم ئـەو حاڵـە غەریـب و نامۆیانەیـە كـە دەم نـا دەم بەسـەری دەهـات لـە هەسـت كردنـی بـە حـزووری خـوا، كـە دایدەبڕانـد لـەدەورو بـەری، ئـەوەی مـن بەدواداچوونـم بـۆ كردبـێ ئـەم جـۆرە حاڵانـەی پێـش سـەفەری حـەج لـێ نەبینـراوە.

ئایا خاڵی گۆڕانكاریی بریتی بوو لە حەج كردنەكەی؟

لەوانەیـە وردتریـن وەڵام بـۆ ئـەم پرسـیارە لەنێو ئەو بەسـەرهاتەبێ كـە باوكـم زیاتر لە جارێـك بـۆی گێڕاومەتـەوە، دەیگـوت: {ڕۆژێكیان

وانـەم بـە یەکـێ لـە قوتابیەکانم دەگـوت، لەپـڕ حاڵێکم بەسـەرداهات، کـە یەکەمجـار بـوو حاڵـی لـەم جـۆرەم بەسـەربێ لەژیانـی خۆمـدا، وای لێکـردم توانـای بەدواداچوونـی وانەکـە لەدەسـت بـدەم، نـەك هـەر ئەوەنـدەو بـەس بەڵکـو وای لێکـردم توانـای قسـە کردنیشـم نەمێنـێ، دوای کەمێـك هەسـتم کـرد شـتێك وەك ئـاوی سـارد دەڕژێتە نێـو دڵـم، لـەو ڕۆژە بـەدواوە کەوتمـە بـەر ئـەو تیشـکە خواییـە کـە هەمـوو هەسـت و هۆشـی داپۆشـیم و دەم نـا دەمێکیـش کاریگـەری لەسـەر دڵـم پەیـدا دەکـرد، دوای ئـەم حاڵـەش کـە لـە کاتـی دەرس گوتنەوەکـە تووشـی بـووم نەخـۆش کەوتـم و توشـی ئێـش و ئازارێـك بـووم وای لێکـردم چەنـد ڕۆژێـك لەسـەر جێـگادا بمێنمـەوە}.

لــەوە بــەدوا ئــەم نەخۆشــیە شــاراوەو پەنهانــە مــاوە مــاوە دووبــارە تووشــی باوکــم دەبوویــەوە، بەتایبــەت ئــەو کاتانــەی هەسـت و شـعوری مەوجـی دەدا بەهـۆی تـرس و خشـوعێکی زۆر کــە زاڵ دەبــوو بەســەر هەمــوو بوونیــدا، بیــرم دێ دوای جێگیــر بوونمـان لـە شـاری دیمەشـق بـۆ ئـەم مەبەسـتە سـەردانی هەنـدێ لـە پزیشـکانی کـرد، دکتـۆر پێـی ڕاگەیانـد کـە هیـچ چارەسـەریەك شـك نابـات بـۆ ئـەو نەخۆشـیەی ئـەو، نەخۆشـیەك کـە نەدەتوانـێ ڕوونـی بکاتـەوە چـی بەسـەردێت و نـە ناوێکیشـی هەیـە، دکتـۆر هـۆکاری نەخۆشـیەکەی گەڕانـدەوە بـۆ ئـەوەی کـە: بەهـۆی خـۆ گرتنەوەیەتــی لەزۆربــەی خواردنــەکان، وە پێــی ڕاگەیانــد ئــەم نەخۆشـیە لەگەڵـی بـەردەوام دەبـێ تـا مـردن[1]!

---

(١) دکتۆرەکە کورد بوو، ناوی دکتۆر نافذ بوو.

لەڕاستیدا باوکم بەر لە مردنی بەزیاتر لە سێ ساڵ لەو نەخۆشیەی چاك بوویەوە کە جار جارە دەیگرت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەو حاڵەی بۆی درووست دەبوو دواتر دەبووە هۆی نەخۆش کەوتنی وەك خۆی مایەوە، واتە: حاڵەکەی هەر بۆ درووست دەبوو بەڵام نەدەبووە هۆی نەخۆش کەوتنی، بەم شێوەیە ئەم نەخۆشیە پەنهان و شاراوەیە ماوەیەکی زۆر لەباوکمدا مایەوە بێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانرێ، پاشان لێی جیا بوویەوە بەهەمان شێوە بێ ئەوەی هۆکاری چاك بوونەوەکەی بزانرێ.

## كۆچ كردن بەرەو شام

**هۆكارەكانی كۆچ كردنەكە:**

لەنێــو ئــەو قوتابیانــەدا كــە وانەیــان لای باوكــی ڕەحمەتیــم دەخوێنــد گەنجێكــی صاڵــح هەبــوو بەنــاوی (مــەلا یوســف) ڕۆژێكیــان هــات هەواڵێكــی بــۆ باوكــم هێنــا (بــەڵام قســەكانی زۆر بەكاریگەریــەوە دەكــردو بەشــێوەیەك لەكاتــی قســە كردنەكەیــدا دەســتی كــرد بەگریــان) گوتــی: {پێغەمبــەری خــوام ﷺ لەخــەودا بینــی، پێــی فەرمــووم: بــڕۆ بــە شــێخەكەت بڵــێ: بێــت و خــۆی بگەیەنێتــە مــن، منیــش هاتــم ئەمــەم پــێ گوتــی، تــۆش هاتــی و لەگــەڵ پێغەمبــەری خــوادا ﷺ ڕۆیشــتن بــۆ شــوێنێك نازانــم بــۆ كــوێ دەچــوون، منیــش زۆر هەوڵمــدا پێتــان بگــەم نەمتوانــی، بۆیــە بەتەنیــا لەشــوێنی خــۆم مامــەوە}.

نازانــم ئاخــۆ ئــەم خەونــە بــوو (كــە دەلالەتێكــی ڕوونــی تێدایــە) یــان نــا، وای لــە باوكــم كرد بیــر لە كۆچكــردن بكاتــەوەو ئــارەزووی ئــەوە بخاتــە دەروونــی كــە بەیەكجــاری نیشــتیمانی خــۆی جێبێڵــێ و جارێكــی تــر بــۆی نەگەڕێتەوە.

هەرچۆنێــك بێــت هــۆكاری دیكــەی زۆر هەبــوون وایــان لــە باوكــم كــرد مانــەوەی لــەم شــارەدا لــەلا پەســند نەبــێ، لــە گرنگترین هــۆكارەكان ئــەو زنجیــرە خراپەكاریــە پــڕ لــەڕق و كینەیــە بــوو كــە

ئەتاتــورك بــە ئەنقەســت ئاڕاســتەی ئیســلامی كــرد، مەبەستیشــی لـەم كارەدا ئەوەبـوو سـەرچاوەكانی ئیسـلام وشـك بـكات و پاشـان بەتـەواوی لەنـاوی ببـات لـەو شـوێنەدا كـە كۆتـا شـوێنی خەلافەتی ئیســلامیی بــوو، دیاریشــە لەســەرەتای كارەكەیــدا خەلافەتــە ئیسـلامیەكەی لەنـاو بـرد، پاشـان بانگـی بەزمانـی عەرەبـی قەدەغـە كـرد، دواتـر وشـە عەرەبیەكانـی گـۆڕی بـە وشـەی لاتینـی، دواتـر قورئــان خوێندنــی لــە شــوێنە گشــتیەكان قەدەغــە كــرد، پاشــان قورئانــی وەرگێــڕدراوی زمانــی توركــی لەشــوێنی قورئــان دانــا، دواتـر پیاوانـی ناچـار كـردن كڵاوی ڕۆژئاوایـی لەسـەر بكـەن، وە ئافرەتانـی ناچـار كـردن واز لـە نیقـاب و حیجـاب بێنـن.

شــتێكی زانراویشــە ئــەم زنجیــرە خراپەكاریــە ترســناكەی ئەتاتــورك بەپێــی پەیماننامــەی لــۆزان بــوو بەرامبــەر بەریتانیــا، لەمـاوەی كەمـتر لـە چـوار سـاڵ هەڵسـا بەجێبەجـێ كردنی، هێشـتا سـاڵی (١٩٣٤) نەهاتبـوو شـارو دێهاتـە توركیـەكان كەوتنـە بـەر تیــری ئــەو دوژمنكاریــەی ســەر ئیســلام لەلایــەن ئەتــا توركــەوە.

گونـدی (جیلـكا)ش كـە پـڕی بـوو لـە مزگـەوت و ژمارەیەكـی زۆری زانســتخوازی تێــدا بــوو، بەبــەر شــاڵاوی ئــەم دژایەتــی كردنــە كــەوت بــەو هۆیــەوە خەڵكەكــەی هەراســان بــوون و تووشـی بێئومێـدی و ڕەشـبینی بـوون، مـاوە مـاوە ژمارەیەكـی زۆری سـەربازان و پۆلیسـی تـورك لـە پڕێكـدا خۆیـان دەكـرد بـە گوندەكە، بەچـەك و جبەخانـەی زۆرو بـەو پـەڕی ئامادەكارییـەوە بـۆ كوشـتار كــردن دەهاتنــە ناوچەكــە.

هەر كاتێكیش ئەو سەربازانە دەركەوتنایە دەبوو بانگبێژەكان دەنگی خۆیان كپ بكەن لە بانگدانی شەرعی بەزمانی عەرەبی، هەروەها مزگەوتەكانیش خاڵی بكرێن لە قورئان و هەر كتێبێكی دیكە بەزمانی عەرەبی، هەروەها دەبوو خاڵی بكرێن لە هەموو كتێبێكی دینی، وە هەر كاتێ ئەو سەربازانە دەركەوتنایە پێویست بوو قوتابی و فێرخوازان بڵاوەی لێ بكەن و هەریەكەیان بچێتەوە ماڵەكەی خۆی، یاخود گوندەكەی خۆی، هەروەها پێویست بوو هەموو پیاوەكان سەریان نەوی بكەن بۆ لەسەر كردنی كڵاوی ڕۆژئاوایی، نەدەبوو مێزەرو جامانە لەسەر بكرێ.

ئەو سەربازانە هەر خانووێكی بیانویستایە لەگوندەكە داگیریان دەكرد بۆ ئەوەی ماوەی مانەوەیان لە گوندەكە لەو خانووە بەسەر بەرن، هەر كەسێكیش پێچەوانەی ڕێنماییەكانی ئەوان بجوڵایاتەوە بەتوندترین و سەختترین جۆری سزا، سزایان دەدا.

جا لەحاڵێكی ئاوادا چۆن وێنا دەكرێ باوكم بتوانێ لە كەش و هەوایەكی لەمجۆرەدا بژیێ، چۆن بتوانێ لەنێو ئەم دووكەڵ و غوبارە ڕەشەدا گوزەران بكات لەكاتێكدا لەتەنیشتیەوە ڕوناكیەكی ڕوون و ئاشكرا هەبێ؟

باوكم زۆر پابەند بوو بە مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژو دەرس و دیراسەت، فەرمانی بە قوتابیەكانی كرد كە هەرچی پەشتەماڵی نوێژو حەسیر هەیە لەزەوی مزگەوتەكە هەڵی

بگرن و بیپێچنەوە، لەبەر ئەوەی عادەتی سەربازەکان وابوو بەسەر مزگەوتەکانیاندا دەدا بە پێڵاوەوە، هەروەها باوکم گوێی پێ نەئەدان ڕووی دەکردە لایەکی مزگەوت و سەرقاڵ دەبوو بەخوێندنەوەی قورئان، یاخود بەخوێندنەوەی بەشێك لە کتێبی (دلائل الخیرات)، بێ ئەوەی ئاوڕ بەلای ڕاست و چەپیدا بداتەوە، گوێی بەهیچ قسەو دەنگێك نەدەدا کە دەیبیست، یان لەماڵەوە دەمایەوەو نەدەهاتە دەرەوە تا سەربازەکان وەك پەڵە هەورێکی تاریك ناوچەکەیان جێدەهێشت، بەبڕوای من ئەمە یەکەمین هۆکارو سەرەکیترین هۆکار بوو بۆ ئەوەی باوکم مانەوەی لەم وڵاتە پێ خۆش نەبێ و بەپەسندی نەزانێ.

سەرەڕای ئەمە چەند هۆکارێکی دیکەش هەبوون، یەکێ لەوانە جەهالەت و نەزانین زۆر بڵاو بوو لەنێو گوندەکان لەو سەردەمەدا، هەروەها پیاو ماقوڵانی گوندەکان بەهەواو هەوەسی خۆیان بڕیاریان لەسەر شتەکان دەدا، واتە: بەشوێن هەواو ئارەزووەکانیانەوە بوون، ئەمەش وای لێکردبوون خزمەتی پیاوانی ئەتاتورك بکەن، جگە لەوەی خزمەتیان دەکردن ئاگاداریشیان دەکردنەوە لەهەر زانیاریەك پیاوانی ئەتاتورك پێویستیان بووایە لەکارو باری ناو گوندو چالاکی و جم و جۆڵی دیندارانی ناوچەکە.

باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ باسی یەکێك لەو کەسانەی بۆ کردم کە خزمەتی پیاوانی ئەتاتورکیان دەکردو جاسوسیشیان بۆ دەکردن، ئەم پیاوە بە ئاغا ناوزەد دەکرا، باوکم ڕەحمەتی

خـوای لێبـێ لەبـارەی ئـەو پیـاوەوە بـۆی گێڕامـەوە: {پیاوێکـی زۆر خۆبەزلـزان و خۆپەسـند بـوو، عادەتـی وابـوو کڵاوەکـەی سـەری بەخـواری لەسـەر دەکـردو لایەکـی دەم و چـاوی خـۆی پـێ دادەپۆشـی، بـەم شێوەیە بـەو پـەڕی خۆپەسـندی و خۆبەگـەورە زانینـەوە تەماشـای خەڵکـی دەکـرد، ڕۆژێـك کەبـەم شـێوەیە لەسـەر پشـتی وڵاخەکـەی دانیشـتبوو تەماشـای منـی دەکـرد، بانگـی کـردم و گوتـی: فەقـێ! فەقـێ! پەرداخێـك ئـاوم بـۆ بێنـە، منیـش پێـم گـوت: ئاوەکـە لەبەرامبـەری خۆتـە دەتوانـی بچـی بیخۆیتـەوە! بەتوڕەییـەوە گوتـی: باشـە، کەوایـە منیـش دەتکەمـە ئامانـج و نیشـانەی ئاگـری چەکەکـەی دەسـتم، بـەڵام مردنـی خـۆی بـواری نـەدا مـن بکـوژێ، لەسـەر پشـتی وڵاخەکـەی بـوو، وڵاخەکـە فڕێی دایـە خـوارەوەو پێـی لـە گەردنـی نـاو کوشـتی!}.

عـادەت و تەقالیـدی خەڵکـی ئـەم لادێیـە وەك زۆربـەی لادێکانـی تـر ئەوەبـوو ئافرەتـان دەچوونـە دەرەوەی لادێ بـۆ ئـەوەی ئـاو بهێنـن بـۆ ماڵـەوە، چەنـد ڕۆژێکـی دیـاری کراویـان هەبـوو بـۆ چوونـە سـەر ڕووبـارو کانـی، بـۆ ئـەوەی هـەم خۆیـان بشـۆن و هـەم بـەرگ و پۆشـاکەکانیان، ئـەم کارەشـیان ڕۆژێکـی تـەواوی دەخایانـد ئـەو ڕۆژەیـان هـەم بـە گاڵتـە کـردن و هـەم بـە بـاس و خواسـی جـددی بەسـەر دەبـرد، کارە قوڕسـەکانیان لـەو ڕۆژەدا بەگاڵتـەو گـەپ ئەنجـام دەدا، شوێنەکەشـیان خاڵـی نەبـوو لـە گەنجـان کـە بەوێـدا گوزەریـان دەکـردو لـەدوورو نزیکـەوە چاودێـری ئافرەتانیـان دەکـرد.

باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ زۆر ڕقـی لەمـە بـوو، زۆر دژایەتی ئـەو نەریتـە خراپـەو هـەر نەریتێکـی دیکـەی لـەم شـێوەیەی دەکـرد، لەگـەڵ ئەوەشـدا لەغەیـری قەدەغـە کردنـی خێزانەکـەی خـۆی هیچـی تـری لەدەسـت نەدەهـات، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش خزمەتکارێکـی خسـتبووە بەردەسـتی بـۆ ئـەوەی کـە بێنیـازی بکات لـەو کارە ناپەسـندە، ئـەو خزمەتـکارە یارمەتیدەرێکـی بـاش بـوو بـۆ دایکـم لـە جێبەجـێ کردنـی ئـەو کارانـەی کـە لەگـەڵ ئادابـە شـەرعیەکان دژ دەوەسـتان.

یەکێکـی دیکـە لـە هۆکارەکانـی ئـەم کـۆچ کردنـە کـە خـۆی بـۆی باسـکردم بریتیـی بـوو لـەوەی هەنـدێ لەشـێخانی تەریقەتـی ناوچەکـە کـە خاوەنـی شـۆرەت و ناوبانـگ بـوون باوکمیـان دەناسـی، دەیانزانـی گەنجێکـی تێگەیشـتووە، لـەلادێ نزیـك و دوورەکانـی خۆیانـەوە بەشـوێن باوکمیـان دەنـارد لـەوەرزی زسـتاندا داوایـان لـێ دەکـرد موریدانـی دەوری خـۆی ڕاسـپێرێ تـا کۆڵکـە داریـان بـۆ کۆبکەنـەوە بـۆ خۆگـەرم کردنەوەیـان لـەوەرزی زسـتان، دوای ئـەوەش موریـدەکان ئـەو کۆلکـە دارانەیـان کـۆ دەکـردەوە دەبـوو باوکـم بـە هـەر هۆکارێـك کـە لەتوانایدایە کۆلکـە دارەکان بـۆ ئـەو شـێخانەی تەریقـەت بنێـرێ، بـەلام باوکـم ویسـتی ئەنجامدانـی ئـەو کارەی نەبـوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆر بەئـەدەب بـوو لەگەڵیـان، هەمـوو جارێـك بـۆی دەگێڕامـەوەو دەیگـوت: {ئـەوەی ئـەوان پێویسـتیان بووایـە لەکۆڵکـە دار بەپـارەی خـۆم بـۆم دەکڕیـن و پاشـان بـەولاخ بـۆم دەنـاردن بـێ ئـەوەی بهێڵـم پێـی بزانـن کـە کڕیومـە!}.

## پرس و ڕاوێژ كردن و، پەیمان بەستن

باوكم گوتی: [كاتێ بیرم لە كۆچ كردن كردەوە، ترسی زۆرم كەوتە سەر، شتێكی ئاسان نیە ئینسان خاك و نیشتیمانی خۆی جێبێڵێ و بەیەكجاریی كۆتایی بەهەموو ئەو پەیوەندیانە بێنێ كە بەزێدی ڕەسەنی باوكو باپیرانی دەبەستنەوە، ڕۆژێكیان كە قورئانم دەخوێند گەیشتمە ئایەتێك زۆر ڕایگرتم، بووە هۆی ئەوەی هەرچی ترس هەیە لەسەرمدا نەمێنێ، نەك هەر ترسی نەهێشتم بەڵكو ئەو ڕەغبەت و ئارەزووەی زۆر لەلا زیاتر كردم كە هەرچی زووترە نیشتیمانەكەم جێبێڵم، ئایەتەكەش ئەمە بوو، خوای بەرزو مەزن دەفەرمووێ: ﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾ ﴾[1] النساء.

---

(١) واتە: جا ئەوەی كۆچ بكات لە پێناوی خوادا لەو زەویەی كە كۆچی بۆ دەكات سەربەرزیەك بۆ خۆی و ڕیسواییەكی زۆریش بۆ دوژمنانی درووست دەكات، بەرەكەت و فراوانی ڕزق و ڕۆزی ڕووی تێ دەكات هەركەسێكیش ماڵ و حاڵی خۆی جێ بهێڵێ لەپێناو خواو پێغەمبەرەكەیدا دەربچێت، كۆچ بكات، پاشان مردن یەخەی پێ بگرێت ئەوە ئیتر ئەو كەسە پاداشتەكەی كەوتۆتە سەر خوا (هەر خۆی دەزانێت چۆن پاداشتی دەداتەوە) خوا هەمیشە بەردەوام لێخۆشبوو

بەهۆی ئەم ئایەتەوە گەیشتمە ئەو قەناعەتەی ئەگەر کۆچ بکەم یەکێك لەو دوو ئەنجامەم دەستگیر دەبێ و سێیەمی بۆ نییە، یان ئەوەتا دەرگای ڕزق و ڕۆزییم بۆ دەکرێتەوە، یان ئەوەتا وەفات دەکەم و خوای گەورەش پاداشتی ئەو کەسانەی لەو ڕێگەیەدا وەفات دەکەن خستۆتە سەر خۆی، جا هەر یەکێك لەو دوو ئەنجامەم دەستگیر بێ هەر خێرو خۆشبەختیە، بۆیە لەو کاتە بەدواوە بەدەروونێکی ئارام و ئاسودەو بێ دوودڵی بڕیارمدا خۆم ئامادە بکەم بۆ ئەم کۆچ کردنە.

بۆی گێڕامەوەو گوتی: {بڕیاری کۆچ کردنەکەم بەدایکت ڕاگەیاندو، ڕاوێژم لەسەر ئەم کارە پێکرد، خوا کارەکەی ئاسان کرد بەوەی دڵی ئەویشی بۆ ئەم کارە کردەوە بەپێچەوانەی ئەوەی من چاوەڕێم دەکرد، واتە: باوەڕم نەدەکرد وا بەئاسانی ڕازی بێ، ئەم خۆی پەلەی لێ دەکردم بۆ ئەوەی هەرچی زووترە نیەتەکەمان بخەینە بواری جێبەجێ کردنەوە، پێم گوت: ئافرەت! کارەکە لەوە قورسترە کە تۆ وێنای دەکەی، پێویستە ئەوە لەبەر چاوی خۆت دابنێی لەوانەیە تووشی ناخۆشی و نەبوونی ببین، وە ئەگەری ئەوە هەیە هەر خۆشی و بەخششێك کە ئێستا لەبەر دەستمانە لێی مەحروم بین و لەدەستی بدەین، لەبەر ئەوە بەوەندە وازت لێ ناهێنم هەر بڵێی ڕازیمەو با بڕۆین، بەڵکو دەبێ پەیمانم پێ بدەی و دڵنیام بکەیەوە کە ئارام دەگریت و تا کۆتایی لەگەڵمدا دەمێنیتەوە، هەروەها دەبێ پەیمانم پێ بدەیت کە لەسەر ناخۆشی و زەحمەتیەکان

---

میهرەبانە (بەتایبەت بۆ ئەو جۆرە کەسانە).

سەرزەنشـت و لۆمـەم ناكەيـت و پەشـيمان نابيتـەوە، پێـی گوتـم: خـوا ڕزق و ڕۆزی كافـرو فاسـيقان دەدات، ئايـا ڕزقـی ئێمـە نـادات؟ منيـش پێـم گـوت: لەوانەيـە خـوا بەهـەر شـتێك لەناخۆشـی و بـەڵا كـە بيـەوێ تاقيـمان بكاتـەوە، هيـچ گرەنتيـەك نيـە لەوەی كـە تـۆ دەيڵێی، لەبـەر ئەوە پێويسـتە لەسـەرمان خراپتريـن ئەگـەرەكان لەمێشـكی خۆمـان دابنێيـن، بەيەكـەوە پەيـمان و بەڵێنمانـدا لەسـەر كـۆچ كـردن بـەرەو شـام، واتـە: بـەرەو ديمەشـق[1]، بـەڕازی بـوون و بەرگەگرتنـی هەرشـتێك لـە چـاك و خـراپ كـە لـەو ڕێگايـەدا دێتـە پێشـمان}.

بـەڵام پرسـيارەكە ئەوەيـە بۆچـی بـەرەو شـام، بـۆ ناوچەيەكـی ديكـە نەبـێ بـۆ وێنـە: حيجـاز؟

پێـم شـك نايـە پێشـتر ئـەو پرسـيارەم لەباوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ كردبـێ، بـەڵام وادەزانـم دواتـر هۆكارەكەيـم بـۆ ڕوون بـۆوە، ئـەوەی مـن لـە باوكـم زانيبـێ ئەوەيە كـە (شـام)ی زۆر بەگـەورەو بەڕێـز دەگـرت، بـەزەوی پيـرۆزی دەزانـی، باوكـم فەرمـوودەی زۆری ئەزبـەر بـوون لەبـارەی فـەزڵ و گەورەيـی شـام، لەوانەيـە هەنـدێ لـەو فەرموودانـە بێهێزيـش بووبـن، بـەڵام بەدڵنياييـەوە فەرمـوودەی صەحيحيشـيان تێـدا بـوو، ڕەنگـە (صەحيح)تريانيـان ئـەو فەرموودەيەبـێ كـە ئەحمـەدو حاكـم ڕيوايەتيـان كـردووەو، حاكـم لـە (مسـتدرك)ی خۆيـدا بـە صەحيحـی دانـاوە، زەهەبيـش

---

(١) عەجەمـەكان كاتێـك دەڵێـن: شـام زۆربـەی كات مەبەسـتيان شـاری ديمەشـقە، وەك ئـەوەی ديمەشـق لـەلای ئـەوان كـڕۆك و كاكڵـەی ناوچـەی شـام بێـت، بۆيـە ئـەم وشـەيە تەنيـا بـۆ ئـەم مەبەسـتە بـەكار دێنـن.

دانـی پێـدا نـاوە، فەرمـوودەی ئەبـو دەرداـ لـە فـەزڵ و گەورەیـی دیمەشـق، بەتایبـەت غوتـەی دیمەشـق، بێژەکـەی بـەم جۆرەیـە: پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرموویەتــی: [یـوم الملحمـة الكـبرى فسـطاط المسـلمين بـأرض يقـال لهـا الغوطـة فيهـا مدينـة يقـال لهـا: دمشـق خـير منـازل المسـلمين يومئـذ]، واتــە: ڕۆژی داســتانە گەورەکــە کۆمەڵــی مســوڵمانان، یاخــود بارگــەو بنــەی مســوڵمانان، لــە زەویەکــە پێــی دەگوتــرێ غووتــە، شــارێکی لێیــە پێــی دەگوتــرێ: دیمەشــق، ئــەو ڕۆژە ئــەو شــوێنە باشــترین جێــگای مســوڵمانانە.

باوکـم ڕاو بۆچوونـی وابـوو چوون بـۆ ناوچەی حیجاز بەمەبەسـتی زیـارەت و عومـرە هێنانـەوە، باشـترو چاکـترە لـەوەی مەککـە یـان مەدینـە بکەیتـە شـوێنی نیشـتەجێ بـوون و تێدامانـەوە، لەبـەر ئـەوەی زۆر مانـەوە لـەم دوو شـوێنە وا لـە ئینسـان دەکات پاراسـتنی ئەدەب و حەیـاو حیشـمەت لەبیـر بـکات و دەقـی پێـوە بگـرێ.

دواتــر هەقیقەتــی پەیوەســت بــوون و خۆشویســتنی شــامم بــۆ دەرکـەوت لەلایـەن باوکمـەوە، بەتایبـەت بـۆ دیمەشـق، ئـەو ڕۆژەی کە زۆرێـك لـە زانایـان و گەنجانـی ئەو شـارە سـەردانیان کرد، لەسـەرەتای هەشــتاکان، لەســەرو بەنــدی فیتنــەی ئیخوانــەکان، یەکێکیــان بــە باوکمـی گـوت: پێـان گەیشـتووە ئێـوە بیرتـان لـەوە کردۆتـەوە کـۆچ بکـەن بـەرەو شـاری مەدینـەی منـەوەرە؟ ئەویـش وەڵامی دایـەوەو پێی گـوت: [پەیوەسـت بـوون و بەسـترانەوەی مـن بەشـام، وەك پەیوەسـت بوونــی بەردێکــی ڕۆچــووی نێــو چیایــە، کــە ناتوانــرێ بجوڵێــنرێ و لەشـوێنی خـۆی لابـرێ مەگـەر بەهەڵگرتـن هەڵبگیـرێ].

## ڕۆیشتن بەرەو لای پەروەردگار بەبێ زاد

ئەوەنــدەی مــن بیــرم بــێ باوكــم بێســتانێك و باخچەیەكــی بچووكــی هەبــوو، نازانــم چــی دیكــەی هەبــوو لەماڵــەوە یاخــود نــا، ئــەوەی گرنگــە باوكــم ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ ئــەوەی هەیبــوو بــەر لــە كــۆچ كردنــی هەمــووی بــۆ بــراكان و نزیكانــی جێهێشــت، دەستەكانی خــۆی خاڵــی كــرد، بەنهێنــی خــۆی بــۆ ڕۆیشــتن ئامــادە كــرد، ئەگــەر باشــم لەبیــر مابــێ و زاكیــرەم فێڵــی لــێ نەكردبــم هەمــوو ئــەوەی پێــی بــوو بریتــی بــوو لــە هەشــت لیــرەی زێــڕ.

لەســەر باوكــم پێویســت بــوو بەنهێنــی و لەتاریكــی شــەودا ئەندامانــی خێزانەكــەی لــە ڕوبــاری دیجلــە بپەڕێنێتــەوە بــەرەو سنووری توركیــا - ســوریا، چاودێــرە توركــەكان بــەردەوام لــە كەمین و چاودێــری كردنــی ئەوانــەدا بــوون كــە دەیانویســت سنوور ببــڕن، هەریەكێكیــش دەســت بەســەر بكرایــە بــەو هۆیــەوە ڕاســتەوخۆ بــەرەو پەتــی ســێدارە دەبــردرا، كارەكــە زۆر ترســناك و مەترســیدار بــوو، ئەگــەری ســەركەوتن تێیــدا زۆر لاواز بــوو.

خێزانەكــەی ئێمــە پێــك هاتبــوون لەدایــك و باوكێــك، لەگــەڵ كوڕە تاقانەكەیــان موحەممــەد ســەعیدو، خوشــكی گــەورە زەینــەب، لەگەڵ خوشــكی بچــووك ڕوقیــە، مــن ئــەو كاتــە بەگوێــرەی ئــەوەی باوكــم ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ دەیگــوت: تەمەنــم چــوار ســاڵان بــووە.

مـن ئێسـتا مەشـهەدێكی ئـەم كۆچـەم بەشێوەی تابلۆیەكـی كـۆن كـە تەمەنێكـی زۆری هەبـێ دێتـەوە یـادو لەزیهـن و مێشـكمدا مـاوە: چەنـد ئافرەتێـك لـە نزیـكان و خزمانمـان لەسـەر كەنـاری دیجلـە دانیشـتبوون، لەنێوانیانـدا ئافرەتێـك هەبـوو زۆر بەتونـدی دەگریـا، گریانەكـەی ئەوەنـدە تونـد بـوو خەریـك بـوو سـینگی لەگـەڵ شـەق ببـێ، دواتـر زانیـم كـە ئـەم ئافرەتـە پورم (سـینم) بـوو ڕەحمەتـی خوای لێبـێ، كاتـی خـوا حافیـزی كردنـی بـوو لـە خوشـكەكەی خـۆی، خواحافیـزی و دەسـت لێبەردانێـك كـە دووبـارە یەكـتر بینینـەوەی تێدا نەبـوو، لەبـەر ئـەوەی كـە خوشـكەكەی و منداڵـە بچووكەكانـی بـەرەو چارەنووسـێك دەڕۆن نازانـن ئاخـۆ ڕزگار دەبـن یـان مـردن.

هەروەهـا دێتـە یـادم كۆمەڵێـك پیـاو لەنزیـك كەنارەكـە كۆببوونـەوەو لەلایەكـەوە دانیشـتبوون پارچـە دارێكـی پانـی چـوار گۆشـەیان لابـوو، لـە چەنـد كاریتەیەكـی لەتەنیشـت یـەك ڕیـز كـراو پێـك هاتبـوو، ئـەو كاریتانەیـان بـە پەتێـك بەتەنیشـت یەكـەوە بەسـتابوو، وەكـو بەلـەم، بەسـەر ئاوەكـە كەوتبـوو، ئـەو جـۆرە بەلەمـە بەزمانـی كـوردی پێـی دەڵێـن: (گلـك) ئـەم (گلك)انـە لەنێـو ڕوبـاری دیجلـە هـەم خەڵكـی و هـەم كەل و پەلـی پـێ دەگوازرایەوە بـۆ مەسـافەیەكی دیـاری كـراو، بـەم شـێوەیە گەشـتەكەمان دەسـت پێكـرد لەسـەر پشـتی ئـەم (كلـك)ە، لەڕوبـاری دیجلـە پەڕینـەوە، لـە خـاوو خێـزان و نزیـكان و زێـدی خۆمـان دووركەتینـەوەو دابڕایـن، ئـەو كات و سـاتە وەك نەخشـێك لەبیرو هۆشـمدا كێـشراوەو هەرگیز بیـرم ناچێتـەوە، بـەڵام مـن ئێـش و ئـازاری ئـەو دابڕانـەم هەسـت پـێ نەدەكـرد لەبـەر بچووكیـم، دواتـر كـە گەورەبـووم هەسـتم بـە

سـەختی و دژواری ئـەو كات و سـاتە كـرد كـە چەنـدە شـتێكی قورسـە ئینسـان زێـدو نیشـتیمان و نزیكانـی بەیەكجـاری جێبێڵـێ.

زیـاد لـەوە شـتێكی ئەوتـۆم بیـر نەمـاوە لەبـارەی پەڕینەوەمـان لــە سـنوور، باوكیشــم شـتێكی ئەوتـۆی لـەو بـارەوە بـۆ بـاس نەكـردووم، دواتـر قۆناغـە مەترسـیدارەكەمان تێپەڕانـدو سـنووری وڵاتـی خۆمـان جێهێشـت و بەسـەلامەتی گەیشـتینە زەویەكانـی وڵاتـی سـوریا، سـەرەڕای زەحمەتـی ڕێگاكـەو مەترسیە زۆرەكانـی، بـەڵام ئـەوەی دەیزانـم ئەوەیـە گەورەتریـن پارێـزەر باوكـم پەنـای بۆ بـردو خـۆی و خێـزان و منداڵەكانـی پـێ پاراسـت بریتـی بـوو لـە: زۆر قورئـان خوێنـدن، وە زۆر زیكـرو یـاد كردنـی خـوا، بەدرێژایـی سـەفەرەكەمان هیـچ كاتێـك لـەم دووانـە بێئـاگا نەدەبـوو.

باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ دوای بڕینـی سـنوور ئێمـەی لەیەكـەم دێـی سـوریا دابەزانـد، ئەویـش دێـی (عەیـن دیـوار) بـوو، چەنـد ڕۆژێـك لـەو دێیـە ماینـەوە، موختـاری گوندەكـە خۆشـحاڵی خـۆی دەربـڕی بەهاتنـی باوكـم و ڕێزێكـی زۆری لێنا، زۆر سەرسـام بـوو بـەو چاونەترسـیەی باوكـم لەبڕینـی ئـەو ڕێـگا سـەخت و مەترسـیدارە، هەروەهـا زۆریـش سەرسـام بـوو بـەو ویسـت و ئامانجـەی كـە باوكـم لەپێناویـدا بڕیـاری جێهێشـتنی زێـدی خـۆی دابـوو، بەهەمـان شـێوە ئـەو ڕێـزەش كـە پۆلیسـە سـوریەكان لـە باوكمیـان گـرت كەمـتر نەبـوو لـە ڕێـزی موختـاری گوندەكـە، سـەرەڕای ئـەوەی هیـچ یەكێكیـان باوكمیـان نەدەناسـی و هیـچ شتێكیشـیان لەبارەیـەوە نەدەزانـی.

لەدایك بوونی هەموومان بەشێوەیەكی (فەرمی) لە تەسكەرە كەوتە ئەو دێیە، لەوێ وەك هاوڵاتی سوری ناومان تۆمار كرا، بەلەدایك بووی دێی (عەین دیوار) هەژمار كراین، باوكیشم هەموو ئەو وەسیقانەی تەسلیم كرد كە لەسەر ئەو بنچینەیە گەشتەكەمان ئەنجام دابوو بۆ وڵاتی سوریا، ئەو ڕۆژانەی كە لەوێدا ماینەوە بووینە میوانی پیاوێكی زۆر بەڕێزو ئەهلی عیلم، دواتر هەر ئەو پیاوە بوو بە موفتی شاری قامیشلی، ناوی: مەلا ئەحمەدی عەین دیواری بوو.

**ئەو فیتنەیەی كە خاوەنەكەی هەستی پێ ناكاو گرنگی پێ نادا:**

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ بۆی باس كردم لەناو ئەو پاسەی كە سەرنشینەكانی بەرەو دیمەشق دەبرد لەگەڵ پیاوێكی كورد یەكتر دەناسن، ئەو پیاوە پرسیار لەباوكم دەكات لەبارەی هۆكاری جێهێشتنی زێدو نیشتیمان و ماڵ و حاڵی، هۆكاری خۆ هاوێشتنە نێو ئەو سەفەرە دوورو درێژو تاقەت پڕوكێنە بەخۆو بەم منداڵە بچووكانە لەباوكم دەپرسێ؟ باوكم گوتی: {ئەو كاتە كە ئەو پیاوە قسەی لەگەڵ دەكردم دایكیشت گوێی لەقسەكانی بوو، تۆو دوو خوشكەكەشت كە ئەو كات بچووك بوون لەنێو پاسەكەدا دەتانناڵاند بەدەست برسێتی و نەخۆشی}.

باوكیشم بەكورتی وەڵامی پیاوەكە دەداتەوە.

بەڵام پیاوەكە قسەكانی خۆی نابڕێ و هەر بەردەوام دەبێ لەسەر قسە كردن، باوكم وریا دەكاتەوەو ئاگاداری دەكاتەوە

لـەوەی ژيـان لـە ديمەشـق وا ئاسـان نيـە وەك ئـەو تێيگەيشـتووە، بەباوكـم دەڵـێ: ئەگـەر كەسـێ لـەم شـارەدا خـاوەن بيرێكـی بازرگانـی ياخـود خـاوەن فيكرێكـی باشـی كاركـردن نەبـێ و مـاڵ و سـەروەتێكی نەبـێ خەيـاڵ پـڵاوە بيـر لـەوە بكاتـەوە بتوانـێ لـەم شـارەدا نيشـتەجێ بـێ، پاشـان بەباوكـم دەڵـێ: دوايـی تـۆ زمانـی عەرەبيـش نازانـی چـۆن دەتوانـی كارێـك بۆخـۆت بدۆزيتـەوەو مامەڵـە لەگـەڵ ئـەو خەڵكـەی ئـەوێ بكـەی[1]؟ كـێ هـاوكارت دەبێـت بـۆ دەسـتەبەركردنی بژێـوی ژيانـت؟ باوكـم بەپياوەكـە دەڵـێ: خـوا دەسـتبەردارم نابـێ، ديمەشـق شـارێكی گەورەيـە، كارو كاسـبی زۆری تێدايـە، كارێـك هـەر دەسـت دەكـەوێ بتوانـم بژێويەكـی پـێ پەيـدا بكـەم.

پياوەكـە وەڵامـی باوكـم دەداتـەوەو دەڵـێ: ڕاسـتە كاری زۆری تێدايـە، بـەڵام لەبەرامبـەردا كرێـكاری شارەزاشـی زۆر تێدايـە، تـۆ لەنێـو ئـەو هەمـوو كرێـكارە زۆرە ناتوانـی شـوێنی خـۆت بكەيتـەوە.

باوكـم بەكابـرا دەڵـێ: تەورێـك بەدەسـت دەگـرم و كاری بڕينـەوەی كۆڵكـەدار دەكـەم[2].

---

(١) باوكـم ئـەو كاتـە بەزمانـی عەرەبـی فوصحـە قسـەی دەكـرد، بەهەمـان ئـەو شـێوەيەی لـە كتێبـەكان فێـری بووبـو، وە دەرسـی لەسـەر دەگوتـەوە، خەڵكـی عەوامـی عەرەبيـش زۆر بەقوڕسـی لەزمانـی فوصحـە تێدەگـەن، لـەو بـارەوە باوكـم بەسـەرهات و ڕووداوی خۆشـی هەيـە.

(٢) لـەو سـەردەمەدا كۆڵكـەدار وەكـو سـوتەمەنی ئـەوڕۆ بـەكار دەهـات، خەڵكـی لـە ماڵەكانيـان هەڵيـان دەگـرت بـۆ ئـەوەی لـەوەرزی زسـتاندا بـەكاری بهێنـن.

پیاوەکـە وەڵامـی باوکـم دەداتـەوەو دەڵـێ: لەپشـت ئـەو کۆمەڵـە کەسـە کەبـاری کۆڵکـە دارەکانیـان لەسـەر پشـتی وشـترەکانیان دانـاوە بـۆ فرۆشـتن، بیسـت پیـاو دەبینـی کـە پێشـت کەوتـوون و پێشبڕکێت لەگـەڵ دەکـەن هەموویـان چارۆگـە پـڕ لـە کۆلکەکانیـان پـڕ کـردووە بـۆ ئـەوەی بیفرۆشـن و داهاتێـك بۆخۆیـان دەسـتەبەر بکـەن!...

باوکـم بـۆی گێڕامـەوەو گوتـی: {کاتـێ پیاوەکـە ئـەو قسـانەی دەکـرد دایکـت گوێـی لەقسـەکانی بـوو، قسـەکانی پیاوەکـە وای لەدایکـت کـرد تـرس دایبگـرێ و پەشـیمان بێتـەوە، ڕووی تێکـردم و تـکای لێکـردم کـە بگەڕێینـەوە، پێـی گوتـم: لەوانەیـە ڕەشـبینی و زەحمەتیـەك چاوەڕێـمان بـکات توانـاو هێـزی بەرگـە گرتنیـمان نەبـێ، منیـش پێـم گـوت: تـۆ پەیمانـت پێـدام لەبڕیارەکەمـان پاشـگەز نەبینـەوە هەرچەنـدە مەترسـی و زەحمەتیـەکان گەورەبـن، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی ئێمـە تـا ئێسـتا هیـچ شـتێکی وا زەحمەتمـان نەهاتۆتـە پێـش و بـەردەوام هەسـتمان بـە یارمەتـی و تەوفیقـی خوایـی کـردووە}.

وا دەردەکـەوێ باوکـم قسـەکانی ئـەو پیـاوە کـە وەك مامۆسـتاو چاوسـاغێك قسـەی لەگـەڵ باوکـم دەکـرد بەگەورەتریـن تاقیکردنـەوەی خوایـی دانابـێ لـە کـۆچ کردنەکـەی بـەرەو دیمەشـق، قسـەکانی ئـەو پیـاوە بـووە هـۆی ئـەوەی بۆچوونـی خێزانەکـەی پێچەوانـە بکاتـەوە، لـە کاتێکـدا پێشـتر بەهەمـوو شـتێکی کـۆچ کردنەکـە ڕازی بـوو، کەچـی دوای ئـەو قسـانە دەبێتە

بەرهەڵستیكارو ناڕەزایـی دەردەبڕێ، بەڕاددەیـەك كـە زۆر ئیلحـاح لەباوكـم دەكات بـۆ ئـەوەی بگەڕێنـەوە، لەبەرامبـەردا باوكـم بـەم جـۆرە سـەیری كارەكـەی دەكـرد كـە تاقیكردنەوەیەكـی خواییـە بـۆ كەشـف كردنـی ئەنـدازەی متمانـە بوونـی ئـەو بـە ڕەحـم و بەخشـش و بەزەیـی خـوا، متمانـە بوونیـش بەخـوا تەنیـا ئـەو كاتـە دەردەكەوێ كـە كۆسـپ و لەمپـەرو زەحمەتـی و تـرس بێتـە ڕێـگا.

دیـارە باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ دووبـارە هەقیقەتـی كارەكـەی بـۆ دایكـم ڕوون كردۆتـەوەو، ئـەوەی بەبیـر هێناوەتـەوە كـە خـوای پـەروەردگار گرەنتـی پاراسـتن و چاودێـری ئـەو كەسـانەی كـردووە كـە لەپێنـاو خـوادا هیجـرەت دەكـەن و زێـدو نیشـتیمانی خۆیـان جێدێڵـن، پـەروەردگار دەفەرمـووێ: ﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾ ﴾.

**نیشتەجێ بوون لە دیمەشق و هەوڵدان و ماندوو بوون لەپێناو بەدەست هێنانی ڕزق و ڕۆزی:**

شتێكی ئەوتۆم بیر ناكەوێتەوە لە گەشتی نێوان عەین دیوارو دیمەشق، بەڵام باوكم هەموو جار دەیگوت: {گەشتێكی تاقەت پڕوكێن بوو، سێ منداڵە بچووكەكەشم نەخۆشی دوای نەخۆشی ڕووی تێ دەكردن}، هیچ گومانیشی تێدا نیە دەبوو باوكم هەموو ئەو ناخۆشی و زەحمەتی و بەرپرسیارێتییانە لە ئەستۆ بگرێ.

ئەوەی گرنگ بوو بە سەلامەتی گەیشتینە دیمەشق، یەكەم شوێنی نیشتەجێ بوونیشمان یەك ژوور بوو لە خانووێكی چەند ژووریدا، خانووەكەش لەكۆتایی گەڕەكێك بوو بەناوی گەڕەكی كوردان (ئەكراد)، وابزانم ئەو خانووە تا ئێستاش وەك خۆی ماوە.

باوكم سەرەتا چەند شتێكی پێویستی وەك ڕایەخ و كەل و پەلی دیكەو پێویستیەكانی خواردن بۆ كڕین، كەمێ ناسیارەتی لەگەڵ خەڵكی گەڕەكەكەو ئەهلی عیلمی ئەو شوێنە بۆ پەیدا بوو بەڵام زۆر بە كەمی، كەمێكیش دڵنیایی و ئارامی بۆ درووست بوو سەبارەت بەو خەڵكەی كە لەگەڵ ئێمەدا لە خانووەكە دەژیان، پاشان دەستی كرد بە گەڕان بەدوای كارو كاسبیەك، هەرزوو ڕێگای كارو كاسبی كردنیشی بۆ ئاسان بوو بەرچاو ڕۆشنی پێ درا.

تاكە كارێكیش بۆ باوكم لەو كاتەدا كە لەوە باشتری پێ شك نەدەهات و لەوە زیاتریشی نەدەزانی بریتی بوو لە كڕینی

ئـەو كتێبانـەی کـە لەنێـو کـوردەکان زۆر بایەخـی پـێ دەدرێ وەك کتێبەکانـی: زانسـتی ئالـەو، زانسـتەکانی شـەریعەتی ئیسـلامی، پاشـان بردنـی کتێبـەکان بـۆ ناوچـە کوردیەکانـی جەزیـرە، لـە نێـو سـنووری سـوریا، بـۆ ئـەوەی لـەوێ کتێبـەکان بـە قازانجێکـی گونجـاو بفرۆشـێ، لـە ڕاسـتیدا خـاوەن کتێبخانەکانـی دیمەشـق شـارەزای ئـەوە نەبـوون کـە کـوردەکان لـە ناوچەکانـی خۆیـان بایـەخ بـە چ جـۆرە کتێبێـك دەدەن لەبوارەکانـی شـەریعەت، ئـەو کتێبانـەش کـە کـوردەکان گرنگیـان پێـدەدا لـەو کتێبانـە بـوون کـە گرنگیەکـی ئەوتۆیـان نەبـوو لای عەرەبـەکان، لەبـەر ئـەوە نرخەکانیـان هـەرزان بـوو.

باوکـم شـارەزای کتێبخانـە گـەورەکان بـوو ئـەو کتێبخانانـەی کـە گرنگـی بـە زانسـت و زانیاریـی ئیسـلامیی دەدەن، خاوەنـی کتێبخانەکانـی ناسـی، ئـەو کتێبخانـە گەورانـەش سـێ کتێبخانەبـوون، یەکێکیـان کتێبخانـەی خـوا لێـی خـۆش بـێ ئەحمـەد عەبیـد بـوو، وە کتێبخانـەی (القصیباتـی)، وە کتێبخانـەی شـێخ ئیسـماعیل صەببـاغ، ڕەحمەتـی خـوا لە هەموویـان بێ، هەمـوو ئـەو کتێبخانانـەش دەکەوتنە نێـو بـازاڕی حەمیدییـە، لەسـەر ڕێـگای مزگەوتـی ئەمـەوی، باوکـم هـەر لەجـاری یەکـەم کـە سـەردانی ئـەو کتێبخانانـەی کـرد شـارەزای زۆربـەی کتێبەکانیـان بـوو، پاشـان کۆمەڵێـك لـەو کتێبانـەی هەڵبـژارد کـە بەپێویسـتی دەزانیـن، وادەزانـم پـڕ بـە کیسـەیەك کتێبـی کـڕی.

باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبێ دەیگـوت: [کاتـێ بڕیـاری ئەوەمدا بچمـە ناوچـەی جەزیـرەو دەورو بـەری بـۆ مەبەسـتی فرۆشـتنی ئەو

کتێبانە، ڕاوێژم بە دایکت کرد لەبارەی کارەکەمەوە، بەڵام ئەو ترسی زۆری خۆی لەم کارەی من پێشاندا، ڕووی تێ کردم و گوتی: تۆ لەم شارە لەچەند لیرەیەك بترازێ هیچی ترت لە گیرفاندا نیە، ئایا دەتەوێ بەم سەرکێشییە ئەو کەمە پارەیەش لەدەست بدەیت؟ ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەمووان دەزانن تۆ لەکاری کڕین و فرۆشتندا شارەزا نیت؟ بەڵام من کارەکەم ئەنجامداو بەم بڕە پارە کەمە کتێبەکانم کڕین، دایکت پێی گوتم: ئەگەر ئەو کەمە پارەشت نەیەتەوە دەست چ لەمن و ئەو منداڵە بچووکانە دەکەیت؟ منیش هیچ قسەیەکم نەبوو پێی بڵێم تەنیا ئەوە نەبێ بیگێڕمەوە بۆ سیقەو متمانە بوون بەخوا، پێم گوت: خوا زایەمان ناکات لەکاتێکدا ئێمە لەپێناوی ئەودا زێدو نیشتیمانی خۆمان جێهێشتووە، بڕیاری دەرچوونمدا بۆ کارەکەم و نەفەقەو مەسرەفی ئەو چەند ڕۆژەشم پێداو جێم هێشت، بەمەبەستی فرۆشتنی کتێبەکان، وە پێم گوت: کە دراوسێکان ئاگادار دەکەمەوە لەڕۆیشتنم، گەشتەکەم ئەنجامداو کتێبەکانیشم لەگەڵ خۆم برد بۆ شاری جەزیرە).

دواتر زانیم، باوکم کە گەیشتبووە ناوچەی جەزیرە لەوێ بووە میوانی شێخ ئیبراهیم حەققی شێخی تەریقەتی نەقشبەندی لە جەزیرە، شێخی پایەداریش لە گوندی (حلوا)ی سەر بە شاری قامیشلی بوو، دوای ئەو میواندارییە نێوانی شێخ و باوکم زۆر خۆش بوو هاوڕێیەتی و خۆشەویستیەکی زۆر لەنێوانیان درووست بوو.

لەوێ زانایان و قوتابیان لە هەموو لایەکەوە ڕوودەکەنە باوکم و لەچەند ڕۆژێکدا هەموو کتێبەکان دەفرۆشێ، هەموو ئەو کتێبانەش کە باوکم بۆ ئەو ناوچە کوردیەی بردبووو لەعورفی ئەواندا لەکتێبە دەگمەنەکان بوون و گرانبەها بوون، لەبەر ئەوە زیاتر لەسێ هێندەی مایەکەی خۆی پێ بڕایەوە، دوای چەند ڕۆژێك گەڕایەوە دیمەشق لەهاتنەوەشیدا بەشێك لە پێویستیەکانی وەك کونجی و پەنیرو، خواردەمەنی لەوێ بۆ هێنایەوە.

لەدیمەشقیش کۆمەڵێك لەو پێویستیانەی کە لە جەزیرە دەستی نەکەوتبوو بۆ کڕیبوین و بۆی هێنایەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دایکم ئارام بێتەوەو موتمەئین بێ لەوەی خوای گەورە زایەمان ناکات و وێڵمان ناکات، دوای ئەمە باوکم ئەو کارەی کردە پیشەی خۆی، لەساڵێکدا گەشتێك یان دوو گەشتی بۆ ناوچە جیاجیاکانی جەزیرە دەکرد، لەدیمەشقەوە ئەو کتێبانەی لەگەڵ خۆی دەبردن کە لەوێ داواکاریان لەسەر بوو و ڕەواجیان هەبوو، لەوێشەوە بەو پارەیەی کە قازانجی دەکرد ئەو شتانەی دەکڕی کە دەیتوانی بیکڕێ وەك: کونجی و جۆرەها خۆراکی وەك نیسك و نۆك، لەو کارەشیدا خوای پەروەردگار هاوکاری بوو لەچوون و هاتنەوەیدا.

بەڵام گەشتەکەی لە ساڵێکدا تەنها دووجار بوو، کاتەکەی دیکەی هەموو بۆ زانست و دەرس و دەور دانابوو، خوای پەروەردگار کۆمەڵێ قوتابی بۆ باوکم ڕەخساندو لەوێ وانەی

پــێ دەگوتــن و چاودێــری دەکــردن، بەوێنــەی قوتابیانــی خــۆی لــە لادێکەمــان و لەپێــش هیجرەتمــان، بــۆ ئــەم ژیانــە تازەیــەی دیمەشـقیش بەسـەرهات و ڕووداوی جـۆراو جـۆر هـەن، بەیارمەتـی خـوا لەبەشـی داهاتـوودا دێینــە سـەر بـاس کردنـی.

## ژیانی نویێ لە دیمەشق

هەمــوو ئــەو زانیاریانــەی کــە هەبــوون لەســەر باوکــم لــەو ماوەیــەی کــە لەتورکیــادا ژیابــوو، لــەزاری خۆیــەوە وەرم گرتبــوو، بــە پێچەوانــەوە هەمــوو زانیاریەکانــی دواتــرو دوای نیشــتەجێ بوونــی لــە شــاری دیمەشــق خــۆم تێیانــدا ئامــادە بوومــەو حــاڵ و بارودۆخــەکان لەلایــەن خۆمــەوە بیــنراون، چونکــە دوای نیشــتەجێ بــوون لــە دیمەشــق تەمەنــم گەیشــتە ئــەو قۆناغــەی کــە توانــای وەرگرتــن و تێگەیشــتنم هەبــێ لــە ڕووداوەکان.

لــە شــاری دیمەشــق و لــە گەڕەکــی ئەکــراد، کــە تێیــدا نیشــتەجێ بوویــن، باوکــم ئاشــنای کۆمەڵێــك لــە زانایانی بــاش و دیار بــوو، ئەو زانایانــە لەنێــو خەڵــکا بــە زانســتی زۆرو ئەهلــی تەقــوا ناسرابــوون، ئەوەنــدەی بیــرم مابــێ: مــەلا عەبدولمەجیــدو، مــەلا عەلــی و، شــێخ موحەممــەد جــەزو، مــەلا ســەعیدو، مــەلا عەبدولجەلیــل و، مــەلا خالیــد، ئــەو یەکترناســینەی نێــوان باوکــم و ئــەوان لەچەنــد بۆنــەو یادێــك درووســت بــوو، وەك یەکــتر بینیــن لــە مزگــەوت، یــان بەیەکگەیشــتنی لەنــاکاو لەڕێــگادا، یاخــود لــە دوکانێکــدا، یاخــود لەبــاس و خواســی مەســەلەیەکی زانســتیدا، ئــەو شــتەی کــە هــەر لەســەرەتای گەیشــتنمان بــە دیمەشــق باوکــم زۆر جەختــی لەســەر دەکــردەوە ئەوەبــوو وەك کەســێکی ئاســایی دەرکــەوێ، لەمێشــکی باوکمــدا نەبــوو ســەرنجی ئــەوان بــۆ لای خــۆی ڕابکێشــێ بــەوەی کــە

ئەميــش يەكێكــە لــە زانــا ئاينيــەكان، بەتايبــەت هــەر دواى ئــەوەى كــە گەيشــتين بــەم شــارە باوكــم دەســتى كــرد بــە كڕيــن و فرۆشــتن و مامەڵــە كــردن لــە بــازاڕ.

هەمــوو شــتێك لــە ڕواڵەتــى باوكــم ئــەوەى پيشــان دەدا كــە كەســێكە وەك عامــەى خەڵكــى، بــێ ئــەوەى هيــچ پەيوەنديەكــى بــە ئەهلــى عيلــم هەبــێ و هيــچ ڕواڵــەت و مەزهەرێكيشــى وەك ئەهلــى عيلــم بەديــار نەدەخســت، ئەمــەش لەبــەر ئــەوەى لەيەكــەم ســاتى گەيشــتنمان بــە ديمەشــق واى پــێ بــاش بــوو جــل و بــەرگ و جوببــەو عەمامــەى زانايــان لەبــەر نــەكات، بــەڵام لەبــەر ئــەوەى شەرعناســان بەمەكروهــى دادەنێــن كەســێكى بــازرگان يــان خــاوەن پيشــە، يــان جوتيــار بەڕواڵــەت و پۆشــاكى زانايــان خــۆى ديــار بخــات، هــەروەك چــۆن مەكروهيشــە زانايــان بەبــەرگ و پۆشــاك و ڕواڵەتــى ئەوانــەى لەســەرەوە ناومــان هێنــان دەربكــەون.

ئــەو شــتەى ســەرنجى ئــەو زانايانــەى بــۆ لاى باوكــم ڕاكێشــابوو واى كردبــوو پێــى سەرســام بــن، ئــەو زانســتە وردو زانيارييــە فيقهيە فراوانــە بــوو كــە لــە باوكمــدا بەديــان كردبــوو، ئــەم بــەدى كردنــەش لەچەنــد بۆنەيەكــدا بەديــار كــەوت كــە پێويســت بــە باســكردن نــاكات.

كەواتــە: ئەمــە بــووە هــۆى ئــەوەى پەيوەنديەكــى هاوڕێيەتــى گــەرم و گــوڕ لەنێــوان باوكــم و ئــەو زانايانــە درووســت بــێ، زۆر بەخێرايــى باوكــم لەنێــو گەڕەكەكەمــان كــە گەڕەكــى (ئەكراد)يــان پــێ دەگــوت بــە فەقيهێكــى پلــە يەكــى شــافيعى نــاسرا، ســەرەتا

قوتابیانی دەورو بەری خۆی ڕوویان تێکرد، پاشان لەهەموو لایەکی دیمەشقەوە قوتابیانی زانستی شەرعی چ ئەوانەی لەناوەندە ئەکادیمیەکان دەیانخوێند، چ ئەوانەش لەلایەن زاناو مامۆستایانی تر دەیانخوێند ڕوویان لە باوکم کرد.

بەم شێوەیە ویستی خوا لەسەر ئەوەبوو کە باوکم بگەڕێتەوە هەمان ئەو بارودۆخەی کە پێشترو بەر لە کۆچ کردنمان بۆ دیمەشق تێیدا دەژیا، لە سەرقاڵ بوونی بە زانست و چاودێری کردنی قوتابیان و دەرس پێگوتنیان، وانەکانی تەفسیرو فیقە و ئوصوڵ و هەروەها زانستی ئالەی بەهەموو جۆرەکانیەوە دەگوتەوە.

بەڵام لەهەمان کاتدا وازی لە کارو کاسبیەکەشی نەهێنابوو، هەر کاتێك پێویستی بکردایە سەغڵەت و ناچار نەدەبوو، کەواتە: باوکم وەك دوو کەسایەتی بەدەردەکەوت یەکێکیان کەسایەتیە زانستیەکەی بوو، کەسێکی زاناو شەرعزان، کەسایەتی دووەمی وەك بازرگان و خاوەن پیشە دەردەکەوت.

بەڵام ئایا خەڵکی چۆن پێشوازیان لەم دوو کەسایەتیە دەکرد لە هەڵس و کەوتی باوکمدا؟

ئێمە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ژیانی زۆرێك لە زانایان ئەم دوولایەنە لە یەك کەسایەتیدا دەبینین، بەڵکو ئەمە یەکێکە لە پێویستیەکانی کامڵ بوون، کەسێ بیەوێ کامڵ بێ دەبێ بەم شێوەیە بێ، بەشی هەرە زۆری ئەو زانایانەی کە باسی ئاکاری

جـوان و زانسـتی فراوانیـان دەكـرێ و سـتایش دەكرێـن تەماشـا دەكـەی خاوەنـی پیشـەیەك بوونـە چ كشـتوكاڵ كـردن بووبـێ، چ كڕیـن و فرۆشـتن.

لەسـەردەمی ئێسـتاماندا عـورف و عـادەت گـۆڕاوە، ئێسـتا وای لێهاتـووە زانـا لـە چـاوی زۆرێـك لـە خەڵكـی بەزانـا هەژمـار ناكـرێ مەگـەر خـۆی بـە گەورەتـرو بەرزتـر بزانـێ لەكەسـابەت و كاركـردن، كاركـردن و كەسـابەت بـۆ زانایـان بـە نـزم بوونـەوە بـۆ ئاسـتی خەڵكـی بـازاڕو زەحمەتكێـش سـەیر دەكـرێ، وای لێهاتـووە ئەگـەر زانایـەك كارو كەسـابەت بـكات وەك بۆشـایی و درزێـك لـە زانسـتەكەی هەژمـاری دەكـەن، واتـە: پێیـان وایـە ئـەم كار كردنـە كـەم و كـوڕی و بۆشـاییە، جـا چ بۆشـاییەك؟ بـەڵام ئایـا زاسـت و زانیـاری وا لـە كەسـی زانـا دەكات ببـێ بـە فریشـتەو پێویسـتی بـە خـواردن و خواردنـەوە نەبـێ؟

بەڵـێ زانـا دەتوانـێ نەچێتـە نێـو كار كـردن و پیشـەوەری، بـەڵام ناتوانـێ دەسـت لـە پێویسـتیەكانی لـە خـواردن و خواردنـەوەو خێزانـداری و شـوێن و جێـگا هەڵبگـرێ، ئەگـەر وا بـكات یـان دەبـێ بـەو بەخشـینەی كـە دەوڵـەت پێـی دەدا بژیـێ، یـان دەبـێ چاوەڕێـی چاكـەو خێـری چاكـەكاران بـكات، باشـترین شـتیش بەپێـوەری شـەرع لەنێـوان ئـەم دووانـەدا ئەوەیـە: زاسـتەكەی نەكاتـە وەسـیلەو هـۆكاری پەیـدا كردنـی ڕزق و ڕۆزیـی، ئەمـەش تەنیـا بەپشـت بەسـتن بـە سـەرچاوەیەكی سـەربەخۆی (داهـات) دێتـە دی، وەك هـەر خەڵكێكـی دیكـە كـە بـە كاسـبی كـردن بژێـوی

خۆیـان دابیـن دەکـەن، ئەگـەر واشـی کـرد واتـە: بۆخـۆی دەستی کـردە ئەنجامدانــی کاسـبییەکی حـەڵاڵ، ئـەوا لــە سـەغڵەتی ڕووبـەڕو بوونـەوە لەگـەڵ ئـارەزوو ویسـتی خەڵکـی دەپارێـزرێ، ئـازاد دەبـێ لـەوەی لەپێنـاو بژێویەکەیـدا موراعاتـی ئـەوان بـکات، جـا ئـەو کەسـانە هـەر کێیـەك بـن و لەهـەر چیـن و توێـژو لایەنێـك بـن.

هـەر ئەمـەش وای لـە باوکـم کردبـوو کـە هـەردوو لایەنەکـە بەیەکـەوە کـۆ بکاتـەوە، هـەم دەسـت بـە زانسـت و زانیاریەکەیـەوە بگـرێ، هـەم بەچەنـد لیرەیەکـی کـەم و لـە کۆمەڵگایەکـی تـازەو غەریبـەدا کەسـابەتیش بـکات، کـۆ کردنـەوەی ئـەم دووانـەش (کەسـابەت و عیلـم) بەنسـبەت باوکـم شـتێکی نـوێ نەبـوو، ئـەو لەزێـدی ڕەسـەنی خۆشـیدا نیـوەی کاتەکانـی بـە دەرس و دەورو سەرپەرشـتی کـردن و چاودێـری کردنـی مزگـەوت و ئامـۆژگاری کردنـی خەڵکـی و بانگـەوازی کردنیـان بـۆ لای خـوا دەبـردە سـەر، نیوەکـەی تریشـی بـە کارکـردن لـە کێڵگـەو ئەنجامدانی هەمـوو ئەو کارە جـۆراو جۆرانـەی کـە جوتیـار ئەنجامیـان دەدا دەبـردە سـەر، یەکـێ لـەو وێنـە دەگمەنانـەی (پێـش هیجـرەت کردنمـان) کـە تـا ئێسـتاش لـە یادەوەریمـدا مـاوە ئـەو دیمەنـە جوانـە بوو کـە هەرگیز لەبیـری ناکـەم: دایکـم لەنێـو ڕەزو باغـدا دانیشـتبوو مەنجەڵێکـی گـەورە ئـاوی کـوڵاوی لەپێـش خـۆی دانابـوو، کۆمەڵێـك وشـوی ترێـی دەهێنـا لـە مەنجەڵـە ئـاوە کوڵاوەکـەی نقـوم دەکـرد، پاشـان لـە تەنیشـت خۆیـەوەو لەسـەر زەویەکـە پەرتـی دەکـرد، باوکیشـم زۆر مانـدوو بـوو بـە لێکردنـەوەی ئـەو وشـوە ترێیانـە لـە لێـواری

دار مێوەكان، وردە وردە لێی دەكردنەوەو دەیخستە نێو تەشتێكی زۆر گەورەو لەسەر شانی خۆی دەیهێنان و لەبەردەم دایكم دایدەنا، بۆ ئەوەی دایكم وشوە ترێكان دەربێنێ و بیخاتە نێو ئاوە كولاوەكەو پاشان لەتەنیشت خۆیەوە پەرتی بكات (ئەمە بۆ ئەوەبوو كە ترێكان وشك بكرێنەوەو بكرێنە مێووژ).

ئەو كات هیچ شتێكم لەبارەی ئەو كارەوە نەدەزانی، واتە: نەمدەزانی لەبەرچی وا دەكەن دواتر كە گەورە بووم زانیم كە ئەوان خەریكی وشك كردنەوەی ترێكان بوون بۆ ئەوەی بیانكەن بە مێوژ، لەكاتی كار كردنیشدا دەبوو منالە بچووكەكەیان لەنزیك خۆیانەوە دابنێن بۆ ئەوەی ئاگایان لێ نەبڕێ و چاودێری بكەن!

ئەمە ئەو حاڵەتە سرووشتیە بوو كە باوكم تێی گەیشتبوو، وە لەسەریشی ڕاهاتبوو لەبارەی بەیەكەوە گونجاندن و كۆكردنەوەی زانست و كەسابەت، پێی وابوو كە دەبێ هەڵس و كەوت و سلوكی پیاوی زانا بەم شێوەیە بێ، ئەم تێگەیشتنەشی لەگەڵ خۆیدا هێنایە شام، لەسەر هەمان ئەو شێوازە ڕۆیشت، ئەگەرچی لە شامدا سەرقاڵی جوتیاری و كشتوكاڵ كردن نەبوو، بەڵام نەیهێشت بەو پارە كەمەی كە لەلایەتی كاركردنی لەدەست بچێ.

هەروەها وێنەیەكی دیكە لە بیرو خەیاڵمدا ماوە كە دەلالەت لە هەمان شت دەكات، بەڵام ئەمەیان تایبەتە بە ژیانە تازەكەی لە دیمەشق، دوای ساڵێك یان زیاتر لە نیشتەجێ بوونمان لە

دیمەشق و لەژوورێکی ئەو خانووەی کە پێشتر باسم کرد لە گەڕەکی (ئەکراد-کوردان)، ماڵمان گواستەوە بۆ کۆڵانێکی دیکە بەناوی عەرەفات، بەرامبەر ئەو گۆڕەپانەی کە ئێستا پێی دەگوترێ: گۆڕەپانی (شەمدین).

بیرم دێ باوکم سەفەری کردبوو بۆ جەزیرە، بەمەبەستی بژێوی پەیدا کردن، ڕۆژێك پێیان گوتم: ئەمە باوکتە گەڕایەوە، بەپەلە ڕامکرد بۆ ئەو کۆڵانەی نێوان ماڵی خۆمان و گۆڕەپانەکە، ئەو کاتە هێشتا تەمەنم هەشت ساڵی تێپەڕ نەکردبوو، عارەبانەیەکم بینی ئاژەڵێك ڕایدەکێشا، لەلای ئێمە پێیان دەگوت: (تەنبەر) (مەبەستی کەرو عارەبانەیە)، تەنەکەی ڕوونی لە کەرو عارەبانەکە بار کردبوو، ڕێگاکە هەورازو بەردەڵان بوو، باوکم لەگەڵ خاوەنی عارەبانەکە لە پشتەوە خۆی خوار کردبۆوەو بەهەموو هێزی خۆی پاڵی بە عارەبانەکەوەدەنا.

زۆرێك لە خەڵکی مامۆستای ئاینی و کەسابەت کردنیان پێ باش نییە، بەڵام لەڕاستیدا ئەمە شێوازە ڕاست و درووستەکەیە، ئەمە ئەو حاڵەتەیە کە لە کۆتاییدا قیەم و مەبدەئـ دەیخوازێ.

باوکم بۆی گێڕامەوە کە ڕۆژێکیان یەکێ لە خاوەن پێگەو کەسایەتیە دیارەکانی گەڕەك پێی گوتم: لەو ڕۆژەوەی کە هاتیە ئەم شارە وا گومانمان برد تۆش یەکێك بی لەو پیاوە ئاینیانەی کە چاوەڕێی خێرو چاکەی چاکەکاران دەکەن، چونکە ئەمە پیشەی زۆرێکە لەوان، بەڵام بەڕاستی تۆ سەری ئێمەو هەموو ئەهلی (عیلم)یشت بەرز کردەوە، بەوەی کە هەرزوو ڕووت

کـردە کار کـردن و خـۆت بەگەورەتـر زانـی لـەوەی لەسـەر خێـرو سـەدەقەی خەڵکـی بژیـت.

ئـەوەی گرنگـە سـەرقاڵ بوونـی باوکـم بـە کەسـابەت و کارکردن، وە ئەنجامدانـی هەنـدێ هەڵسـوکەوت لـەو پێنـاوەدا کـە لـە بیـرو خەیاڵـی زۆرێـك لـە خەڵکـی لەگـەڵ ئەهلـی عیلـم ناگونجـێ، هەرگیـز پێگـەو مەکانەتـی باوکمـی وەك زانایەکـی بواری شـەریعەت کـەم نەکـردەوە لـە چـاوی خەڵکیـدا هەتـا لـە چـاوی ئەوانەشـدا کـە پێیـان وابـوو ئەنجامدانـی کەسـابەت و کاری دونیایـی لایـەق نیـە بـە زانایانـی ئاینـی.

یەکـتر بینیـن و چاوپێکەوتنـەکان لەنێـوان باوکم و زانایانـی گەڕەك ئەوانەی پێشـتر نـاوم هێنان بـەردەوام بوو، زۆربەی دانیشتنەکانیشـیان بریتـی بـوو لـە گفتوگـۆو قسـە کردنـی زانسـتی، هەنـدێ لـەو یەکـتر بینینانـە لـەدوای نوێـژی عیشـا دەسـتی پـێ دەکـرد، هەنـدێ جاریش دوای نوێـژی مەغریـب، زۆربـەی کاتیـش منـی دەکـردە هـاوەڵ و هاودەمـی خـۆی و لەگـەڵ خۆیـدا دەیـبردم بـۆ ئـەو دانیشـتنانە.

هێنـدەی نەبـرد باوکـم ناوودەنگـی دەرکـرد بـەوەی کـە زانـای یەکەمـە لەنێـو زانایانـی گـەڕەك لـە فیقهـی ئیـمام شـافیعی، لەبـن دەسـتی ئـەودا قوتابیانێکـی جـۆراو جـۆر لـە زانسـتی شـەرعی دەرسـیان دەخوێنـد، هەندێـك لەوانـە لە ناوچـەی جەزیـرەوە دەهاتن بـۆ زانسـت لـێ وەرگرتنـی، هەندێکیـش لـەو قوتابیانـە کـورد بـوون و خەڵکـی هەمـان گەڕەکـی خۆمـان بـوون، هەندێکیشـیان عـەرەب بـوون و لـە پەیمانـگا شـەرعیە جـۆراو جـۆرەکان قوتابـی بـوون.

هـەر لەسـەرەتای نیشـتەجێ بوونمـان لـە دیمەشـق تـا مـاوەی هەشـت سـاڵ باوكـم بـەم شـێوەیە مایـەوە، بـێ ئـەوەی پەیوەسـت بـێ بەهیـچ وەزیفەیەكـی ئاینـی وەك پێـش نوێـژ یاخـود وتاربێـژ، یاخـود مامۆسـتای ئاینـی لـە مزگەوتێـك.

نوێژەكانــی بەكۆمــەڵ ئەنجــام دەدا لــە مزگەوتێكــی بچووكــی خــوار گەڕەكــی كــوردان نزیــك ئــەو خانــووەی كــە پێشــتر لــە ژوورێكیـدا نیشـتەجێ بووبویـن، بـە نـاوی مزگەوتـی مـەلا قاسـم، دوای ئــەوەش كــە ماڵــمان گواســتەوە بــۆ ئــەو خانــووەی نزیــك گۆڕەپانــی شــەمدین نوێــژە بەكۆمەڵەكانــی لــە مزگەوتــی (ڕوكنــو دديــن) ئەنجــام دەدا، لەســەر ئــەو حاڵــەی مایــەوە بــۆ مــاوەی نزیكـەی حـەوت سـاڵ، هەمـوو سـاڵێكیش لەمانگـی ڕەمەزانـداو لە (١٠) دەی كۆتایـی ئیعتیكافـی دەكـرد تـا بەیانیەكـەی ڕۆژی جـەژن نەدەگەڕایـەوە، بـەڵام ئـەو چەنـد سـاڵە ڕۆژانـی هەینـی دەچوویـە مزگەوتـی حەنابیلـەو لـەوێ نوێـژی هەینـی ئەنجـام دەدا، بەهەمـان شـێوە هەمـوو زانایانـی گـەڕەك هـەر لـە هەمـان مزگـەوت نوێـژی هەینیـان ئەنجـام دەدا، بوونـی هەمووشـیان بەیەكـەوە كاریگەریەكـی زۆری دەكـردە سـەر دەرونـی خەڵكەكـە، لەوانەشـە هـەر لەبـەر ئەو هـۆكارە زۆربەیـان لـە ماڵەكانیانـەوە هەرچەنـدە دووریـش بوایـە ڕوویـان دەكـردە ئـەو مزگەوتـە بـۆ ڕۆژانـی هەینـی[1].

---

(١) هـۆكاری ئەمـەش وەك دواتـر تەئكیـدم لـە باوكـم و ئەوانـی دیكـەش كـردەوە ئەوەبـوو مزگەوتـی حەنابیلـە بـەر لـە دەیـان سـاڵ یەكـێ بوو لەو شـەش مزگەوتـەی كـە نوێـژی هەینیـان لـێ ئەنجـام دەدرا، هەرچـی مزگەوتەكانـی دیكە بـوون تەنیـا موصەڵـلا بـوون و نوێـژی هەینیـان لـێ ئەنجـام نـەدەدرا.

**لەكۆتاییدا... پەیوەست بوون بە مزگەوتی ڕیفاعی:**

لەســەروو ناوچــەی گۆڕەپانــی شــەمدین بــەلای ڕۆژئــاوا، بــەدووری نزیكــەی دووســەد مەتــر، گەڕەكێكــی میللــی هــەژار هەبــوو بەنــاوی (الحــارة الجدیــدة) زۆربــەی هــەرە زۆری خەڵكــی ئــەم گەڕەكــە لەپــاڵ هــەژاری و نەداریانــدا بەدەســت بەدڕەوشــتی و بــڵاو بوونــەوەی نەزانــی و لادان لــە ڕێگــەی ڕاســت دەیانناڵانــد، لەناوەڕاســتی گەڕەكەكــەدا گۆڕەپانێكــی بەردیــن هەبــوو خەڵكــی كردبوویانــە شــوێنی كۆكردنــەوەی زبــڵ و خاشــاك.

ڕۆژێكیــان دووكــەس لــە خەڵكی گــەڕەك كە لــەكاری بیناســازیدا كاریــان دەكــرد ئەوەیــان بــە خەیاڵــدا دێ كــە شــوێنەكە پــاك بكەنەوە لــە پیســی و زبــڵ و خاشــاك كــە ببــووە ســەرچاوەی نەخۆشــی و نەزیــەت بــۆ گەڕەكەكــە، یەكێكیــان پێشــنیاری ئــەوە دەكات كــە لەســەر ئــەو گردۆڵكــە بەردینــە مزگەوتێــك درووســت بكرێــت، ئەمــە هــەم كارێكــی باشــەو هــەم دەبێتــە پارێزەرێكــی باشــیش بــۆ ئــەوەی ناوچەكــە دووبــارە پیــس نەكرێتــەوە.

بۆچوونەكــە بــووە جێگــەی قەبــووڵ، خاوەنانــی بیرۆكەكــە بەشــوێن كەســێك دەگــەڕان پاڵپشــتی مــاددی بیرۆكەكەیــان بــكات، بیرۆكەكــە لەنــاو خەڵكیــدا بــڵاو بوویــەوە گەیشــتە یەكــێ لــە كەســە دەوڵەمەندەكانــی گەڕەكــی ئەكــڕاد كــە پێیــان دەگــوت: (ئەبــو ســولەیمان قەرەجولــی)، نــاوی خــۆی: موحیەددین بــوو، پیاوێكــی دینــدارو ئەهلــی تەقــوا بــوو، بەخــۆی چــووە شــوێنەكەو بــۆی دەركــەوت شــوێنەكە زۆر پێویســتی بــەوە هەیــە مزگەوتێكــی لــێ بینــا

بکرێ، بۆیە پرۆژەکەی تەبەننی کردو پارەی پێویستی بۆ تەرخان کرد، هەردوو کەسە خاوەن بیرۆکەکەش کە وەستای بینا کردن بوون هەڵسان بە کارەکەی خۆیان و هەوڵەکانی خۆیان خستە گەڕ بۆ بینا کردنی مزگەوتەکە.

ئەوەی بیرم بێ بەماوەیەکی کەم درووست کردنی مزگەوتەکە تەواو بوو، حەرەمی مزگەوتەکە بچووك بوو هەر جێگەی پەنجا نوێژ خوێنێك دەبوویەوە، لەپشتەوەیدا مەجالێکی کەم هەبوو ژوورێکیان بۆ بانگبێژ یاخود پێشنوێژ دروست کردبوو.

دوای تەواو بوونیشی ئەو کەسانەی دەستیان لە درووست کردنی مزگەوتەکە هەبوو بەشوێن پێشنوێژێکدا گەڕان بۆ ئەوەی پێشنوێژی بۆ نوێژخوێنانی مزگەوتەکە بکات، هەرزوو ئەو ئەبو سولەیمانەی کە پارەکەی بەخشیبوو بۆ دروست کردنی مزگەوتەکە پێشنیاری ئەوەی بۆ کردن کە شێخێکی زاناو بەڕێز هەیە ناوی مەلا ڕەمەزانە!

موحیەددین ئەبو سولەیمان باوکمی دەناسی، زۆر سەرسام بوو بە زانست و زوهدو بێ نیاز بوونی باوکم لە دونیا، هاتە لای باوکم و کارەکەی بۆ پێشنیار کرد، ئارەزووی زۆری خۆی پێشاندا لەسەر ئەوەی کە حەز دەکات باوکم ڕازی بێ، لەوانەشە حاڵی گەڕەکەکەشی بۆ باوکم باس کردبێ کە چەندە پێویستیان بە مزگەوتێکە بۆ ئەوەی ببێتە شوێنی کۆ کردنەوەی خەڵکەکە بۆ نوێژ کردن، هەروەها چەندە پێویستیان بەوە هەیە کە زانایەك هەبێ ئامۆژگاریان بکات و ڕێگای هەقیان پێشان بدات.

باوكـم بـۆ ماوەیـەك بیـری لـە پێشـنیارەكە كـردەوە، نوێـژی ئیسـتیخارەی ئەنجـام دا، سـەرەڕای ئـەوەش ڕاوێـژی بـە هەنـدێ لـە هـاوڕێ زاناكانـی خـۆی كـرد، پێـش هەموویـان شـێخ موحەممـەد جـەزو، كـە لـە هـاوڕێ تایبەتیەكانی باوكـم و خۆشەویسـترینیان بوو.

لـە ئەنجامـدا خـوای پـەروەردگار دڵـی باوكمـی بـۆ قەبـوڵ كردنـی پێشـنیارەكە كـردەوە، ئـەوكات ماڵەكەمـان لـە كۆلانـی عەرەفاتـەوە گواسـتەوە بـۆ خانوێكـی تـر كـە زۆر نزیـك بـوو لـە مزگەوتـە نوێیەكـە، بـەم شـێوەیە چووینـە ئـەو ناوچەیـە كـە پێـی دەگوتـرا: (الحـارة الجدیـدة)، ئـەو كات ناوچەیەكـی پـڕ لـە ئـاژاوەو مەترسـیدار بـوو، كۆمەڵێـك خەڵكـی جاهیـل و نەفـام لـەو گەڕەكەدا نیشـتەجێ بـوون، وە كۆمەڵێـك گەنجـی ئـەو گەڕەكـە كـە لـەو پـەڕی هێـزو توانایـان بـوون، كاری ڕێگریـان دەكـرد بـۆ ئـەم مەبەسـتەش دامێنـی چیـای (قاسـیۆن)یان كردبـووە مەڵبەنـدی كارەكەیـان، ئایـا لەتوانـای باوكمـدا هەیـە بتوانـێ ئـەم خەڵكـە ڕەوشـت خـراپ و شـەڕانگێزە لغـاو بـكات و ببێتـە مایـەی هیدایەتیـان؟

باوكـم وەك ئیمام و زۆربـەی كاتـەكان وەك بانگبێژیـش دەسـت بـەكار بـوو لـە مزگەوتەكـە، وە ئـەو كات موصەلـلای زۆر نەبـوون بـۆ ئەنجامدانـی پێنـج نوێـژە فەڕزەكـە، ئـەو دەوڵەمەنـدەی كـە مزگەوتەكـەی بـە پـارەی خـۆی درووسـت كـرد ڕەتـی كـردەوە (هیچ مووچەیـەك بـدات بـە پێشـنوێژو بانگبێـژ) تەنهـا كرێیـەك نەبـێ كـە پێدانـی چەنـد عەربـە گەنمێـك بـوو سـالانە لەكاتـی دروێنـە كردنـدا، ئەمـەش سـاڵی (١٩٤١) بـوو، لـەو ساڵانەشـدا خەڵكـی

گەنمیـان خـەزن دەكـردو دەشـاردەوە، وە پشـتیان بـە گەنـم دەبەسـتا بـۆ نـان و بـۆ زۆربـەی هـەرە زۆری خواردنەكانـی تریـان.

مزگەوتەكـە لـە زۆربـەی كاتەكانـی عـەسرو مەغریـب و عیشـاو بەیانیانیـش لـە (دە) نوێـژ خوێـن زیاتـر تێپـەڕی نەدەكـرد، بـەڵام زۆربـەی ڕۆژەكان بـۆ نوێـژی نیـوەڕۆ هیـچ كەسـێك نەدەهـات بـۆ نوێـژ كـردن لـە مزگـەوت، لـەو حاڵەتـەدا باوكـم بانگەكـەی دەدا بۆ ئـەوەی خەڵكـی گـەڕەك بزانـن كاتـی نوێـژ كردنـە، دوای بانـگ دانەكەشـی بەپەلـە بـەڕێ دەكـەوت بـۆ مزگەوتـی (روكنوددیـن) بـۆ ئـەوەی لـەوێ نوێـژە بەكۆمەڵەكـەی ئەنجـام بـدات.

بـەم شـێوەیە باوكـم نوێژەكانـی ئەنجـام دەدا، چەنـد وانەیەكیشـی ڕێكخسـت لەنـاو مزگەوتەكـە، وانەیەكیـان دوای نوێـژی بەیانـی بوو، ئـەوەی تریـان هەمـوو ڕۆژانـی هەینـی بـوو دوای نوێـژی عـەسر، مـن لـە زۆربـەی دەرسـەكان ئامـادە دەبـووم، تەماشـای ئامادەبووانـم دەكـرد ژمارەیـان زۆر كـەم بـوو، بـە پەنجەكانـی دەسـت دەژمێـردران لەنـاو مزگەوتەكـە پـەرت دەبـوون و لێـرەو لـەوێ پشـتی خۆیـان بـە دیوارەكانـدا دەدا، زۆبەیـان خـەو دەیبردنـەوەو باوێشـیان دەدا.

وەرگرتنـی ئیمامەتـی مزگـەوت بـوە ڕێگـر لەبـەردەم باوكـم لەوەی بچێتـە جەزیـرە بـۆ كاری كڕیـن و فرۆشـتن، لەبـری ئەمـە ڕووی كـردە گـەڕان بەشـوێن ئـەو نامیلكـە بچووكانـەی كـە ڕەواجـی هەیـە لـەلای كـوردەكان و داوای دەكـەن، ئـەو نامیلكانـەی كـە تایبەتـە بەزمـان و مێـژووی ئـەوان، یاخـود بابەتەكانـی بریتیـن لـە ئادابـە گشـتییە ئیسـلامیەكان، هەروەهـا ئـەو كتێـب و نامیلكانـەی كـە

پێشتر چاپ نەکراون، وەك ئەو نامیلكانەی لەنێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕیان پێ دەکردو ئەزبەریان دەکرد، هەڵسا بە چاپ کردنیان لەسەر ئەستۆی خۆی، پاشان لەڕێگەی بەرید بووایە یاخود لەڕێگەی چەند کەسێکەوە بوایە نامیلکەکانی دەناردن، یەکێ لەو کتێبانەی کە چاپی کردو بڵاوی کردەوە، ڕەواجێکی باشی لەلایەن کوردەکانەوە پەیدا کرد کتێبێکی بچووك بوو بەناوی (نهج الأنام)، کە بەزمانی کوردی نوسرابوو، کتێبەکە هەندێ لە بڕگەکانی عەقیدەی ئیسلامی تێدا بوو کە پێویستە هەموو مسوڵمانێك بیانزانێ، هەروەها هەندێ ئاداب و بنچینەی بابەتە ئەخلاقیەکانی لەخۆ گرتبوو، یەکێکی دیکە لەو کتێبانە کتێبی (نەوبەهار) بوو واتە: بەهاری نوێ، وا دەزانم ئەمیش پێشتر چاپ نەکرابوو فەرهەنگێکی بچووکی عەرەبی - کوردی شاعیرو ئەدیبی گەورە ئەحمەدی خانیی بوو، خاوەنی چیرۆکی (مەم و زین)[1]، ئەو کتێبانە بایەخێکی زۆری هەبوو لەلایەن ئەو کوردانەی کە لە سوریا دادەنیشتن و، ئەو کوردانەی تریش کە لەسەر سنووری تورکیا نیشتەجێ بووبون، ئەم کارەی باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ بای ئەوەندە هەبوو کە بێنیازی بکات لە سەفەر کردن بە مەبەستی کەسابەت و بژێوی پەیدا کردن، یارمەتی دەریش بوو بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتیە نوێیەکەی کە (ئیمامەتی و وانە گوتنەوە بوو) بەجوانترین شێوە بەڕێوە ببا.

---

(١) ئەم بەسەرهاتە چیرۆکێکی سۆزدارییە، تین و تاوو گەرمیەکی سۆفیانەی تێدا بەدی دەکرێ، من لەسەر داواکاری و ئاماژەی باوکم وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

**لادان و .... ڕێگای چاكسازی:**

قوڕسی و زەحمەتی كارەكەی باوكم بەتەنیا بەڕێوە بردنی مزگەوت نەبوو، بەڵكو بریتی بوو لە شتێكی تر، ئەویش نەفامی و نەزانی و كەمعەقڵی زۆربەی هەرە زۆری خەڵكی گەڕەكەكە بوو، بەتەنیا ئەوەندە بەس نەبوو باوكم ئارام بگرێ لەسەر ئەو واقیعەی لەگەڕەكەكەدا هەبوو، بەڵكو خۆی بە بەرپرسیار دەزانی بەرامبەر ڕێنمایی كردنیان و چاكسازی تێدا كردنیان.

ئەگەر زاناو بانگخواز وابزانێ یارمەتی دەری بۆ ئەم ڕێگایە كە ڕێگای ئیصلاح و چاكسازییە بریتییە لە: زمان پاراوی و خۆش ڕەفتاری و ئارامگرتن و دڵفراوانی، ئەوا لەوانەیە زۆربەی كات بكەوێتە ڕەشبینی و بێ ئومێد بوون.

باوكم سەرەڕای پشت بەستنی بەزانستی زۆر و زمانە عەرەبیە پاراوەكەی و ئارامی و دڵفراوانییەكەی، پشتی بە زۆرێك لەوانەش دەبەست كە دەسەلات و حوكمیان بەدەست بوو، كەچی هەموو ئەمانە هیچ بەرهەم و بەروبومێكی نەبوو لەسەر هیدایەت و چاكسازی كردنی هەندێ لەو نەفام و كەم عەقڵانەی گەڕەك كە پێشتر باسم كرد.

بەڵام دوای گرتنە بەری ئەو هۆكارانەی سەرەوە، ئەوەی زۆر بەهانایەوە هات و یارمەتیدا بۆ ئەم كارەی، جێگای هەموو ئەو هۆكارانەی پێشێشی بۆ پڕكردەوە بریتیی بوو لە: هاناو هاوار بردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا، زۆر ملكەچی و پاڕاناوەو خۆ زەلیل كردن لەبەر دەستی خوای گەورە، بەتایبەت لە تاریكایی

شـەوو، کاتەکانـی سـەحەر، خۆزگـە بانگخـوازان بەهـاو نرخـی ئـەو چەکـە سەرسـوڕهێنەرەیان دەزانـی بـۆ ئیصـڵاح کـردن و ڕاسـت کردنـەوەی ئـەو خەڵکانـەی کـە ڕاسـتە شـەقامی خوایـان بـەرداوەو بەخـوارو خێچـی ڕێ دەکـەن.

بەیـەك نموونـە ئـەوە ڕوون دەکەمـەوە کـە باسـم کـرد... ئـەو نموونەیـەی کـە باوکـم وەك فـەزڵ و بەخششـێکی خوایـی بەسـەریەوە، هەروەهـا وەك ڕێبـازو مەنهەجێـك کـە پێویسـتە زانایـان و بانگخـوازان ئـاگاداری بـن، لـەزۆر یـادو بۆنـەدا باسـی کـردوەو دووبـارەی کردۆتـەوە.

باوکـم دەیگـوت: {یەکـێ لـە دراوسـێکانی گـەڕەك کـە لەتەنیشـتمەوە بـوو، هەموو جـۆرە گوناهێکـی گەورەی ئەنجـام دەدا، شـەڕاب خـۆر، زمـان پیـس، کاری فاحیشەشـی دەکـرد، لەهەمـووی خراپـتر ئەوەبـوو ئافرەتێکـی بەدبەخـت و سـەرگەردانی هێنابوویـە ماڵەکـەی خـۆی، پێشـوازی لـە کەسـانی خـراپ و بەدڕەوشـت دەکـرد بـۆ ئـەوەی بچنـە لای ئافرەتەکـەو کاری خراپـی لەگەڵـدا بکـەن، هیـچ شـەوێك نەبـوو لەماڵـی ئـەو دراوسـێیەماندا دەنگـی گۆرانـی و هـات و هـاوارو مۆسـیقاو گاڵتـەو گـەپ بـەرز نەبێتـەوە، ڕۆژێکیـان لەبـارەی ئـەو پیـاوە لەگـەڵ نوێـژ خوێنانـی گـەڕەك قسـەم کـرد، ئامـۆژگاری ئـەو کەسانەشـم کـرد کـە لێیـەوە نزیـك بـوون و دەسـەڵاتێکیان بەسـەریەوە هەبـوو بـۆ ئـەوەی ئـاگاداری بکەنـەوە، دوای ئـەوەی ئـەو بەرپرسانەشـم لـێ ئـاگادار کـردەوە کـە کاریـان بریتیـی بـوو لـە نەهێشـتنی کاری بـەد ڕەوشـتی، بـەڵام هـەوڵ و تێکۆشـانەکان هیـچ ئەنجامێکـی ئەوتۆیـان لـێ نەکەوتـەوە،

سـەرەڕای ئـەوە پیاوەکـە بـۆی گەڕایـەوە کـە مـن دەمـەوێ بەهـەر جۆرێـك بـێ ڕێگـری لـێ بکـەم لـەو کارەی، ئەمـەش وای کـرد هەڕەشـەی کوشـتنم لـێ بـکات، خۆیشـی پیاوێکـی شـەڕانگێزو سـەر بەکێشـە بـوو، لـە یەکـێ لـە شـەوەکان بـەر لـە نوێـژی بەیانـی لـە ماڵەکـەی خۆیـدا بەسـەر خۆشـی هاتـە دەرەوەو بـە بـەردی گـەورەو بەهەمـوو هێـزو توانایەکیـەوە لـە دەرگای ماڵـی ئێمـەی دا، لەگـەڵ لەدەرکـە دانەکەشـی هەرچـی جوێنـی پیسـە پێـی ئەدایـن، هـەر لەهەمـان ڕۆژ یاخـود ڕۆژێـك دوای ئـەوە لەکاتـی ئەنجامدانـی نوێـژی بەیانـی کاتـێ کـە خەڵکەکـە ڕیزیـان بەسـتبوو لەنـاو نوێژدابوویـن پەنجەرەکانـی مزگەوتـی دایـە بـەر بـەردان و بـەردی گـەورە گـەورەی بـە پەنجەرەکانـی مزگەوتەکـەدا کێشـا.

دوای ئـەوەی تـەواو بێئومێـد بـووم لەهەمـوو ئـەو ڕێگایانـەی پێشـتر گرتبوومـە بـەر بـۆ هیدایەتـدان و ئیصـڵاح کردنـی، بـەو پـەڕی ملکەچـی و زەلیلـی و پاڕانـەوە ڕووم کـردە خوای پـەروەردگار هیدایەتـی بـدات و ئیصڵاحـی بـکات، ئـەم کارەشـم کـردە پیشـەی سـەحەرو هەمـوو بەرەبەیانێـك بـەو پـەڕی ملکەچـی و پێداگیریـەوە لـە سـوجدەدا لەخـوای پـەروەردگار دەپاڕامـەوە، موناجـات و ڕازو نیـازم لەگـەڵ خـوادا دەکـرد لەبـارەی ئـەو پیـاوەو داوام دەکـرد کـە ڕێنمایـی بـکات.

چەنـد ڕۆژێکـی نەبـرد ئافرەتەکـە لەماڵەکـەدا نەمـاو ڕۆیشـت بـەلای کاری خۆیـەوەو، چەنـد ڕۆژێکـی کەمیـش دوای ڕۆشـتنی ئافرەتەکـە، پیاوەکـە دەسـتی هەڵگـرت لـە شـەڕاب خواردنـەوە،

دواتـر سـەيرم كـرد بينيـم وا ئـەو پيـاوە لـە مزگەوتـە! بـەو پـەڕى دڵ شـكاوى و زەليليـەوە ڕوى تێكـردم و پـڕى دايـە دەسـتەكانم بـۆ ئـەوەى ماچيـان بـكات! سـوپاس بـۆ خـوا ئـەو پيـاوە بەشـێوەيەكى تـەواو ئيصـڵاح بـوو}.

قـەدەرى خـوا وابـوو باوكم لـەو سـاڵەدا كە ئـەو پيـاوە هيدايەتى وەرگـرت بـۆ جـارى دووەم سـەفەرى ماڵـى خـوا بـكات بەمەبەسـتى بەجێگەياندنـى فەريـزەى حـەج، بـە يـاوەرى و داوەتـى (حەسـەن ئەلبەحـرى) ڕەحمەتـى خـواى لێبێ، كە ئـەو كات ناسـيبووى، باوكم بـەر لـە ڕۆيشـتنى ئامـۆژگارى هەموومانى كـرد لەكاتـى گەڕانەوەيدا هيـچ جوانـكارى و پێشـوازيەكى تايبەتـى بـۆ ڕێـك نەخـرێ، ئـەو كات وا بـاو بـوو خەڵكـى خانـوو كـۆڵان و بـەردەرگاو هەيوانەكانيان دەڕازانـدەوە كاتـێ نزيكێكيـان دەگەڕايەوە لەسـەفەرى حـەج، دواى ئـەوەى خەڵكـى گـەڕەك بيسـتيان گەڕانـەوەى باوكـم نزيـك بۆتـەوە ئـەو دراوسـێ تەوبەكارەمـان سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەى هەيـوان و بەردەرگاكـە بڕازێنێتـەوە بـۆ پێشـوازى باوكـم، ئێمـەش پێـمان ڕاگەيانـد كـە باوكـم وەسـيەتى كـردووە ئـەو كارەى بـۆ نەكـرێ و بـە ئەنجامدانـى ئـەو كارە تـوڕە دەبـێ، بـەڵام ئـەو گوێـى بە ئامـۆژگارى كـەس نـەدا، پێشـتريش لەو كەسـانە بـوو كـە سـەركێش و نكوڵيكار بـوو لەنێـو هاوەڵانيـدا، ئـەو كاتـە هێشـتا سـەرەتاى تەوبـە كـردن و گەڕانەوەشـى بـوو بـۆ لاى خـوا.

ئـەو پيـاوە هەڵسـا بـە ڕازاندنـەوەى هەيـوان و بـەردەرگاى مـاڵ، بـە دارو درەخـت و گـەڵا، تەنيشـتەكانى هەيوانەكەشـى بـە

فەرش و ڕایەخ ڕازاندەوە، ئەو فەرش و ڕایەخانەشی لەماڵی خۆی و هاوڕێکانی هێنابوو، بەدیوارەکانی تەنیشت هەیوانەکەی هەڵواسین، پاشان ڕایەخێکی لەبەر دەرگای ماڵەوە ڕاخست بۆ پێشوازی باوکم، شەوو ڕۆژ شوێنەکەی جێ نەدەهێشت و بەردەوام بەدەوریەوە بوو، کاتێ باوکم گەیشت، ئەو پیاوە لە پێشەوەی ئەوانە بوو کە پێشوازیان لێ کرد، ئێمەش دەستپێشخەریمان کردو ئاگادارمان کردەوە هیچ یەکێك لەو کارانە ئێمە ئەنجاممان نەداوە، نەشمانتوانیوە ڕێ لە ئەنجام دانی بگرین، باوکم وەستاو لەخوا پاڕایەوەو ستایشی خوای پەروەردگاری کرد، لەوانەیە ئەو شێوە پێشوازی و ڕازاندنەوە دەگمەن و جوانە وەك داوای لێبوردنێکی ناڕاستەوخۆ بووبێ لەلایەن ئەو پیاوەوە، لەپای ئەو ئەزیەت و ناڕەحەتیانەی بەسەر باوکمیدا هێنا، کاتێ لەنیوە شەودا دەرگای ماڵەکەی ئێمەی دایە بەر بەردان و جوێنی زۆری بەباوکمدا.

پاشان ئەو گەڕەکە وردە وردە دەبوژایەوەو دەگەشایەوە بە ئیستیقامەو پارێزکاری و تەقوا، نوێژخوێنان کەم کەمە ژمارەیان زیادی کرد، تاوای لێهات لە ماوەیەکی کەمدا جێگایان نەدەبۆوە لە مزگەوت، دوای ماوەیەك خەڵکی گەڕەك هەڵسان بە فراوان کردنی مزگەوتەکە بەشێوەیەك هێندەی ڕووبەری خۆی فراوانیان کرد، خوای پەروەردگاریش ویستی وابوو دوای ئەوە خەڵکێکی زۆرتر ڕوویان لە مزگەوتەکە کرد، خەڵکێك لە گەڕەکە دوورەکانەوە دەهاتن بۆ نوێژ کردن و وانە خوێندن لە مزگەوتەکەی باوکم، ئەمەش وای کرد پێویست بەوە بکات

جارێكی تریش فراوان بكرێت، پاشان ناوی نرا مزگەوتی ڕیفاعی، زۆربەی كاتیش پێیان دەگوت: مزگەوتی مەلا ڕەمەزان، لەشارەكە دەنگی دایەوە، وای لێهات خەڵكی بە كۆمەڵ ڕوویان تێدەكرد بەتایبەت ڕۆژانی هەینی و جەژنەكان، ئەمەش وای كرد بۆ جاری سێیەم پێویست بەوە بكات فراوان بكرێت، بەڵام دەرفەتی ئەوە نەمابوو بەشێوەیەكی ئاسۆیی فراوان بكرێ، بۆیە بەناچاری قاتی دیكەیان لەسەرەوە بۆ مزگەوتەكە زیاد كرد، واتە: بەشێوازێكی ستوونی فراوانیان كرد.

ئەوەی شارەزای ئەو گەڕەكە بێ و حاڵ و بارودۆخی گەڕەكی (الحارة الجديدة) بزانێ بەر لە چل ساڵ، كە چۆن چاكسازی و حاڵەتە دیندارییەكە تێیدا گەشەی كرد، زۆر بەجوانی لەمانای ئەوە دەگات چۆن خوای پەروەردگار ئێسكی ڕزیو زیندوو دەكاتەوە لەكاتێكدا بۆتە خۆڵ و وردو خاش بووە، هەروەها لە بەهاو نرخی ئەو ئارام گری و كار لەسەرخۆ كردنە دەگات، لەبەرامبەر سەختی و دژواریەكانی بانگەوازی بۆلای خواو دڕك و داڵ و بەربەستەكانی ئەو ڕێگا دوورو درێژە.

كێشەو موعاناتی زۆر هەیە باسی بكەم و باشم لەبیر ماوە، كە چۆن باوكم بەسەریاندا زاڵ بوو، بەو پەڕی دڵنیا بوون لە وەرگرتنی پاداشتی خوایی و ئومێدەوار بوون لە هیدایەت درانی خەڵك، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هیدایەت درانەكە بەزۆر زیاترو چاوەڕواننەكراوتر لەوەی كە باوكم ئومێدەواری بوو ڕوویدا، ڕێگای هاناو هاوار بردن بۆ خواو گەڕانەوەو ڕازو

نیـاز كـردن لەگەڵیـدا تاكـە ڕێـگای كراوەیـە بـۆ هەمـوو ئەوانـەی ڕاسـتگۆیانە ئـارەزووی هیدایـەت درانـی خەڵـك دەكـەن و خەڵكـی بـۆ لای خـوا بانـگ دەكـەن.

**یارمەتی دان و تەوفیق لەخواوەیە ، نەك ئازایەتی و زیرەكی بەندە:**

باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ كاتـێ باسـی كۆمـەك و یارمەتـی خـوای پـەروەردگارو ژیانـی غەریبـی خـۆی دەكـرد لـە دیمەشـق زۆر ئـەم ڕسـتەیەی سـەرەوە یـان نزیـك لـەم ڕسـتەیەی دووبـارە دەكـردەوە.

بـەردەوام دەیگـوت: {مـن ئـەو زیرەكـە نەبـووم كە پشـت بەخۆی دەبەسـتێ لـە ڕۆژە سـەختەكان و مەترسـیدارەكان، بەڵكـو مـن زیاتـر لـە دەروێشـی و سـادەییەوە نزیـك بـووم لـە هەمـوو كارو بارێـكا، ئـەو كاتـەش كـە خەڵكـی ناوچەكـەی خـۆم لـە جەزیـرەی بۆتـان ئەوانـەی منیـان دەناسـی قسـەیان بـۆ گەڕابوویـەوە مـەلا ڕەمـەزان توانیویەتـی لـە شـام كارەكانـی خـۆی ڕایـی بـكات و ئێسـتا بـە ئاسـودەیی و بـێ كێشـە لـەو وڵاتـەدا جێگیـر بـووە، زۆر سـەیریان پێهاتبـوو تووشـی سەرسـوڕمان بووبـون! هێنـدەی نەمابـوو كـە باوەڕ نەكـەن، ئەمـە وای لـە زۆربەیـان كردبـوو ئەوانیـش ئـەو شتە تاقـی بكەنـەوەو بێـن بـۆ وڵاتـی شـام، بـەو بیـرو هـۆش و خەیاڵـەی كـە ئـەوان توانایـان زۆر زیاتـرە لەمـن لـە بونیاتنانـی ژیانێكـی خـۆش و شایسـتە لـە شـاری دیمەشـق، چونكـە ئـەوان لەلایـەك پارەیـان زۆر بـوو، لەلایەكـی دیكـە شـارەزاییان زیاتـر بـوو لەمـن}.

باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ دەیگـوت: {ئـەوان ئەوەیـان نەدەزانـی کـە: سـەرچاوەی جێگیـر بوونـی ژیانـی مـن لـەو شـارە نـە زیرەکیـی بـو، نـە شـارەزایی، بەڵکـو بریتیـی بـوو لـە چاودێـری و ڕەحـم و بەزەیـی خـوا، کـە بـەردەوام لەگەڵمـدا بـوو بـۆ هـەر کوێیـەك بچوومایـە، چوومـە بـازاڕ بـێ ئـەوەی هیـچ شـتێك لـە کاروبـاری بـازاڕ بزانـم، کـەل و پـەلم دەکـڕی و دەمفرۆشـتەوە بـێ ئـەوەی هیـچ زانسـت و زانیاریەکـم لەسـەر بازرگانـی و کڕیـن و فرۆشـتن هەبـێ، بـێ ئـەوەی هیـچ شـارەزاییەکم لـە سرووشـت و هەڵـس و کەوتـی خەڵکـی هەبـێ لەبـواری کڕیـن و فرۆشـتن، بـێ ئـەوەی شـارەزاییم لـە فێـڵ و تەڵەکـە جـۆر بەجۆرەکانـی کڕیـن و فرۆشـتن هەبـێ، چەندیـن جـار پێیەکانـم هەڵخلیسـکان لەکاسـبی کـردن تـا ئاسـتی موفلیـس بـوون و تێکشـکان، پاشـان هیـچ شـتێك منـی ڕزگار نەدەکـرد جگـە لـە چاودێـری و پاراسـتنی ڕاسـتەوخۆی خوایـی}.

زۆر جـار لـەو بـارەوە ئـەو نموونـە سەرسـوڕهێنەرەی بـۆ بـاس دەکردیـن دەیگـوت: {ڕۆژێکیـان دەمـەو ئێوارەیەکـی زسـتان لـە کەش و هەوایەکـی تاریـك، لـە قەرەباڵغـی نێـو بـازاڕدا لەپشـت مزگەوتـی (السنانیة) بـووم، پـڕ بـوو لـە خەڵـك، دەمویسـت هەنـدێ لـەو جـۆرە پۆشـاکانە بکـڕم کـە لەسـەر کـراس لەبـەر دەکرێـن، بـۆ ئـەوەی دواتر لـە ناوچـەی جەزیـرە بیفرۆشـمەوە، چونکـە ئـەم جـۆرە پۆشـاکانە لەنێـو کـورددا پەسـند بـوون، ئەنـدازەی پێویسـتم لـەو جـۆرە پۆشـاکە دەسـت کـەوت، هەنـدێ دراوم لـە گیرفانـدا بـوو، هەندێکیـان فڕەنـك بـوون، فڕەنکـەکان زۆر نوێ بـوون لەبـەر نوێتیەکەیان دەبریسـکانەوە،

لەهەمـان ئـەو گیرفانەمـدا هەنـدێ لیـرەی زێڕیشـم هەڵگرتبـوو، لیـرە زێڕەكانـم لەنێـو كاغەزێكـی لـوول دراودا هەڵگرتبـوو بـۆ ئـەوەی جیایـان بكەمـەوە لـە فڕەنكـەكان و لەگـەڵ یەكتریـدا تێكـەڵ نەبـن، دیاربـوو لیـرە زێـڕەكان لەنێـو كاغـەزە لـوول دراوەكـەدا كەوتبـوون و لەگـەڵ فڕەنكەكانـدا تێكـەڵ بووبـون بـێ ئـەوەی بزانـم، منیـش بەحیسـابی خـۆم لە فڕەنكـەكان هەقـی خـاوەن پۆشـاكەكانم دا، لەبەر ئـەوەش كـەش و هەوایەكـە تاریـك بـوو، زۆریـش قەرەباڵـەغ بـوو وامزانـی فڕەنكەكانـم پێـداوە، دوایـی كابـرام جێهێشـت و ڕۆیشـتم، (دە) مەترێـك زیاتـر دوور نەكەوتبوومـەوە گەنجێكـی ڕێكپـۆش كـە نەمدەناسـی منـی وەسـتاند، سـەلامی لـێ كـردم، پاشـان پێـی گوتـم: ئـەی شـێخ چیـت بـۆ كڕیوین؟ بـەر لـەوەی وەڵامـی بدەمەوە، دەسـتی گرتـم و گوتـی: وەرە! لەنێـو ئـەو قەرەباڵەغیەی خەڵك منـی گەڕاندەوە بـۆ لای فرۆشـیاری پۆشـاكەكان، هـاواری بـەڕوودا كـردو پێـی گـوت: لیرەكانـی پـێ بـدەوە، پیاوەكـە هێشـتا لیرەكانـی لەنێـو دەسـتی دابـوون، پێدەچـوو هێشـتا ئەویـش نەیزانیبـێ لەنێـو فڕەنكەكانـدا لیـرەی زێـڕ هـەن، بـە نكوڵـی كـردن و سەرسـام بوونـەوە دەسـتەكانی خـۆی كـردەوە بـۆ ئـەوەی لیـرەكان لەنێـو مشـتی خۆیـدا ببینـێ! لـەو حاڵەتـەدا لەلایـەك شـۆك بووبـوم و سـەرم سـوڕمابوو، لەلایەكـی تـر خەریـك بـوو لیرەكانـم لـە كابـرای فرۆشـیار وەردەگرتـەوە سـەیری لای ڕاسـت و چەپـی خـۆم كـرد، گەنجـە ڕێكپۆشـەكە لەبـەر چـاووم ون بـوو نەمبینیـەوە!}.

باوكـم دەیگـوت: {ئـەوە هەمـوو ئـەو شـارەزایی و زیرەكیـەی مـن بـوو كـە منـی پاراسـت و كارەكانـی بـۆ ئاسـان كـردم، بـە

دڵنیاییەوە هەموو ئەمانە هیچ دەستێکی منی تێدا نەبوو، تەنها بریتی بوو لە چاودێری و پاراستنی خوایی، لەوانەیە ئەمەش لە ئەنجامی ئەو متمانە زۆرەم بووبێ بەو فەرمایشتە خواییەی کە پێشتر باسم کرد: ﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ﴿١٠٠﴾ ﴾ النساء}.

پاشان باوکم دەیگوت: {هەندێ لەو خەڵکانەی ناوچەکەی خۆمان چاویان لەمن کردو بەدوای مندا هاتن، لە تورکیاوە بەرەو دیمەشق، بەراوورد بەمن کە سەرکەوتووبوم لە کار کردن لەکاتێکدا نە پارەو پوڵم هەبوو نە شارەزاییم لە پیشەیەکدا هەبوو، ئەوان سەرەڕای ئەوەی خاوەن بیرۆکەی بازرگانی بوون و کەسانی زیرەك بوون لە کاری پیشەسازی، پارەی زۆریشیان هەبوو لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان، بە تەماحی ئەوەی کە ماڵی زیاتر بەدەست بهێنن و دونیایان خۆشتر بکەن، دوو لەو کەسانەی کە چاویان لەمن کرد یەکێکیان زێڕینگرو ئەوەی دیکەیان بازرگانێك بوو، هەردووکیان هاتن بۆ دیمەشق بە فەخر کردن و پشت بەستن بە پارەو پووڵ و پیشەو سەرمایەکانیان، بەڵام هەر یەکێك لەوان هەوڵی زۆری یەك لەدوای یەکیاندا، لەزۆر دەرگایاندا، هیممەت و هەوڵ و کۆششی زۆریان بەخەرج کردن دا، پشتیان بەتواناو شارەزایی زۆری خۆیان بەست لەو پێناوەدا، بەڵام هەوڵ و ماندوبوونەکانیان هیچی لێ شین نەبوو، ئەمەش وای کرد بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی هاتبوون، یەکێکی دیکە لەوانەی کە ویستیان چاو لەمن بکەن کەسێك بوو بازرگانی مەڕوماڵاتی دەکرد، لە کارەکەیدا تووشی زەرەر

بووبو، منی بینیبوو هاتومەتەوە ناوچەی جەزیرە بۆ مەبەستی کارو کەسابەت، زانیبووی کە هەندێ نیسك و نۆکم هێناوەو بە قازانجێکی ماقوڵ فرۆشتوومە، بۆیە لەگەڵ شەریکێکی بڕیاریان دابوو هەمان کار ئەنجام بدەن، واز لە بازرگانی کردن بە مەڕو ماڵات بێنن، بەڵام ئەوان بە پارەیەکی زۆرتر کە لەگەڵ دەوڵەمەندیەکەیان دەگونجا هاتنە نێو کارەکە، کەچی دیسان ئەوانیش سەرکەوتو نەبوون لەو ئەزموونەیان}.

باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ گوتی: {شەوێکیان هەردووکیان هاتنە لام و سکاڵای ئەو زەرەرو زیانانەیان کرد کە پێیان کەوتبوو، ئەوەیان بۆ پێشنیار کردم بەشێك لە پارەکەی خۆیان بخەنە پاڵ پارەکەی من، دواتر لەهەر شتێك کە دەیکڕم یان دەیفرۆشم ئەوانیش بەژداری پێ بکەم، منیش تکاو پێشنیارەکەی ئەوانم قەبوڵ کرد، پارەکەم لێ وەرگرتن، گەشتەکەم ئەنجامداو بارێکی قوڕس و زۆرم لە دانەوێڵە کڕی، پاشان خوای پەروەردگار یارمەتی دام و فرۆشتم، بەوێنەی ئەو قازانجەی کە دەستم دەکەوت بەو ماڵە کەمەی کە هەمبوو، بەڵام ئەوجارەیان لەبەر ئەوەی بارەکە زۆر بوو قازانجەکەش زۆر زیاتر بوو لەجارانی پێشوو، دوای ئەوە حیسابەکەم پێشاندان ئەوەندە دڵخۆش بوون دەم و چاویان گەشایەوە، ماڵەکەم پێدانەوە چاوەڕێی ئەوەم دەکرد بەشێك لە قازانجەکەم پێ بدەن، بەحوکمی ئەوەی کارەکە من ئەنجامم داوە، بەڵام توشی شۆك بووم کاتێ لێیان تێگەیشتم، ئەوان وایان پێشاندا کە ئەو ماڵەیان وەك ئەمانەتێك لای من داناوە، ئەو کارەش کە من بە ماڵەکەی ئەوانم کردووە غەیری

کارێکـی ئینسـانیی هیچـی تـر نیـە، بـەم شـێوەیە هەمـوو ماڵەکەیـان بـردەوە هـەم سـەرمایەو هـەم قازانجەکـەش، بـێ ئـەوەی شـتێك لـە قازانجەکـە بەمـن بـدەن، جگـە لـە پاداشتی لای خـوا چـی تـرم بـۆ نەمایـەوە، هـەر بـۆ پەنـدو وانـە وەرگرتـن ئـەوە دەڵێـم: ئـەو دوو شـەریکە هیـچ سـودێکیان لـەو ماڵـە نەبینـی کـە لای مـن بردیانەوە، زەرەر دوای زەرەریـان تـووش دەهـات تـا وای لێهـات ئیفلاسـیان کـرد، خـوای گـەورە ڕەحـم بەهەمـوو لایەکـمان بـکات و وامـان لـێ بـکات ڕاسـتگۆیانە پەنـدو وانـە لەهەمـوو ئـەو شـتانە وەربگریـن کـە بەچـاوی خۆمـان دەیانبینیـن و بەگوێکانمـان دەیانبیسـتین).

کۆتـا شـت لەبـارەی دیمەنـی ئـەو فـەزڵ و بەخششـانەی کـە خـوای پـەروەردگار لەگـەڵ باوکمـی کردبـوو لـەو ژیانـە نوێیەیـدا لـە دیمەشـق، دوو شـت بـوون پێویسـتە باسـیان بکـەم: یەکێکیـان: جێگیـر بوونـی فەرمانبەرێتیەکـەی بـە ناوونیشـانی پێشـنوێژو وتـار خوێـن لـە ئەوقافـی دیمەشـق، کـە نەهەوڵـی بـۆ دابـوو نـە بەخەیاڵیشـی داهاتبـوو، بـەڵام دوای چەنـد سـاڵێك لـە خزمـەت کردنـی مزگەوتەکـە خـوای پـەروەردگار پیاوێکـی بـۆ ڕام کـرد کـە نـاوی شـێخ حەسـەن مەزیـك بـوو ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ ئـەو پیـاوە باوکمـی ناسـی، پێشـتر یەکتریـان نەدەناسـی، سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی مزگەوتەکـە بخاتـە سـەر میلاکـی ئەوقـاف و باوکیشـم بـە فەرمانبـەرو مووچەیەکـی مانگانـە لەهەمـان مزگـەوت دابمەزرێنـێ، دواتـر کارەکـەش هـەر بـەم شـێوەیەی لێهـات.

دووەمیـان: باوکـم لە خانـووی ئەوقافـەوە ماڵەکـەی گوێزایەوە بۆ خانوێـك کـە موڵـك بـوو، زەویەکـەی بـە پارەیەکـی کـەم لـە ئەوقاف

کڕیـەوە، پاشـان خانووێکـی لەسـەر درووسـت کـرد بەگوێـرەی ئـەو توانـا کەمـەی کـە ئـەو کات هەیبـوو، بیـرم دێ لەپێنـاوی ئەمـەدا بەشـێکی زۆری لـە کتێبەکانـی نێـو کتێبخانەکەی فرۆشـت، هەروەها بیـــرم دێ (عومـــەر ئاغـــا شـــەمدین) کـــە دیارتریـــن پیاوماقوڵـــی ئـەو کاتـی گەڕەکـی کـوردان بـوو بـەرەو ڕووی ئـەو فەرمانبەرانـە دەبوویـــەوە کـــە تـــاو ناتـــاوێ لەلایـــەن پارێـــزگاوە دەنێـــردران بـــۆ تێکدانـی خانووەکەمـان، بـە پاسـاوی ئـەوەی کـە بەشـێوەیەکی سیسـتماتیك بـەرز نەکراوەتـەوە، نـەك هـەر ئەوەنـدەو بـەس بەڵکـو ئـەو پیـاوە بەڕێـزە (عومەراغـا شـەمدین) ببـوە پاسـەوان و ئێشـکگر لـە بەرانبـەر هـەر مەترسـی و هەڕەشـەیەك لەهـەر کات و سـاتێکدا ڕووبـەڕوی کار کـردن و بینـا کردنـی خانووەکەمـان دەبوویـەوە.

عومــەر ئاغــا شــەمدین بەتــەواوی متمانــەی بــە زانســت و پیاوچاکیـــی باوکـــم هەبـــوو، ســـەرەڕای ئـــەوە باوکمـــی ئێکجـــار خۆشدەویسـت بـەو شـێوازە هەڵـس و کەوتـی لەگـەڵ باوکـم دەکـرد کـە موریدێـك لەگـەڵ شـێخەکەیدا دەیـکات، ڕەحمەتـی خـوا لـە عومـەر ئاغـاو هەمـووان بێـت، خـوای گـەورە ئێمـەو ئـەوان بخاتـە ژێـر چەتـری بەزەیـی و لێخۆشـبون و بەخششـی خـۆی.

**منداڵەکانی و ، شێوازو ڕێبازی باوکم لە پەروەردە کردنیان**

ئـەو کاتـەی باوکـم کۆچـی کـرد بـۆ دیمەشـق خوشـکێکم هەبـوو نزیکـەی سـێ سـاڵ لەخـۆم گەورەتـر بـوو، نـاوی (زەینـەب) بـوو، خوشـکێکی دیکـەم هەبـوو نزیکـەی دوو سـاڵ لەخـۆم بچووکـتر بـوو نـاوی (ڕوقیـە) بـوو، مـن تاقانـە کـوڕی باوکـم بـووم وەك پێشـتریش باسـم کـرد.

ڕوقیـەی خوشـکم دوای چەنـد مانگێـك لـە گەیشـتنمان بە دیمەشـق وەفاتـی کـرد، زەینەبیشـمان دوای نزیکـەی پێنـج سـاڵ لـە گەیشـتنمان بـە دیمەشـق وەفاتـی کـرد، ئـەو کات ئێمـە لـە خانووێکـی کۆڵانـی عەڕەفـات نیشـتەجێ بوویـن، بەرامبـەر مزگەوتـی (روکـن الدیـن).

لـەو ماوەیـەدا خـوای پـەروەردگار کچێکـی بـە باوکـم بەخشـی نـاوی نـا (نەعیمـە)، بـەڵام ئەویـش لـە تەمەنـی حـەوت سـاڵی وەفاتـی کـرد، لـە سـاڵی (١٩٤٢) دایکیشـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ دوای چەنـد سـاڵێك لـە ئێـش و ئـازار بەدەسـت نەخۆشـیەوە وەفاتـی کـرد، ئـەو کاتـەش دایکـم وەفاتـی کـرد مـن تەمەنـم سـێزدە سـاڵ بـوو، دوای ئـەوە خـوای پـەروەردگار ویسـتی وابـوو باوکـم نافرەتێـك بخـوازێ لـە خێزانێکـی تورکـی خـاوەن پێگـەو مەکانەت، خـوای پـەروەردگار لـەو نافرەتـەدا دوو کچـی بـە باوکـم بەخشـی، کچـە گەورەکـەی ناونـا زەینـەب و بچووکەکەشـی ناونـا خەدیجـە، ئـەوان سـوپاس و سـتایش بۆخـوا ژیـان و نەمـردن، تـا ئـەو کاتـەش کـە هەردووکیـان ژیانـی هاوسـەریان پێکهێنـا باوکـم لـە ژیانـدا

مابـوو، تاكـو ئێسـتاش سـوپاس بۆخـوا بەتەندروسـتيەكی باشـەوە لەژيانـدا مـاون، كەواتـە: باوكـم لـە غەيـری مـن هيـچ كوڕێكـی ديكـەی نەبـوو، لەخێزانـی دووەميشـيدا دوو كچـی هەبـوو.

**ڕێبازی باوكم لە پەروەردە كردندا:**

باوكـم پێـی وابـوو ماڵـەوە سـەرچاوەی يەكەمـە بـۆ پـەروەردە كـردن، دايبابانيـش بەرپرسـی يەكەمـن لـە پـەروەردە كردنـی منداڵەكانيـان، منـداڵ چ كـچ بـێ چ كـوڕ، پێويسـتە يەكـەم وشـەيەك كـە بەگوێيـدا بـدرێ و فێـری ئەوەبێ قسـەی پـێ بكات نـاوی (الله) بـێ، كاتێكيـش بـای ئەوەنـدە گـەورە دەبـێ كـە بتوانـێ ڕسـتەيەك دەرببـڕێ پێويسـتە ئـەو ڕسـتەيە بريتـی بـێ لـە: (شـايەتمان)، دوای ئـەوەی قۆنـاغ بەقۆنـاغ گـەورە دەبـێ عەقڵـی دەكرێتـەوەو فـام دەكات و شـتەكانی دەورو بـەری لێـك دەداتـەوەو دەتوانـێ ئەزبەريـان بـكات، ئـەوا پێويسـتە ئـاگادار بكرێتـەوەو زانيـاری پـێ بـدرێ بـە هەسـتيارترين و گرنگتريـن حەقيقـەت كـە بريتييـە لـە خواناسـی، زانيـاری پـێ بـدرێ و ئـاگادار بكرێتـەوە لـەوەی ئـەم گەردوونـە پەرسـتراوێكی هەيـە مشـوری دەخـواو بەڕێـوەی دەبـا، هەمـوو ئينسـانێك بەنـدەو موڵكـی خوايـە، هەروەهـا پێويسـتە فێـری نـاوی كۆتـا پەيامبـەری خـوا بكـرێ كـە موحەممـەدە ﷺ، فێـری نـاوی دايـك و بـاوك و شـوێنی لەدايـك بوونـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بكـرێ، فێـری ئـەوە بكـرێ كـە بـۆ چ شـارێك كۆچـی كـردوە، لەگـەڵ كورتەيـەك لـە ژياننامەكـەی، دوای ئەوانـە قوڕئانـی فێـر بكـرێ لـە يەكـەم سـوڕەت تـا كۆتـا سـوڕەت.

بـەم بنەمـاو بنچینـە گرنگانـەوە باوكم دەستی دەكرد بە پـەروەردە كردنـی منداڵەكانـی هـەر لـە بچووكیـەوە، پاشـان باوكـم پێـی وابـوو ئەگـەر بكـرێ و بگونجـێ ئـەوا پـەروەردە كـردن و فێركردنـی كـچ لەماڵـەوە باشـترە، گرەنتـی زیاتـر دەدا لەسـەر ئیسـتیقامەو دینـداری كچـان، هـەر بـەم شـێوەیەش هـەردوو خوشـكەكەمی زەینـەب و خەدیجـە پـەروەردە كـرد.

هەروەهـا پێـی بـاش بـوو كـە (دوای ئـەوەی كـچ بـای خـۆی لـە ڕۆشـنبیری و زانیـاری ئیسـلامیی وەرگـرت) ڕوو بكاتـە فێـر بـوون و وردەكاری لـە یەكێـك لـە كاروبارەكانـی تایبـەت بـە ئافرەتـان، هیـچ هەڵوێسـتێكی پێچەوانەشـی نەبـوو لەسـەر مەسـەلەی فێركردنـی ئافرەتـان، بـەڵام بەمەرجـی دەگـرت كـە دەبـێ ڕێـگای فێـر كردنـی ئافرەتـان ڕێگایەكـی خاوێـن و دوور لـە دەردو بـەڵاو سـەر ئێشـە بـێ.

ئـەوەی تایبـەت بـێ بەمـن، وەك باسـم كـرد تاقانـە بـووم، لەتەمەنـی شـەش سـاڵی منـی بـردە لای ئافرەتێكـی ڕێـزدارو خانـەدان، ئـەو ئافرەتـە دەرسـی قوڕئانـی بـە منـداڵان دەگـوت، باوكـم ئافرەتەكـەی ڕاسـپارد بـۆ ئـەوەی دەرسـی قوڕئانـم پـێ بڵـێ، ئافرەتەكـەش لـە قوڕئـان فێـر كردنـدا چاودێـری دەكـردم و گرنگـی پـێ دەدام، بـەو پـەڕی تـەواوی و ڕێـك و پێكیـەوە فێـری كـردم، دواتـر زانیمـەوە كـە بەمـاوەی شـەش مانـگ لـەلای ئـەو ئافرەتـە قوڕئانـم خەتـم كردبـوو، بیـرم دێ باوكـم بـەم بۆنەیـەوە ئاهەنگێكـی گـەورەی بـۆ سـاز كـردم، زۆر خۆشـحاڵی خـۆی

دەربـڕی، لەبەرامبــەر ئــەو دەسـتكەوتە گەورەیەشـدا باوكـم چـوار لیـرەی زێـڕی بەخشـی بـە ئافرەتەكـە، باوەڕناكـەم ئەوەنـدە پارەیـەی بــە ئافرەتەكــەی دا ئەوەنــدەی لەماڵــەوە مابــێ.

پاشــان منــی نــاردە بــەر خوێنــدن لــە قوتابخانەیەكــی ســەرەتایی تایبەتــی ناحكومــی (ئەهلــی)، قوتابخانەكــە لــە شــەقامی (قرمانــی) بــوو، نزیــك بــازاڕی ســاروجە، باوكــم بەڕێوەبــەری قوتابخانەكــەی دەناســی و متمانــەی پــێ هەبــوو، ئــەم قوتابخانەیە گرنگــی زۆری دەدا بــە فێــر كردنــی ئایین و بنەماكانــی زمانــی عەرەبــی و بیــركاری[1]،

---

(١) ئەمــە دەڵێــم، بــەڵام پێویســتە ئــاگاداری لەبــارەی ئــەوەوە بــدەم زۆربــەی هــەرە زۆری مەعاریفــەكان كــە پێشــتر منــداڵان دەرســیان تێــدا دەخوێنــد لــە قۆناغــی ســەرەتاییدا، پــڕ بــوون لــە ئایین و فێركردنی ڕەوشــت و ئــاكاری بەرزو مرۆڤدۆســتی، بەتایبــەت لــە بــارەی ــەو بابەتانــەوە كــە تایبــەت كرابــوون بــۆ خوێندنــەوە، بابەتــەكان هــەم فێــركاری بــوون، هــەم پەروەردەیــی، بــۆ وێنــە ئێمــە ئــەم بەیتــە شــیعرانەمان ئەزبــەر دەكــرد:

مَن عَلِم العُصفور أَن ... يبنى عِشاً في الشجر
اللــــه قــــد علّمـــــه ... ذاك وأعطاهُ الهــدى
مَن علم النّحــلة أن ... تَمص أزهار الثمــــر
الله قــــــد علّمهـــا ... ذاكَ وأعطاها الهدى، ..............الخ.

ئێمــە كاتــی خــۆی ئــەو شــیعرو پەخشــانانەمان ئەزبــەر دەكــرد كــە هەســت و ســۆزی مرۆڤبوونــی لــە دەروونــی منداڵانــدا دەچانــد، بــەرزی دەكردنــەوە بــۆ ئاســمانی ئــاكارو ڕەوشــتی بــەرزو پەســند، ئەمــە جگــە لــەوەی ئــەو دەقــە شــیعریانە پــڕ بــوون لــە ڕەوانبێــژی و زەوقــی ئەدەبــی، هەمدیســان ئــەو زەوقــە ئەدەبــی و ڕەوانبێژیــە كاریگــەری ئەرێنــی لەســەر منداڵــەكان درووســت دەكــرد، هــەر بــۆ نموونــە ســەیری ئــەو بەیتــە شــیعرانەی خــوارەوە بكــەن،

مـن بـۆ گەیشـتن بـە قوتابخانەكـەم ڕێگەیەكـی دوورو درێـژی خۆڵم دەبـڕی، ڕێگاكـە كەوتبـووە نێـوان چەنـد بـاغ و بێسـتانێك پێیـان دەگوتـرا: (عیـن الكـرش)، بەپـێ بـۆ قوتابخانـە دەچـووم، بیـرم دێ لەبـەر ئـەوەی ڕێگاكـە هـەم دوورو درێـژ بـوو، هـەم خۆڵیـش بـوو زۆر مانـدوو دەبـووم تـا دەچـووم و دەهاتمـەوە.

دوای ئـەوە باوكـم تاكـە مامۆسـتام بـوو، سـەرەتا بنەماكانـی عەقیـدەی ئیسـلامی فێـر كـردم، پاشـان كورتەیـەك لـە ژیاننامـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، لـە سـۆنگەی نامیلكەیەكـی بچـووك بەنـاوی (ذخیرة اللبیـب في سیرة الحبیـب)، پاشـان بنەماكانـی زانسـتی ئالـەی فێـر كـردم لـە نەحـوو صـەرف، لـە زانسـتی نەحـودا ئەلفیـەی ئیـبن مالیكـی پـێ ئەزبـەر كـردم، ڕۆژانـە پێنـج بـۆ شـەش بەیتـی لـە ئەلفیـەی ئیـبن مالیـك بـۆ ڕوون دەكردمـەوە، منیـش لەسـەرم بـوو

---

بەداخـەوە نـاوی شـاعیرەكەم لەیـاد نەمـاوە، ناوونیشـانی شـیعرەكە بریتیـە لـە (طفـل ضریر):

| | |
|---|---|
| یا أم ما شكل السما | وما الضیاء ومـا القمـــــر |
| بجمالها تتحـــــدثو | ن ولا أری منها الأثـــــــر |
| أمشي أخاف تعـثرا | وسط الضیاء أو السحـــــر |
| عكازتي هي ناظري | هل في جماد من بصـــــــر |
| یا أم ضمیني إلیـــ | ـــك عسی یزایلني الضجـــر |
| یا أم لا تبكي علـــ | ـــيّ رعاك من خلق البشـر |

ئـەو شـیعرانە لـە قوتابخانـە سـەرەتاییەكان دەخوێـنران، هەرچەندە لـە قۆناغی سـەرەتایی دەخوێـنران بـەڵام پـڕ بـوون لـە ئاڕاسـتەكردنی ئاینـی و ئەخلاقـی، كـە قوتابـی لـەو قوتابخانانـەدا وەری دەگـرت.

بـۆ بەیانیەكـەی ئەزبەریـان بكـەم، بیـرم دێ هەمـوو ئەلفیـەی پـێ ئەزبـەر كـردم لـە مـاوەی كەمـتر لـە سـاڵێك، سـەرەڕای ئـەوەی هێشـتا بالـغ نەبووبـوم.

## شێخ حەسەن حەبەنكەلمەیدانی و پەیمانگەی ئاراستەی ئیسلامیی:

لـەو ماوەیـەدا باوكـم ئاشـنایەتی لەگـەڵ زانایەكـی پایـە بـەرز لــە زاناكانــی شــاری دیمەشـق پەیـدا كـرد، ئەویــش حەســەن حەبەنكەلمەیدانــی بــوو، ئــەوەی بزانــم یەكــەم چــاو پێكەوتنــی ئــەو دووانــە لــە كتێبخانــەی عەرەبــی بوو كــە خاوەنەكەی ئەحمــەد عەبید بــوو، لەنێوانــی شــێخ حەســەن و ئەحمــەد عەبیــد دۆســتایەتیەكی قــووڵ هەبــوو، باوكــم زوو زوو ســەردانی ئــەو كتێبخانەیــەی دەكــرد بــۆ ئــەوەی بزانــێ چ كتێبێكــی نوێــی بــۆ هاتــووە، دوای ئــەوەی باوكـم شـێخ حەسـەن دەناسـێ بـۆی دەردەكـەوێ شـێخ حەسـەن پەیمانگەیەكـی شـەرعی بەڕێـوە دەبـات لـە ناوچـەی (مەیـدان)، پاشـان دەرفەتێكـی تـر هاتـە پێشـەوە بـووە هـۆی ئـەوەی باوكـم زانیـاری زیاتـر لەبـارەی ئـەو پەیمانگەیـە وەربگـرێ، دوای ئـەوەی بەڕێككـەوت یەكـێ لـە قوتابیـە زیـرەك و بەڕێـزو سـەنگینەكانی ئـەو پەیمانگەیـە دێتـە لای باوكـم و داوای لـێ دەكات دەرسـی پـێ بڵـێ، دەرسـەكەش كتێبێـك بـێ لـە فیقهـی ئیمام شـافیعی، ئـەو قوتابیـەش (شـێخ مەحمـود ماردینـی) بـوو خـوای گـەورە لـەش سـاغ و تەمـەن درێـژی بـكات، وردە وردە پەیوەنـدی ئـەو شـێخەو باوكـم بەهێـز دەبـێ بەهـۆی دەرسـێكی هەفتانـە كـە لـەلای باوكمـی دەخوێنـد، ئەمـە بـووە هـۆی ئـەوەی باوكـم زانیـاری زیاتـر كـۆ بكاتـەوە

لەبارەی پەیمانگەكەوە، كە ئەو كات هێشتا ژمارەی قوتابیەكانی زۆر نەبوون و ناوی پەیمانگەشی لێ نەنرا بوو.

پەیمانگەكە پێك هاتبوو لە نزیكەی هەژدە نۆزدە گەنجێك وانەی شەرعیان دەخوێند لەلای شێخ حەسەن حەبەنكە ڕەحمەتی خوای لێبێ، ئەو گەنجانە لە وەرگرتنی زانست هەموویان یەك ئاست نەبوون و جیاواز بوون، هەموویان زنجیرە زنجیرە دەرسێكی یەك لەدوای یەكیان وەردەگرت لەسەر دەستی شێخ ڕەحمەتی خوای لێبێ، تەمەنیان لەنێوان بیست بۆ سیساڵان بوو، هەمووشیان وازیان لەماڵەوە هێنابوو بەتەواوی خۆیان یەكلا كردبوویەوە بۆ وەرگرتنی زانست، ڕۆژانە لە ژورێكی سەر بە مزگەوتی (منجك) لە گەڕەكی جزماتیەی ناوچەی مەیدان دەمانەوە، پێیان دەگوترا: قوتابیانی مزگەوتی منجك، وەك گوتم: هێشتا ناوی پەیمانگەی لێ نەنرا بوو.

باوكم ڕاوێژی بە قوتابیەكەی خۆی شێخ مەحمود ماردینی كرد بۆ ئەوەی كوڕە تاقانەكەی بخاتە بەر خوێندن لەو پەیمانگایەدا، پرسیاری لێ كرد ئاخۆ بچووكی تەمەنی كوڕەكەی لەلایەك و هێشتا شتێكی ئەوتۆ فێر نەبووە لەلایەكی تر (چونكە من هێشتا تازەو سەرەتا بووم لە وەرگرتنی زانیاری) نابێتە كێشەو بەربەست؟ مامۆستا ماردینی زۆر هانی باوكمی دا لەسەر ئەو كارە، پەیمانی بە باوكمدا كە خۆی ئاگای لێم بێ و سەرپەرشتیم بكات، پەیمانی ئەوەی پێدا هەم خۆی و هەم بژاردەیەك لە نزیكانی لە پەیمانگاكە وانەی تایبەتیم پێ بڵێن بەشێوەیەك كە گونجاو بێ لەگەڵ ئاستی زانستیم.

خوای پەروەردگار دڵی باوکمی بۆ ئەم کارە کردەوە، وا پێدەچوو باوکم وا گومان ببا منیش وەك هاوتەمەنەکانم حەز دەکەم لە قوتابخانە فەرمیەکان درێژە بە خوێندنم بدەم، ڕۆژێکیان بەر لەوەی وەك بچووکترین قوتابی لە پەیمانگەی ئیسلامیی ناوم تۆمار بکات دەستی گرتم و ئامۆژگاری کردم، باسی ئەوەی بۆ کردم کە چەندە ئومێدی لەسەر مندا هەڵچنیوە، لەو قسانەی پێی گوتم:

{ڕۆڵە سەیری باوکت بکە، بزانە! ئەگەر بمزانیایە ڕێگای گەیشتن بەخوا بەکاری گسکدەری و هەڵگرتنەوەی زبڵ و خاشاك لەزەوی بەدەست دێت ئەوا دەمکردیتە (گسکدەر-کەنناس)، بەڵام من قوڵ بوومەتەوەو سەیرم کردووە، بینیومە ڕێگای گەیشتن بەخوا بریتیە لە شارەزا بوون بەخوا خۆی و بەدینەکەی، لەبەر ئەوە بڕیارم داوە ئەو ڕێگەو ڕێبازە بەتۆ ببڕم کە پێم گوتی}.

پاشان زۆر بەتوندی و جەخت لێ کردنەوە ئەوەی بۆ دووپات کردمەوە لە وەرگرتنی زانست و زانیاریی مەبەستم بەدەستهێنانی هیچ بڕوانامەیەك و فەرمانبەرییەك نەبێ، دەتوانم بڵێم نیمچە پەیمانێکی لێ وەرگرتم لەسەر ئەوەی بەوەندە ڕزق و ڕۆزیە قەناعەت بکەم کە خوای گەورە دەیکات بە قسمەتم، هەروەها بەو کارە قەناعەت بکەم کە خوای گەورە منی تێدا بەهرەمەند دەکات و لەسەریدا جێگیرم دەکات.

بەوپەڕی کاریگەر بوون بە قسەکانی ڕازی بووم بەهەموو ئەو شتانەی کە فەرمانی پێ کردم و پێی گوتم، دوای چەند

ڕۆژێـك دەسـتی گرتـم و منـی بـرد بـۆ ناوچـەی (مەیـدان) کـە تـا ئـەو ڕۆژە نـە گوێـم لـێ بووبـو، نـە بینیبـووم، منـی بـرد بـۆ ماڵـی شـێخ حەسـەن حەبنەکـە ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ، ماڵەکـەی نزیـك مزگەوتـی منجـك بـوو.

شـێخ زۆر بەگەرمـی پێشـوازی لـە باوکـم کـرد، ئـەم بـەو پـەڕی ڕێـزو خۆشەویسـتیەوە پێشـوازی لـەو کەسـانە دەکـرد کـە دەهاتنـە لای، کاتەکـەی چێشـتەنگاو بـوو قوتابیەکانـی لـەدەوری بـوون، لـە پێشـکەش کردنـی زنجیـرەی وانـەکان بـەردەوام بـوو، مـن و باوکـم دانیشـتین و تـا کۆتایـی دەرسـەکە گوێـمان بـۆ گـرت، پاشـان باوکـم زۆر بـەدوورو درێـژی باسـی ئـەوەی بـۆ شـێخ کـرد کـە بۆچـی هاتۆتـە لای، ئێسـتا هیـچ شـتێکم لەسـەر ووردەکاریەکانـی ئـەو قسـانە لەبیـر نەمـاوە، پاشـان منـی بـە ئەمانـەت لـەلای شـێخ لـە پەیمانگەکـەی بەجـێ هێشـت و خۆیشـی گەڕایـەوە.

لـەو ڕۆژەوە پەیوەندیـم لەگـەڵ ماڵـەوە پچـڕا، بوومـە قوتابـی بەشـە ناوخۆیـی لـە پەیمانـگای ئاڕاسـتەی ئیسـلامیی، بەڵکـو قوتابیـەك لـە مزگەوتـی منجـك، چونکـە تـا ئـەو کات نـاوی پەیمانگـەی بەسـەردا نـەدرا بـوو، مـن لـە هەفتەیەکـدا تەنیـا ڕۆژانـی سـێ شـەممە دەچوومـەوە ماڵـەوە، بـۆ بینینـی باوکـم، لـە بەیانـی سێشـەممە لـەلای دەمامـەوە تاوەکـو دەبوویـە دەمـەو ئێـوارە، ئنجـا مۆڵەتـم لـێ دەخواسـت و دەگەڕامـەوە منجـك.

لەگـەڵ ئـەو قوتابیانـەی کـە بەتەمـەن بـوون بـەژداری دەرسـەکانیانم دەکـرد، سـەرەڕای ئـەوەی کەمێکـی کـەم نەبـێ

لەدەرسەکانیان حاڵی نەدەبووم، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت کە ئامادەبوونم لەو دەرسانە زۆر سوودی هەبوو بۆم، دواتر منیش لەلای زیاتر لە قوتابیەك لەو قوتابیانەی کە لەخۆم گەورەترو بەتەمەنتر بوون دەرسم دەخوێندو زانستم لێ وەردەگرتن، هەریەکەیان شێخ و مامۆستایەك بوو بۆمن، بەر لەهەموویان شێخ مەحمود ماردینی، ئەویان سەرپەرشتیاری ڕاستەوخۆی من بوو.

ڕۆژانی سێ شەممە کە دەگەڕامەوە وانەی زیاترم لە باوکم وەردەگرت، وانەکانی نەحوو ڕەوانبێژیم لەلای خوێند، لەسەر دەستی باوکم مەتنی (عقود الجمان)ی سیوتیم ئەزبەر کرد، کتێبێکی ترم لەبارەی زانستی مەنتیقەوە لەلای باوکم خوێند، لەگەڵ (المقولات العشر)، هەروەها (شرح جمع الجوامع في الأصول) یشم لەلای خوێند.

باوکم دڵخۆش بوو بە پەیوەست بوونی من بەو پەیمانگەیە، سەرەڕای ئەوەی کە دابڕانی من ئەرکی ئەوی قورستر کردبوو، وای لێکردبوو هەست بە تەنیایی بکات، ئەمەشم دواتر زانیەوە، زۆربەی ئەرکەکانی ماڵەوەی کەوتبووە سەر شان کە پێویست بوو من ئەو کارانە ئەنجام بدەم نەك ئەو، ئەوەی زیاتر بۆ ئەو دەبووە یارمەتیدەر تا بتوانێ زیاتر ئارام بگرێ، ئەو پەیوەندیەی ئەوبوو لەگەڵ شێخی پەیمانگاکە شێخ حەسەن حەبەنکە ڕەحمەتی خوای لێبێ، پەیوەندیەکانیان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گەرم و گوڕتر دەبوو.

**بەڵاو فیتنە، لە ئامۆژگاریەکانی نزیکان:**

لە ڕۆژگاری منداڵیمدا لەگەڕەکەکەی خۆماندا چەند هاوڕێیەکم هەبوو، هەندێ لەوان ڕوویان کردە قوتابخانە فەرمی و حکومیەکان، هەندێکی تریان ڕوویان کردە فێربوونی پیشەو وەستایی و کاری پیشەسازی، بەشێك لەو هاوڕێیانەم کاتێ منیان دەبینی و دەیانزانی کە دوورکەوتوومەتەوە لەماڵەوەو خەریکی وەرگرتنی زانستم لە مزگەوت، ئامۆژگاریان دەکردم و ئاگاداریان دەکردمەوە کە ئەو کارەی من لە کۆتاییدا سەری لە هەژاری و نەداریی و بوونە بار بەسەر خەڵکیەوە دەردەچێ، یەکێ لەوان پێی دەگوتم: تۆ تەنها یەك داهاتووت هەیە، ئەویش یان دەبیە مەیت شۆر، یان بانگبێژی بەردەم جەنازەکان، یەکێکی دیکەیان پێی دەگوتم: ئایا تۆ بای ئەوەندە لە دینەکەت شارەزانی کە پێویستە چی بکەیت و چی نەکەیت، ئەی کەواتە بۆچی هەموو تەمەنت لە شتێکدا سەرف دەکەی کە پێویستت پێی نیە؟!

بیرم دێ ئەو بەناو ئامۆژگاریەی ئەوان تەنیا لە دەرگای گوێیان دەدام و هیچ ئاسەوارێکیان لە دەروونی مندا درووست نەدەکرد، هەر ئەوەندەم پێ دەگوتن کە: ئەوە پەیمانێکەو خۆمم پێوە پابەند کردووە بەرامبەر باوکم، نە دەیشکێنم و نە لێی لادەدەم.

ئێستا زۆرجار لەخۆم دەپرسم ئاخۆ چ شتێك منی لەو پەیامە مەترسیدارانەی ئەوان دەپاراست کە هێشتا تەمەنم شازدە ساڵ

تێپەڕی نەكردبوو؟ ئەوەندەی بیر دەكەمەوە غەیری یەك شت كە خوای پەروەردگار منی لەناویدا پاراست هیچی ترم پێ شك نایە:

یەكێ لەو ئامۆژگاریانەی باوكم بەڵكو دەتوانم بڵێم: یەكێ لە فەرمانەكانی باوكم كە جێبەجێم دەكرد، دەبوو هەموو بەیانیان سورەتی (یس) بخوێنم، ئەگەر توانیم ئێوارانیش بیخوێنم، پاداشتی خوێندنەكەشی بكەمە هەدیە بۆ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و هەندێ لە زانا ڕەببانیەكانی سەلەفی صاڵح، بەڵێ، ئەمەم ئەنجام دەدا، تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ بەو پەڕی وردی و گرنگی پێدانەوە بەگوێرەی توانا وەسیەتەكەی جێبەجێ دەكەم.

چۆن هاوسەرگیریم كردو بوومە وڵاش زاوای باوكم؟

دوای ئەوەی بوومە هەژدە ساڵ، باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ سوور بوو لەسەر ئەوەی ژنم بۆ بێنێ، زیاتر لەگەڵ ئەو بۆچوونە بوو كە دەڵێ: باوك كاتێ دەبینێ كوڕەكەی گەورە بووەو پێویستی بە هاوسەرگیریی هەیە ئەمیش لەتوانایدایە ژنی بۆ بێنێ لەسەری واجبە ژن بۆ كوڕەكەی بێنێ، لەمەشدا پشتی بەو فەرموودەیە بەستابوو كە لە ئەبو سەعیدی خودری و ئیبن عەبباسەوە گێڕراوەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {من ولد له ولد، فليحسن اسمه وأدبه، فإذا بلغ فليزوجه، فإن بلغ ولم يزوجه فأصاب إثما فإنما إثمه على أبيه}[1] واتە: هەر كەسێ خوا كوڕێكی پێ بەخشی، با ناوێكی خۆشی لێبنێ و فێری

---

(١) شعب الأيمان لأبو بكر البيهقي، ج٦، ص ٤٠١.

ئەدەبێکـی جوانـی بـکات، هـەر کاتێکیـش باڵـغ بـوو ژنـی بـۆ بێنـێ، ئەگـەر کوڕەکـەی باڵـغ بـوو ژنـی بـۆ نەهێنـا بەهـۆی ئەمـەوە تووشـی گوناهێـك بـوو، گوناهەکـەی لـە ئەسـتۆی باوکیەتـی.

گوێـی بەو قسـانەش نـەدەدا کە دەربـارەی بێهێزیی فەرمایشـتەکە دەگوتـرا، کاتێـك لەبـارەی هاوسـەرگیریەوە قسـەی لەگـەڵ کـردم، توشـی شـۆك بـووم و چاوەڕێـی پێشـنیارێکی لـەو جـۆرەم لـە باوکـم نەدەکـرد، پێشـتر نـە بیـرم لـێ کردبـووەوەو نـە زەمینـە سازیشـم بـۆ کردبـوو، داوای لێبوردنـم لـێ کـردو بـۆم دووپـات کـردەوە کـە حـەز بـە هاوسـەرگیری ناکـەم، بـەڵام باوکـم سـوور بـوو لەسـەر بۆچوونەکـەی خـۆی، هەروەهـا هەنـدێ لاپـەڕەی لـە کتێبـی ئیحیای ئیـمام غەزالـی بـۆ خوێندمـەوە لەبـارەی پێویسـتی هاوسـەرگیری و سـوودەکانی، گەیشـتمە ئـەو بڕوایـەی کـە سـوور بوونـی من لەسـەر ئەنجـام نەدانـی هاوسـەرگیری بەرامبـەر بـە پێداگیـری ئـەو لەسـەر بـە ئەنجـام گەیاندنـی پڕۆسـەکە گەیشـتۆتە جۆرێـك لـە ئەزیـەت دان و پێشـێل کردنـی مافەکانـی ئـەو، لەبـەر ئـەوە ڕازی بـووم.

چـووە داوای خوشـکی خێزانەکـەی کـە چەنـد سـاڵێکیش لەخـۆم گەورەتـر بـوو، بـەڵام هـەر ڕازی بـووم لەبـەر گوێڕایەڵیـم بـۆ حـەزو ویسـتی ئـەو لەلایـەك، لەلایەکـی تـر وەك جێبەجـێ کردنـی فەرمانەکانـی ئـەو، زۆر چاکیـش دەمزانـی باوکـم بـە قۆناغێکـی دەسـتکورتیدا تێدەپـەڕێ کەمتریـن ئـەو پارەیـەی کـە بـۆ هاوسـەرگیری پێویسـتە ئـەم لەدەسـتیدا نیـە.

بیـرم دێ کـە بەشـێکی زۆری کتێبەکانـی کتێبخانـە گەورەکـەی خـۆی فرۆشـت، بـۆ ئـەوەی ئـەو بـڕە پارەیـە دابیـن بـکات کـە

پێویستە بۆ ئەنجامدانی هاوسەرگیریەکەی من، بەم جۆرە هاوسەرگیریم کردو هاوسەرگیریەکەشم بووە مایەی خێرێکی گەورەو قەڵایەکی باش بۆ پاراستنم لە گوناح.

لە گرنگترین ئەو شتانەی کە دڵی منی کردەوەو ئاسودەی کردم لەوەی کە گوێڕایەڵی باوکم کرد لەبارەی ئەو هاوسەرگیرییە ئەوە بوو کە: {نزیکەی دوای هەفتەیەك لە هاوسەرگیری کردنم بەیانیەکیان دوای ئەوەی باوکم لە نوێژی بەیانی گەڕایەوە لە دەرگای ژوورەکەی دام، من خەوتبووم، لەبەر دەرگاکەوە بە دەنگێکی بەرز بانگی کردم، ئەوە تۆ تا ئێستا نوستووی؟! لە کاتێکدا ئەو موژدە دڵخۆشکەرانەی هەن لەبارەی تۆوە شایستەی ئەوەن تا بەیانی لە سوجدە بردن دابیت و شوکرانە بژێری خوای پەروەردگار بکەی}!!

لەگەڵ بانگ کردنەکەی ئەو لەخەو هەڵسام، لە ژورەکەم چوومە دەرەوەو پرسیارم لەبارەی ئەو موژدە دڵخۆشکەرە لێکرد کە پەیوەندی بەمنەوە هەبوو؟ گوتی: {ئەمشەو لە خەونمدا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بەرەو ڕووم دەهات لەگەڵ کۆمەڵێك پیاوی دیکە وا دەزانم لە هاوەڵانی بەڕێز بوون، پێی فەرمووم: هاتوین پیرۆزبایی لە سەعید بکەین بەبۆنەی هاوسەرگیریەکەی}.

ئەو موژدە خۆشە یەکەم شتێك بوو لەبارەی هاوسەرگیری کردنەکەمەوە دڵخۆشم بکات، دوای ئەو بەخششەو تا ئەمڕۆشی لەگەڵدابێ خوای پەروەردگار خێری زۆری بەسەردا باراندووم.

## گەڕانەوەم بۆ پەیمانگەی ئاڕاستەی ئیسلامیی:

تــا ســەرەتای ســاڵەكانی (١٩٥٣) هــەر لــەو مزگەوتــەدا مامــەوە كــە دواتــر ناوەكــەی گــۆڕا بــۆ پەیمانگــەی ئاڕاســتەی ئیســلامیی، بــەردەوام خەریكــی دەرس و دەور بــووم، بەڕاســتی لەمــاوەی ئــەو چەنــد ســاڵەدا ســوودێكی زۆرم وەرگــرت، مــن ئــەو ماوەیــە بــە بناغــەو بنچینــەی خــۆم دەزانــم لــەڕوی كاروانــی زانســتخوازیم، زۆربــەی ئــەو قوتابیانــەی لــەوێ لەمــن گەورەتــر بــوون بوونــە مامۆســتام، ئەمــە ســەرەڕای هــەردوو مامۆســتاو موڕشــیدی گــەورە كــە زانســت و زانیــاری و ســوودی زۆر زۆرم لێیــان وەرگــرت ئەوانیــش باوكــم و مامۆســتاكەم شــێخ حەســەن حەبەنكەلەیدانــی ڕەحمەتــی خوایــان لێبــێ.

بــەڵام ئەندازەگیــری شــاراوەی خوایــی تووشــی شــۆكی كــردم بــەوەی كــە لەكۆتاییــدا منــی گەیانــدە نێــو ئــەو چوارچێوەیــەی كــە نەدەتوانــرا ببــڕدرێ، ئــەو ئەنــدازە گیریــە خواییــەی باســی دەكــەم بــەم شــێوەیە بــوو:

مــاوەی دەرس خوێندنــم لــەو مزگەوتــەدا تــەواو بــوو كــە دواتــر گــۆڕدرا بــە پەیمانگەیەكــی شــەرعی حكومــی، ڕاســتەوخۆ دوای ئەوە داوای خزمەتــی ســەربازیم لــێ كــرا[١]، هیــچ ڕێگایەكــم لەبەردەمــدا نەبــوو بــۆ پاشخســتنی ئــەو كارە جگــە لــەوەی لــە خوێندنــدا بــەردەوام بــم و لەســەر ئاســتی زانكۆیەكــی بــاوەڕ پێكــراو درێــژە بــە

---

(١) ئەو كات تاكە كەسێك نەبوو لە خزمەتی سەربازیی ببەخشرێ.

خوێندنم بدەم، ئەو كات هێشتا لە زانكۆی دیمەشقدا كۆلێژی شەریعە نەكرابوویەوە، بۆیە تاكە ڕێگا بۆ پاشخستنی ئەو خزمەتە سەربازییە ناچاركەرە ئەوەبوو پەیوەندی بە كولێژێك لە كۆلێژەكانی زانكۆی ئەزهەر بكەم!!

باوكم نوێژی ئیستیخارەی كردو ڕاوێژیشی كرد، كارەكە لەڕووی ئەودا چەند تەگەرەیەكی هەبوو، وریای كردمەوە لە هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی بڕوانامەو گەڕان بەدوای وەزیفەیەك واتە: وریای كردمەوە لەوەی نیەتەكەم خڵتەی تێ بكەوێ، یەكێكی دیكە لەو شتانەی باوكم بە كۆسپ و تەگەرەی دەزانی مەترسی هەبوو لەو شتانەی كە دەیبیست لەبارەی بارودۆخی وڵاتی مصرو زۆری خراپەكاریی و فەساد لەو وڵاتە، بەڵام ئەی چارە چیە؟ بەرامبەر بەمە جگە لە تاكە بژاردەیەك هیچ بژاردەیەكی دیكەی لەبەردەمدا نەبوو.

لەكۆتاییدا تێبینی ئەوەم كرد ڕێكخستنێكی خوایی لەسەرووی ویست و ڕێكخستنی باوكمەوە كارەكە ڕایی دەكات، بێگومان ئەو ڕێكخستنە خواییانەش كە ئینسان هیچ دەستێكی تێیاندا نیە خێرێكی گەورەیان بۆ ئینسان پێوەیە.

هیچ ڕێگایەكی دیكە نەمایەوە ئەوە نەبێ ئەو شتە هەڵبژێرم كە هیچ بەدیلێكی دیكەم بۆی نەبوو، باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ ماوەیەكی دورو درێژ ئامۆژگاری كردم، زۆر ئەوەی بیر دەخستمەوە چونم بۆ ئەزهەر بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامە نەبێ، هەروەها لەپێناو بەدەست هێنانی وەزیفەیەك نەبێ لە داهاتوودا،

منیش ئەو پەیمانەی کە پێشتر بەباوکمم دابوو بۆم دووپات کردەوە، دڵنیاییم پێدا لەبارەی نییەت و مەبستم لە چوونم بۆ ئەزهەر، دواتر سەفەرەکەم ئەنجامداو پەیوەندیم کرد بە کۆلێژی شەریعەی زانکۆی ئەزهەر.

ڕۆژگار تێپەڕی مۆڵەتی کۆلێژی شەریعەی زانکۆی ئەزهەرم بەدەست هێنا لە ساڵی (١٩٥٦)، بە پابەند بوون بەو پەیمانەی بە باوکمم دابوو گەڕامەوە دیمەشق، لە کۆتایی هەمان ساڵ وەزارەتی پەروەردە پێشبڕکێی بۆ دەرچووان پێشنیار کرد بۆ ئەوەی هەلی دامەزراندن بدات بەوانەی کە شایستەیی ئەوەیان تێدایە وانەکانی ئاین بڵێنەوە لە ناوەندی و ئامادەییەکان، هەموو ئەوانەی منیان دەناسی و هاوڕێکانم بە تایبەتی هانیان دام بەژداری ئەو پێشبڕکێیە بکەم، جەختیان لەوە دەکردەوە کە ئەمە هەلێکەو بۆم هاتۆتە پێش پێویستە بیقۆزمەوە، بەڵام من بێ دوودڵی داواکانیانم ڕەت کردەوە، پێم گوتن: من نامەوێ بەژداری بکەم، لەو لاوە باوکم هەستی بەو فشارو داواکاری و پێشنیارانەی دۆستان و هاوڕێیانم کرد، پاساوی من بۆ ڕەت کردنەوەی داواکاریەکانیان ئەو پەیمانە بوو کە باوکم لێی وەرگرتبووم لەهیچ وەزیفەیەکدا پشك و بەشم نەبێ، منیش پابەند بوونی خۆم بەو پەیمانە دووپات دەکردەوە، پێم دەگوتن کە هەرگیز پەیمانەکەم هەڵناوەشێنمەوە.

ئەوەی کە زۆر نامۆ بوو بەلامەوەو تا ئەمڕۆش هیچ لێکدانەوەیەکم بۆی نیە، ناشزانم هۆکارەکەی چیی بوو، باوکم

ڕەحمەتی خوای لێبێ ساڵێك دوای ئەوە بۆچوونی خۆی گۆڕی، مۆڵەتی دام دابمەزرێم، نەك هەر ئەوە بەڵكو داوای لێكردم بەژداری ئەو پێشبڕكێیە بكەم كە لەو ساڵەدا ڕاگەیەنرابوو، منیش ڕاستەوخۆ دوای مۆڵەتەكەی ئەو بەژداری پێشبڕكێكەم كردوو دەرچووم، هەر لەو ساڵەشدا دەستم كرد بە وانە گوتنەوە[١].

پێویستە لێرە ئاماژە بەوە بكەم كە خوای پەروەردگار هەرگیز منی زایە نەكرد، وازی لێ نەهێنام ببم بە بار بەسەر خەڵكی، وەك ئەوەی هەندێ لە هاوڕێ و نزیكانم منیان پێ دەترساندو دەیانگوت: تۆ لە داهاتوودا نابی بەهیچ، بە پێچەوانەوە بەشێوازێك نیعمەتەكانی خۆی بەسەردا ڕژاندم كە نەتوانم سەرژمێریان بكەم، ئەو شتانەشی پێ بەخشیم كە خۆم چاوەڕێم نەدەكرد، هیچ یەكێك لەو بەخششانەش بە پلان و بەرنامەڕێژی من و باوكم نەبوون، هەرگیز چاوەڕێی ئەوە نەبووم ئەو شتانە ڕوویدات، بەڵام ئەوەی ڕوویدا بەرجەستە كردنی ڕاستی و

---

(١) لەوانەیە حیكمەت لەو كارەی باوكم ئەوەبووبێ بێنیازبم لە دڵ پەیوەست بوونم بە وەزیفەوە، واتە: ویستبێتی ئارەزووی پەیوەست بوون بە وەزیفەم لەدڵدا دەربێنێ، بۆ ئەوەی ئاین و شەریعەتی خوا نەكەمە هۆكاری بەدەست هێنانی دونیا، باوكم وای دەبینی ئەم كارە تاوانێكی گەورەیە بەرامبەر بە خوای گەورە، دوای ئەوەی ئەو باوەڕەی لا درووست بوو گەیشتوومەتە ئەو ئاستەی ئەو دەیەوێ، ئەوكات وای بەباش زانیوە نەبێتە بەربەست لەوەی وەزیفەیەكی ئاینیم هەبێ، وەزیفەیەك كە خۆی بەشوێنمدا بێ، نەك من ئاین و زانستی شەرعی بكەمە هۆكارێك بۆ ئەوەی شوێن بەدەست هێنانی وەزیفە بكەوم و بەدەستی بێنم.

دروستـی ئـەو ئایەتـە بـوو کـە خـوای پـەروەردگار دەفەرمـووێ: ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ﴿٣﴾ ﴾[1] الطلاق، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی هەنـدێ لـەو هاوڕێیانـەی منیـان دەترسـاند گوایـە لـە داهاتـوودا نابـم بەهیـچ خۆیـان زۆر خراپتریـان بەسـەرهات لـەوەی کـە بۆمنیـان چـاوەڕێ دەکـرد!!

**ڕاهێنان و پەروەردە کردنی خێزان و منداڵەکان لەسەر زیکرو یادی خوای بەرزو مەزن:**

لایەنـی بەهێـزو جیاکـەرەوەی باوکـم لـە پـەروەردە کردنـی مـاڵ و منداڵەکانـی بریتـی بـوو لـەوەی لەهەمـوو بۆنەیەکـدا خـوای پـەروەردگاری بیـر دەخستینەوە، بـۆ هـەر حـاڵ و بـارو دۆخێـك کـە ڕووی دەکـردە مـاڵ و منداڵەکـەی بەپێـی بارودۆخەکـە خـوای پـەروەردگاری بیـر دەخسـتنەوە، هەنـدێ جـار پێویسـتی دەکـرد سـیفەتی بەخشـەریی خـواو، هەنـدێ جاریـش بەزەیـی بوونـی خـوای بیـر دەخسـتنەوە بەپێـی بـارو دۆخەکـە.

کاتـێ خـواردن لەسـەر سـفرە دادەنـرا ئێمـەش لەگـەڵ ئـەودا بـەدەوری سـفرەکە کـۆ دەبووینـەوە فەرمانـی بەهەمووومـان دەکـرد بـە ئەدەبـەوە دابنیشـین، وەك ئـەوەی ئێمـە لەسـەر ئـەو سفرەیەدا لەبەرامبـەری خوابیـن، زۆربـەی کات بـەو پـەڕی ئیمانـەوە ڕەنگـی

---

(١) واتـە: جـا ئـەوەی لەخـوا بترسـێت و پارێـزکار بێـت، ئـەوە خـوا دەرووی لـێ دەکاتـەوە، لەشـوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پـێ دەبەخشـێت کـە حیسـابی بـۆ نەکردبێت.

خواردنەكانی بۆ وەسف دەكردین، دەیگوت: ئەمەیان ڕەنگێكە، ئەمە ڕەنگێكی ترە، ئەمەشیان ڕەنگێكی تر، یەك یەك ڕەنگی خواردنەكانی پێشان دەداین و پاشان دەیگوت: ئایا پرسیار ناكەن؟ خوای كاربەجێ چی بۆ ئێمە دروست كردووە؟ ئێمە كێین، بەهاو نرخی ئێمە چییە تا خوای پەروەردگار بەو هەموو بەخششە زۆرەی خۆیەوە ڕێزمان لێ بنێ؟ پاشان ئەو ئایەتەی دووبارە دەكردەوە كە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ ﴾[1] التكاثر، گەورەو بچووك كاریگەر دەبوون بەو قسانەی ئەو، چەندین جار هەستم دەكرد بەڵكو هەموومان هەستمان دەكرد كە ئێمە نان دەخۆین بەڵام لەهەمان كاتدا لەنێو عیبادەت داین.

بۆ ماوەی دەیان ساڵ باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ هەموو بەیانیانی ڕۆژانی دوو شەممەو پێنج شەممە دوای نوێژی بەیانی لەسەر چەند ویردێك لە زیكرو یادی خوای پەروەردگار كۆی دەكردینەوە، دوای نوێژی بەیانیان گەورەو بچووك لێی كۆ دەبوونەوە، دەستیان دەكرد بە زیكری (لا إلە الا اللە) سەد جار، پاشان سەد جاری دیكە لەفزی (الله)یان دەگوت[2]،

---

(١) واتە: پاشان سوێند بەخوا لەو ڕۆژەدا پرسیارتان لێ دەكرێت دەربارەی هەموو نازو نیعمەتەكانی دنیا (چۆنتان پەیدا كردووەو لەچیدا بەكارتان هێناوە).

(٢) با ئەو موناقەشەو دەو دەوانییەی هەندێ خەڵك دەیكەن لەبارەی دروستی و نادروستی زیكری (اللە) ساردت نەكاتەوە لە سافی و ڕونی ئەو هەقیقەتە كە هیچ مسوڵمانێكی ڕاستگۆ لە مسوڵمانێتیەكەی

پاشـان حیزبـی ئیـمام نـەوەوی دەخوێنـدو ئەوانیـش لەگەڵیـان دەگوتـەوە، کـە بریتیـە لـە کۆمەڵێـك دوعـاو پاڕانـەوەو هانـا بـردن و سـتایش کردنـی خـوا، دوای ئەنجامدانـی ئـەو زیکـرو ویردانـە لەسـەر خـۆی پێویسـت کردبـوو کـە چەنـد درهەمێـك یـان چەنـد حەلوایەکیـان پـێ بـدات ئەگـەر کەمیـش بـێ، هەروەهـا هەموومانی ئامـۆژگاری دەکـرد واز لـەم شـێوازەی خوێندنـی وێـردو زیکرانـە نەهێنیـن، سوپاسـی خـوای پـەروەردگار دەکـەم تـا ئەمـڕۆش یارمەتـی داویـن هـەم مـن و هـەم منداڵەکانـی دیکـەی و هـەم نەوەکانـی پابەندیـن بـەو ئامـۆژگاری و وەسـیەتە.

ئەوانـەی دوای خوێندنـەوەی ئـەم کتێبـە پابەنـد بوونـی خۆیـان بـەو زیکـرو وێردانـە پـێ ڕاگەیانـدم، پێیـان گوتـم: بەهەمـان شـێوە ئـەو کارە ئەنجـام دەدەن، زۆر دڵخۆشـیان کـردم، ئەرکێکـی ئاسـان و بـێ مانـدو بوونـە، بـەڵام سـەرەڕای ئاسـانیەکەی شـوێنەواری گـەورە لەناخـی ئینسـاندا جێدێڵـێ، هەمـوو ئەوانـەی ئـەم زیکـرو وێردانەیـان کـردووە، بەرەکەتـی کارەکەیـان لـە نێـو مـاڵ و خێـزان و منداڵەکانـی خۆیـان هەسـت پـێ کـردووە، شوێنەوارەکەشـی بریتیـی بـووە لـە دڵخۆشـی و ئاسـودەیی لەنێـو ماڵەکانیانـدا.

---

خۆشەویسـتی خـوای لەدڵـدا جێگیـر بووبـێ لای شـاراوە نیـە ئـەم زیکـرە چ کاریگەریەکـی هەیـە، ئـەو بەڵگەیـە بەسسـە بـۆ ئـەوەی دڵـت ڕزگار بـکات لـەو موناقەشـەو قسـەڵۆکە ماندووکـەرە، کـە خـوای پـەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ﴿٨﴾ ﴾ المزمل. یەکـەم نـاو لەناوەکانـی خوای بـەرز لەفـزی جەلالـە (الله)یـە، کـە ناوێکـی تاکـە، سـەرم سـوڕ دەمێنـێ لـەو کەسـەی کـە نکوڵـی لـە فەرمانێـك لـە فەرمانەکانـی خـوای گـەورەدا دەکات، بـێ ئـەوەی هەستیشـی پـێ بـکات.

وا ئەزانم پێویست دەكات هەم وەك گەیاندنی ئەمانەتێك، هەم بابەتەكەش ئەوە دەخوازێ ئەم بەسەرهاتەی خوارەوە بێ كەم و زیادو وەك خۆی بۆ خوێنەر بگێڕمەوە:

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ نزیكەی ساڵ و نیوێك بەر لە وەفاتی كە تازە لە نەخۆشیەك چاك بووبویەوەو هێشتا شوێنەواری نەخۆشیەكەی پێوە مابوو، چوو بۆ ماڵی برادەرێكی لە (بلودان)، منیشی لەگەڵدا بوو هەر لەماڵی ئەو برادەرەیدا یەكێ لە ڕۆژەكانی دووشەممە یان پێنج شەممە بوو، دوای نوێژی بەیانی بەدەوریەوە دانیشتین، ئەو زیكرو وێردانەی خوێند كە لەسەرەوە باسم كرد، خانووەكە فراوان بوو ئێمە لە ژوورێكی سەرەوەی خانووەكە بووین، دیار بوو كاتێكی زوو بەر لە خۆرهەڵات ئافرەتان بۆ ڕایی كردنی كارەكانی لادێ هاتبوونەدەر ئێمەش دوای ئەوەی لە وێردو زیكرەكانمان تەواو بووین و خۆرهەڵات دونیا ڕوناك بوویەوە، یەكێ لەدەرگاكەی دا، چەند كچێكی دراوسێكان بوون هاتبوون پرسیار لە شتێك بكەن كە ئەو بەیانیە بینیبوویان و تووشی سەر سوڕمانی كردبوون.

گوتیان: لە دوای نوێژی بەیانی لەكاتێكدا دونیا تاریك و ڕوون بوو باڵندەی زۆرمان بینی ڕەش یا سپی بوون من بیرم نایە كامەیان گوت، لە پەنجەرەی ئەو ژوورەوە كە ئێمە لەو كاتەدا زیكری خوامان تێدا دەكرد پۆل پۆل دەهاتنە دەرەوە، ئێمەش گوتمان: هەستمان بە شتێكی لەو جۆرە نەكردووە، بەڵام لەو كاتەدا كە ئێوە باسی دەكەن ئێمە هەموومان لە ژوورەكەدا

خەریكی زیكرو یادی خوای گەورە بووین، سەریان سوڕمابوو لەوەی چۆن ئێمە ئەو هەموو باڵندەیەمان نەبینیوە لەكاتێكدا لەپەنجەرەی ژوورەكەی ئێمەوە بەرەو دەرەوە ڕۆیشتوون!!

**ئەو جۆرە پەروەردەیە چ شوێنەوار و كاریگەریەكی لەسەر ئێمە جێهێشت؟**

لە ڕاستیدا هیچ یەكێك لە ئێمە نەبوو لەڕووی هەست و سۆزو هەڵس و كەوتەوە شوێنەوارو كاریگەری ئەو پەروەردە جوانەی باوكمی لەسەر دەرنەكەوتبێ، تا ئێستاشی لەگەڵدابێ بەردەوامین لەسەر ئەنجامدانی.

ئێستاش زۆر چاكم لەبیرە ئەو ڕۆژەی كە هەستم كرد پێگەیشتووم و باڵغ بوومە چ ڕۆژێكی جیاوازو تاك بوو لە ژیانمدا، بەیانیەك لەخەو هەڵسام هەستم كرد ئیتر گەورەبووم و گەیشتوومەتە تەمەنێك كە تەمەنی تەكلیفی شەرعییە، ئیتر تەمەنی بچووكی و منالێم بەسەرچوو، ئەو كاتە هەست و شعورێكی زۆر غەریب و نامۆ هەموو گیانی داپۆشیم، شەپۆلێك لە ئەسەف و تەنیایی بەناخمدا دەهات و دەچوو، بۆم دەركەوت ئێستا گەیشتوومەتە قۆناغێك ئیتر بەرپرسیارێتیم لە ئەستۆدایە، ئێستا ئیتر لەتەمەنێكدام پەڕاوێك بەناوی منەوە كراوەتەوە، بۆ ئەوەی لێرە بەدوواوە بەوردی چاودێری كارو كردەوەكانم بكرێ و لەو پەڕاوەدا تۆمار بكرێن، لەمەودوا دەبمە خاڵی چاودێری دوو فریشتە و وردو درشتی كردەوەكانم تۆمار دەكەن،

ئـەو ڕۆژە لەقوڵپـەی گریانمـدا، نەمدەتوانـی بەسـەر گریانمـدا زاڵ بـم، چارێکـم نەبـوو جگـە لـە هانـا بـردن بـۆ باوکـم!!

بەڵـێ ئەوەبـوو چوومـە ژوورەکـەی و هەواڵـم پێـدا لەبـارەی ئـەو شـتەوە کـە بەسـەرم هاتبـوو، هەسـت و شـعوری خـۆم پـێ ڕاگەیانـد، بەشـێوەیەك گریـان تێکـەڵ بـە قسـەکانم بووبـو لەبـەر گریـان نەمدەتوانـی بەجوانـی قسـان بکـەم.

باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبێ هێمـن و ئارامـی کردمـەوە، ئەوەی بـۆ ڕوون کردمـەوە کاتـێ ئینسـان دەگاتـە ئـەو تەمەنـە ئیـتر ئـەو خێـرو پاداشـتانەی لەسـەر کردەوەکانـی وەری دەگـرێ زۆر زیاتـرن لـەو خراپیانـەی کـە ئەگـەری ئـەوە هەیـە تووشـیان ببـێ، هەواڵـی پێـدام بـەوەی وەرگرتنـی پاداشـت و ڕێگاکانـی گەیشـتن بەخـواو بەدەسـت هێنانـی ڕەزامەنـدی خـوا لـەو کاتـەوە دەسـت پـێ دەکـەن کـە ئینسـان دەگاتـە ئـەو تەمەنـە کـە ئێسـتا تـۆی تیـای.

مـن ئێسـتا بیـر دەکەمـەوە سـەیرم بـەوە دێ ئـەو ڕۆژە چـۆن توانیومـە لەگـەڵ باوکـم دابنیشـم و ئـەو بابەتـەی بـۆ بـاس بکـەم! لـە کاتێکـدا تـا ئێستاشـی لەگەڵـدا بـێ گەنجـەکان ئـەو شـتە لـە خێزانەکانیـان دەشـارنەوە؟! ئـەوەی وای لێکـردم ئـەو سـنوری شـەرمە بشـکێنم ئـەو ئاگـرە بـوو کـە لەناخمـدا گڵپـەی سـەند، هیـچ ڕێگایەکـم نەبـوو بـۆ دامرکاندنـەوەی، جگە لـە پەنـا بـردن و ئـاگادار کردنـەوەی بـۆ باوکـم.

بـەڵام پرسـیارەکە ئەوەیـە ئـەو هەسـت و شـعورەی لـەو کاتـەدا بـۆم درووسـت بـوو لـە چییـەوە سـەرچاوەی گرتبـوو؟ کـێ بـوو ئـەو

ئاگـرەی لـە ناخمـدا هەڵكردبـوو؟ بـە دڵنیاییـەوە دەڵێـم ئەمـە ئـەو پـەروەردە خواییـە بـوو لـە باوكمـەوە وەرم گرتبـوو، لـەو پـەروەردە جوانـەوە سـەرچاوەی گرتبـوو كـە باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ شـەوو ڕۆژ درێخـی لـێ نەدەكـرد.

باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ بـۆ پـەروەردە كردنـی ئێمـە تەنیـا پشـتی بـە ئەزبەركردنـی زانسـت و فێـر كردنـی ڕیوایـەت و گێڕانـەوە نەبەسـتبوو، بەڵكـو هەوڵـی دەدا ئـەو زانسـت و زانیاریانـە ببنـە هـۆكاری خۆشویسـتن و لـێ ترسـان و تەعزیمـی خـوای پـەروەردگار، باوكـم ئـەو جـۆرە زانسـتەی لـە ئێمـە دەویسـت كـە ببێتـە هـۆكاری بەرجەسـتە كردنـی ئیـمان لەنێـو هەسـت و شـعورماندا، هـەر لەبـەر ئەمـەش ئەوەنـدە گوێـی بـەوە نـەدەدا كـە هەنـدێ جـار لەبـارەی منـەوە بـۆی دەگەڕایـەوە چەنـدە لـە خوێنـدن و نووسـیندا بـەرەو پێـش چوومـەو بـەردەوام گرنگـی بـە زانسـتخوازی دەدەم و هـەوڵ و كۆششـی زۆر لەپێنـاو بەدەسـت هێنانیـدا خـەرج دەكـەم، ئەمـە زۆر بـەلای ئـەوەوە گرنـگ نەبـوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا بـەردەوام وەسـیەتی ئێمـەی دەكـردو ئامـۆژگاری دەكردیـن دەسـت بـە زانسـت و زانیاریـەوە بگریـن، وەك پێشـتر باسـم كـرد ڕۆژێكیـان تـازە منـی دەبـردە بـەر خوێنـدن پێـی گوتـم: ڕۆڵـە! بیـرم كردۆتـەوە ڕێگـەی گەیشـتن بەخـوا زانیـاری و شـارەزا بوونـە لەبـارەی خـوای گـەورەو پاشـان ئاینەكـەی، بـەڵام پەیامـی باوكـم ئەوەبـوو كـە زانسـت لەگـەڵ ئـەو هەمـوو گرنگییەشیدا دەبـێ وەكـو هـۆكار سـەیر بكـرێ نـەك ئامانـج.

بەدڵنیاییەوە ئەو چاودێری نیازو مەبەستی نێو ناخی منی دەکرد لە وەرگرتنی زانستدا، ئایا لەخۆمدا بەرجەستەم کردووە یان نا؟ بۆ ئەو مەبەستە ڕۆژێکیان بانگی کردم داوای لێکردم شتێکی بۆ بنووسم لەبارەی ئەو خۆشەویستی و هەست و شعورو لایەنە شاراوانەی تا ئێستا پێی گەیشتووم بەرامبەر بەخوا، جا بەشێوازی شیعر بێ، یان بە چەند ڕستیەك بێ، بیرم نایە ئەوکات تەمەنم چەند بوو، بەڵام داوای لێبوردنم لێ کرد پێم ڕاگەیاند کە هێشتا لەبارەی ئەو بابەتانەوە شتێکی ئەوتۆم نیە بینووسم، کە ئەمەم پێگوت زۆر توڕە بوو لەو داوای لێبوردنەی من، وا پێدەچوو هەست بەوە بکات ئەو داوای لێبوردنەی من بەڵگەی ئەوەبێ کە هەموو ئەو هەوڵ و کۆششانەی لەپێناوی پەروەردە کردنی مندا داویەتی بەبا چووە.

ڕۆژگار تێپەڕی، بەڵکو ساڵان تێپەڕین، دڵ و ناخم ئاوی خواردەوە لەبارەی ئەو هەست و سۆزو خۆشەویستیەی کە باوکم بەشوێن ئاسەوارەکەیدا دەگەڕا لەناخی مندا، ئەو هەست و سۆزەش پەلکێشی کردم بۆ ئەوەی هەڵوەستەو تێڕامانێك بکەم لەبەرامبەر ئەو ئومێدو هیواو خۆشەویستیەی لەبەرامبەر خوادا بۆم دروست بووبو، دواتر ئەو هەست و سۆزو شعورە بای ئەوەندە پەنگی خواردەوە لەناخمدا تا بتوانم تۆماریان بکەم و بیاننوسمەوە لەژێر ناوونیشانی: {ڕازو نیازی دڵێکی شکاو}.

بەباوکم گوت: بیرتە ڕۆژێك داوای ئەوەت لێکردم لەبارەی ئەو خۆشەویستیەوە کە لە هەست و ناخمدا هەیە بەرامبەر

بەخـوا شـتێکت بـۆ بنوسـم، منیـش دوای لێبوردنـم لـێ کـردی؟ گوتـی: بەڵـێ لەبیرمـە، گوتـم: ئەوەتـا ئەمـڕۆ ئـەو هەلـەم بۆ ڕەخسـاو خـوای پـەروەردگار ئـەو دەرفەتـەی پێـدام ئـەو شـتە بنووسـم کـە داوات لـێ کردبـووم، پێـم گـوت کـە: (مـن چاوەڕێـی ئـەوەم دەکـرد بتوانـم بەڕاسـتگۆیی و هەڵچوونێـك کـە لەناخمـدا درووسـت دەبـێ ئـەو شـتە بنوسـم، نـەك کەسـێکی تـر داوام لـێ بـکا، یـان بـە خـۆ خەڵەتانـدن و فشـار خسـتنە سـەر خـۆ ئـەو شـتە بنووسـم)، دواتـر نووسـینەکەمم بـۆ خوێنـدەوە، ئەوەنـدە پێـی دڵخـۆش بـوو لەخۆشـیان ڕووی گـەش بـووەوە ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ.

## پەرستشەكانی، دونیا بەكەمگریەكەی، خۆپاراستنی لە قەدەغەكراوەكان

وەك پێشتر ئامـاژەم پێكـرد باوكـم هـەر لەسـەرەتاوە زۆر بـەلای گـەڕان بـەدوای زانسـت و زۆر ئەنجامدانـی پەرستشـەكانەوە دەچـوو، لەمەسـەلەی ئەنجامدانـی پەرستشەكانیشـدا تـاك بـوو لەنێـو هاوڕێكانـی.

لەڕاسـتیدا ئـەو بـەرەو عیبـادەت چوونـەش وردە وردە لەدەروونی باوكمـدا زیـادی دەكـرد لەگـەڵ زیـاد بوونـی تەمـەن و زیـاد بوونـی ئەزمـوون و ڕووداوەكان، ئـەو ژیانـەی ئـەو پێیـدا تێدەپـەڕی وای لێ دەكـرد زیاتـر هەسـت و شـعور بـە چاودێـری و پاراسـتنی خوایـی و فـەزڵ و بەخششـەكانی بـكات، زیاتـر قـوڵ دەبوویـەوە بـەوەدا كـە چـۆن خـوای كاربەجـێ لـە پێشـهاتە خراپەكانـدا دەیپارێـزێ و لەسـەری لادەبـا، ئـەو هەسـت و شـعورە زۆرەی ئـەو بەرامبـەر بـە منـەت و فـەزڵ و بەخششـی خـوای گـەورە زیاتـر پاڵـی پێـوە دەنـاو هانـی دەدا خـۆی یـەكلا بكاتـەوە بـۆ خـوای پـەروەردگارو خەریكـی عیبـادەت كـردن و وەسـتان بـێ لەبـەر دەسـتیدا.

ئەمـە لەگـەڵ ئـەوەدا كـە بەندایەتی و پەرسـتش لەژیانـی باوكمدا بەتەنهـا كـورت هەڵنەهاتبـوو لەچەنـد عیبادەتێكـی دیـاری كـراو، بەڵكـو حـاڵ و بـارو دۆخـی ئـەو جـۆراو جـۆر بـوو، بەگوێـرەی

جۆراو جۆری عیبادەتەكان، هەموو ئەو كارانەی كە ڕۆژانە ئەنجامی دەدان ڕەنگ كرابوون بە بەندایەتی كردن بۆخواو خۆیەكلا كردنەوەو ترس و ستایشی خوا.

لەوانەیە كەسانێك ئەم قسانەی سەرەوە بخوێننەوە وا گومان ببەن زێدەڕۆیی تێدایە، من تكا لەو برایانە دەكەم كە گومانێكی لەم جۆرە دەبەن پێشەكی ئەم كتێبە بخوێننەوە بزانن لە پێشەكیەكەدا خۆم بە چ شتێك پابەند كردووە، لەوێ ئاماژەم پێكردووە كە: من خۆم بەدوور دەگرم لە شێوازی پێداهەڵگوتن و ناوونیشان و لەقەبی قەبەو بێ ناوەڕۆك و دوور لە ڕاستی لە وەسف كردندا، من شتێك ناڵێم و ڕوون ناكەمەوە غەیری ئەوەی كە واقیعێكەو ڕوویداوە، یان دیمەن و مەشهەدێك بووە تۆمار كراوە، لەوانەیە تا ئێرە خوێنەر تێبینی ئەوەی كردبێ من بەهیچ شێوەیەك لام نەكردۆتەوە بەلای بەكارهێنانی وشەو دەستەواژەیەك بەگەورەگرتن و پێداهەڵگوتنی تێدا بێ، پشتیوان بەخوا تا كۆتایی كتێبەكەش شێوازو مەنهەجی نووسینم هەر ئاوا دەمێنێتەوە.

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ هەموو نوێژە سوننەتە جۆراو جۆرەكانی ئەنجام دەدا، هەروەها زۆر قورئانی دەخوێند، ئەمە جگە لە ئەنجامدانی فەریزەی حەج و گەشتی عەمرە، حاڵی پێوە گرتبوون، كاتێكیش لەژوورە بچووكەكەیدا دەچووە خەڵوەتەوە قووڵ دەبوویەوەو ڕادەما لەو تەمەنەی تا ئەو كاتە هێنابووی، بیری دەكردەوە لەو كۆچەی كە خوای پەروەردگار تێیدا یارمەتیدا

هەروەهـــا ئـەو بەخششـانەی كـە بەسـەریدا باراند، زیكـرو وێردی زۆری دەخوێنـدو بەبەردەوامـی خـۆی پێـوە پابەند كردبـوون، یەكێكی دیكـە لـەو عیبادەتانـەی ئەنجامـی دەدا زیـارەت كردنـی پیـاو چـاكان بـوو، چ ئەوانـەی لەژیانـدا بـوون، چ ئەوانـەش كـە وەفاتیـان كردبوو، عیبادەتێكـی دیكـەی بریتـی بـوو لـە وتنـەوەی ئـەو دەرس و وانـە نایابانـەی كـە خەڵكێكـی زۆر ئامـادەی دەبـوون.

لێـرەوە لەسـۆنگەی چەنـد سـەرە بابەتێـك، بەكورتـی و بەئەنـدازەی ئـەوەی كـە بیـرم مـاوەو لێـی دڵنیـام باسـی عیبـادەت و پەرسـتش و ئـەو حاڵـە دەكـەم كـە تێیـدا بـوو:

**نوێژەكانی و، شەونوێژەكانی:**

نوێـژە سـوننەتەكانی زۆر ئەنجـام دەدا، چ ئـەو نوێژە سـوننەتانەی كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەسـەریان بـەردەوام بـووەو وازی لـێ نەهێنـاون كـە پێیـان دەگوتـرێ: (موئەككـەد)ە، چ ئەوانـەش كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەنجامـی داوون بـەڵام بەپچـڕ پچـڕی، لەهـەر ئاماژەیـەك یـان گێڕانەوەیـەك باسـی (كات)ێـك كرابـێ نوێـژ كردنـی تێـدا خۆشـخواز (مسـتحب)ە ئیلـلا باوكـم نوێـژی تێـدا ئەنجـام داوەو وازی لـێ نەهێنـاوە، زۆرتریـن ڕەكعاتـی تێـدا ئەنجـام دەدا، بەشـێوەیەك ئەنجامـی دەدان وەك ئـەوەی دوای ئـەم ڕكعەتانـە دونیاكـەی بەكۆتـا دێ و دەچێتـە بـەرزەخ.

بـەم شـێوەیە پێداگیـری لەسـەر ئەنجامدانـی نوێـژەكان دەكـرد مەگـەر عیللەتێـك هەبووبـێ و لـەم پابەنـد بوونـەی دووری

خستبێتەوەو نەیتوانیبێ ئەنجامیان بدات، ئەگینا ئەو نوێژانەی کە خۆشخوازن ئەنجام بدرێن هەرچۆنێك بێ ئەنجامی داوون، گوێی بەوەش نەدەدا ئایا ئەو نوێژە سوننەتە فەرمایشتی صەحیحی لەبارەوە هاتووە یان زەعیف؟ ئەو فەرمایشتانەی زەعیفیش بووبن لەبارەی نوێژی سوننەتەوە باوکم هەر کاری پێ کردوون، ئەمەش لەژێر چەتری ئەو فەرمایشتە صەحیحەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی: {نوێژ کردن چاکترین پرۆژەیە}.

سوور بوون و پێداگیری کردنی لەسەر ئەنجامدانی شەو نوێژەکانیش کەمتر نەبوو لە دەست گرتنی بە نوێژە فەرزەکان، باوکم بەوەندە ئیکتیفای نەدەکرد بەچەند دەقیقەیەك بەر لە نوێژی بەیانی هەڵسێتەوە بۆ شەونوێژ، بەڵکو سوور بوو لەسەر هەڵسان لەپێش نوێژی بەیانی بەدوو سەعات یاخود سێ سەعات، سەرەتا دوو ڕکعات نوێژی سووکی ئەنجام دەدا، پاشان ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوایە نوێژەکانی درێژ دەکردەوە، کاتێکیش دەگەیشتە سەحەر لەسەر بەرماڵەکەی دادەنیشت، خۆی دەدایە دەست هەست و شعورێکی پڕ لە حوزن و داخ و حەسرەت، داخ و حەسرەت لەسەر کەم و کوڕیەکانی، ترسیش لە داهاتوونێك کە چاوەڕێی دەکات، دەستی دەکرد بە موناجات و ڕازو نیاز کردن لەگەڵ خوا، هەندێ جار بەعەرەبی و هەندێ جاریش بەکوردی ڕازەکانی لەگەڵ خوادا دەردەبڕین، ڕازو نیازێك تێکەڵ بە هەنسکی گریان و فرمێسکی بەردەوام.

چەندین جار لەگەڵ دەنگی گریان و ڕازو نیاز گۆڕینەوەی ئەو لەگەڵ خوادا خەبەرم بۆتەوە، بەتایبەت ڕۆژانی سەرەتای گەیشتنمان بە دیمەشق، ئەو ڕۆژانەی کە هەموومان لەیەك ژوردا نیشتەجێ بووین، چەندین جار لە کاتی سەحەرو پێشی سەحەردا گوێم لێی دەبوو باسی مردن و دوای مردن و ئەو پێشهاتانەی دەکرد کە ئینسان دوای مردن پێی دەگات، دواتر بەگریانەوە ئەو بەیتە شیعرانەی لەبەر خۆیەوە دەگوتەوە(١)، ئێستاش ئەو بەیتە شیعرانەم لەیاد ماوە، دەیگوت:

يا من يرا ما في الضمير ويسمع ... أنت المعد لكل ما يتوقع
يا من خزائن ملكه في قول: كن ... أمنن فإن الخير عندك أجمع
مالي سوى قرعي لبابك حيلة ... فلئن رددت فأي باب أقرع
مالي سوى فقري إليك وسيلة ... وبالافتقار إليك فقري أدفع
حاشا لمجدك أن تقنط عاصياً ... والفضل أجزل والمواهب أوسع

ئەی ئەو کەسەی نهێنی و شاراوەکان دەبینی و دەبیستی، تۆ ئامادەکاری ئەو شتانەی کە من چاوەڕێی ڕوودانیان دەکەم، ئەی ئەو کەسەی گەنجینەی بەخشینت لە گوتنی (ببە)یە، منەتی خۆت بخە سەرم، هەموو چاکەو خێرێك لەتۆدا کۆبۆتەوە، جگە لە لێدانی دەرگاکەی تۆ ڕێگایەکی تر نازانم، ئەگەر ڕەتم بکەیتەوە چ دەرگایەکی تر بکوتمەوە، هیچ شتێکم نیە بیکەمە وەسیلەو هۆکار بۆلای تۆ جگە لە نەداری و بێدەسەڵاتیم، بەپێشاندان و دەربڕینی بێ دەسەڵاتیم بۆتۆ بێ

---

(١) ئەو بەیتە شیعرانە هی ئیمام ئەبی لقاسمە خاوەنی (الروض الأنق).

دەسەڵاتی و نەداری لەخۆمدا دەردەکەم، حاشا لە ڕێزداریی و بەخشندەییت کە گوناهبارێك بێ ئومێد بکەیت، فەزڵ و بەخششی تۆ زۆر لەوە زیاترو پێدانی تۆ زۆر فراوانترە.

پاشان نوێژەکانی ئەو وەك نوێژی هیچ یەکێك لە ئێمە نەبوو کە تەنها بەزمان وێردەکانی ناو نوێژ بڵێ لەگەڵ جوڵەی هەندێ لە ئەندامەکان، بەو شێوەی کە ئێمە ئولفەتمان پێ گرتووە، زمان و لاشەمان دەجوڵێ و دڵیشمان لەلای دونیایە، دڵ ئاگای لەو شتانە نییە کە زمان دەیڵێ، بەڵکو ئەو کاتێك دەچووە ناو نوێژەوە دەبووە یەك پارچە لە زەلیلی و بچووکی لەبەر دەستی خوا، لەمەشدا دیمەنی ڕواڵەت و ڕوخساری زەلیلی و بچووکی ناخی دەردەخست، بەڕوونی لێی بەدیار دەکەوت کە خەریکی ڕازو نیازو موناجاتە لەگەڵ خوای پەروەردگار، چەندین جار بەتەنیاو لەناو نوێژدا لە ژورەکەی خۆی، یاخود هەندێ جار لە نێو میحرابی مزگەوت و بە ئاشکرا حاڵی لێ دەهات.

شێخ خەیر ئەلعەلەبی یەکێك بوو لە قوتابی و دەرچووە یەکەمینەکانی پەیمانگای ئاراستەی ئیسلامیی بۆی گێڕامەوە: بەیانیەکیان دەچێتە سەردانی باوکم، باوکیشم داوای لێ دەکات هەندێ بەیتە شیعری بۆ بڵێ، شێخ ئەلعەلەبی پیاوێك بوو دەنگێکی حەزین و ڕۆحانی هەبوو، چەند بەیتە شیعرێکی بەدەنگێکی خۆش بۆ دەچڕێ، باوکیشم بەو پەڕی خشوع و ئەدەبەوە گوێی بۆ شل دەکات، وەك ئەوەی گوێی بۆ قورئان گرتبێ، پاشان حاڵ دەیگرێ و بەجۆرێك هاوار دەکات شێخ

ئەلعەلەبی لە دەنگی هاواری باوكم ترس دایدەگری، دوای ئەوە شێخ خەیر ئەلعەلەبی و ئاوازەكەی جێدەهێڵێ و دەست دەكات بە نوێژ كردن!.

زۆر جار باوكم ڕەخنەی لە قوتابیانی زانستی شەرعی و ئەو ئیسلامیانە دەگرت كە خۆیان لەڕیزی بانگخوازان هەژمار دەكرد لەوەدا كە بەجوانی ڕوو لەنوێژ كردن ناكەن، نوێژ كردنەكەیان تەنها جووڵەی هەندێ لە ئەندامەكانی لاشەیەو چەند لەفزێكە ئەزبەریان كردووەو دەیڵێنەوە، ڕەخنەی لەوە دەگرت كە هەندێ لەو كەسانە تەنانەت لەناو نوێژیشدا كە بەرامبەر خوا وەستاون بەجۆرێك دەوەستن وەك وەستانی كەسێك كە فەخر بەخۆیەوە بكات و سەرسامی خۆی بێ، سەری لار دەكاتەوە بەلای سەرەوەدا، قاچێكی درێژ دەكاو ئەوەی دیكە ڕاست دەكاتەوە، ئەمە لە كاتێكدا لە بارودۆخێكدایە كە پێویستە لە هەموو كاتێكی دیكە زیاتر هەست بە زەلیلی و بچووكی خۆی بكات.

**خوێندنەوەی قورئان و ئەزبەر كردنی:**

باوكم هەر لە گەنجیەوە ڕووی كردە ئەزبەر كردنی قورئان، بەڵام بەتەواوی هەمووی ئەزبەر نەكرد، تا دوای ئەوەی لە دیمەشق جێگیر بووین، دوای جێگیر بوونمان لە دیمەشق بە چەند ساڵێك، ئێستا لەیادم نەماوە چەندی خایاند قورئانی ئەزبەر كرد.

ئــەوەی گرنگــە ئەوەیــە قورئانــی زۆر دەخوێنــد، بــەر لــەوەی هەمـوو قورئـان ئەزبـەر بـكات خوێندنەوەكـەی بـەو شـێوەیە بـوو بتوانـێ هەمـووی ئەزبـەر بـكات، دوای ئـەوەی هەمـوو قورئانـی ئەزبـەر كـرد بەشـێوەیەك دەیخوێنـدەوە بتوانـێ پارێـزگاری لێ بكات و لەبیـری نەچێتـەوە، هەروەهـا بەشـێوەی ئولفـەت پـێ گرتـن و لـێ ورد بوونـەوەو تێگەیشـتن لـە مانـاو مەبەسـتەكانی دەیخوێنـدەوە.

ئـەو لەهەمـوو هەفتەیەكـدا قورئانـی خەتـم دەكـرد، خـۆی پابەنـد كردبـوو بـەوەی هەمـوو ڕۆژێـك پێنـج جوزئـ بخوێنێتـەوە، خەتمـی نوێـی لـە ڕۆژی شـەممە دەسـت پـێ دەكـرد بـۆ ڕۆژی پێنـج شـەممە واتـە: شـەوی هەینـی دەگەیشـتە كۆتایـی و خەتمـی دەكـرد، ڕۆژانـی هەینیشـی دەكـردە ڕۆژی پشـوو بـۆ ئەنجامدانـی كاروبـاری دیكـە.

هـەر لەسـەر ئـەو شـێوازەو بەرنامەیـەی مایـەوەو بـەردەوام بـوو تـا پێـش وەفـات كردنـی بەچەنـد مانگێـك، جگـە لـەو ڕۆژانـەش كـە بەهـۆی نەخۆشـیەوە نەیدەتوانـی بیخوێنێتـەوە، بەتایبـەت ئـەو نەخۆشـیەی لــە ســاڵەكانی كۆتایــی تەمەنیــدا تووشــی بــوو، دوو نەخۆشـی هەبـوو، لەیەكێكیـان چـاك بوویـەوەو بـۆ مـاوەی چەنـد سـاڵێكی دوای نەخۆشـیەكەش گەڕایـەوە سـەر كارەكانـی خـۆی و وانـە گوتنەوەكانـی، نەخۆشـیەكەی دووەمیشـی لەگەڵیـدا مایـەوەو چـاك نەبوویـەوە، هەنـدێ جـار لەسـەری قـوڕس دەكـردو هەنـدێ جاریـش لەسـەری سـووك دەبـوو تـا ئـەو ڕۆژەی وەفاتـی كـرد.

بەشـێوەی (حـەدر) قورئانـی دەخوێنـد، زۆرجـار داوای لەمـن یان یەكێكـی دیكـە لـە منداڵەكانـی دەكـرد چاودێـری حیفزەكـەی بـۆ

بـكات و لەگەڵـی بێـت، هەندێ جـار لەكاتـی پێداچوونـەوەدا ئایەتێك یـان ڕسـتەیەكی قورئـان دەیوەسـتاند، بـەو پـەڕی پـێ كاریگـەر بـوون و خشـوعەوە لـە دەلالـەت و مەبەسـتەكانی ئایەتەكـە ڕادەمـاو ورد دەبـووەوە، یاخـود بـەدوای لایەنـە شـاراوەكانی ئایەتەكـەدا دەگـەڕاو بەماناكەیـدا قـووڵ دەبویـەوە لـە سـۆنگەی كتێبەكانـی تەفسـیر.

كاتێكیـش بەتـەواوی تێـی دەگەیشـت و ماناكـەی دەسـتگیر دەبـوو، چەنـد ڕۆژێـك بەڵكـو چەنـد هەفتەیـەك بیـری لـێ دەكـردەوەو لەگەڵـی دەژیـاو قسـەی لەسـەر دەكـرد، هەروەهـا لـە دەرسـەكانی و بۆنەكانـی دیكەشـدا باسـی كاریگـەری ئایەتەكـەی دەكـرد بـۆ خەڵكـی.

لەنێـو ئـەو ئایەتانـەدا كـە زۆر پێـی كاریگـەر بـوو زۆریـش دوبـارەی دەكـردەوە ئـەم ئایەتـە بـوو كـە خـوای بـەرزو مـەزن دەفەرمـووێ: ﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾[1] هـود، ئـەم ئایەتـە كاری زۆری كـردە سـەر دەروونـی باوكـم، بەتایبـەت ئـەو ڕسـتە قورئانیـە كـە دەفەرمـووێ: ﴿ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ ﴾، لـەزۆر بۆنەكانـدا ئـەو ڕسـتە قورئانیـەی دووبـارە دەكـردەوەو باسـی ئـەو مانـاو مەبەسـتانەی دەكـرد كـە لەنێـو ئایەتەكـەدا هـەن.

---

(١) واتـە: هـەر بۆخوایـە نهێنـی و نادیارەكانـی ئاسـمانەكان و زەوی، هەمـوو كارو فەرمانیـش هـەر بـۆ لای ئـەو زاتـە دەگەڕێتـەوە، دەی كەوابـوو ئـەو بپەرسـتەو تەنهـا پشـت بـەو ببەسـتە، هەرگیـز خـوای پـەروەردگارت بـێ ئـاگا نیـە لـەوەی كـە ئێـوە دەیكـەن و ئەنجامـی دەدەن.

نموونەی هاوشێوەی ئەمە ئەو ڕستە قورئانیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموویٚ: ﴿ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾[1] الأعراف، ڕستەی (أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ) عەقڵ و بیرو هۆشی باوکمی داپۆشیبوو، لەهیچ حاڵ و بارودۆخێکدا لەبیری نەدەکردو بیرو هۆشی ئەوی جێنەدەهێشت، چەندەها جاریش لە دانیشتنەکانیدا ئەو ڕستە قورئانیەی دەهێنایەوەو دووبارەی دەکردەوەو لەزەتی لیٚ دەبینی، ئاماژەی بە قوڵی و گەورەیی ماناو مەبەستەکانی دەکرد.

هەر لەو بارەوە ئەم دوو ئایەتەش دەیانخستە نێو خەم و خەفەتێکی بەردەوام و دڵ و دەروونی ئەویان تووشی شۆك دەکرد، کە بریتی بوون لە ئایەتەکانی (١٣-١٤)ی سوڕەتی (الحدید)، کە خوای پەروەردگار دەفەرموویٚ: ﴿ يَوۡمَ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ قِيلَ ٱرۡجِعُواْ وَرَآءَكُمۡ فَٱلۡتَمِسُواْ نُورٗا فَضُرِبَ بَيۡنَهُم بِسُورٖ لَّهُۥ بَابُۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحۡمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلۡعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمۡ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمۡ فَتَنتُمۡ أَنفُسَكُمۡ وَتَرَبَّصۡتُمۡ وَٱرۡتَبۡتُمۡ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴿١٤﴾ ﴾.

ئەم ئایەتانە حاڵی (دوڕوو)انمان پیشان دەدات کە لەڕۆژی قیامەتدا لەچ بارو دۆخێکدان، مونافیقان لەو ڕۆژەدا هەوڵ

---

(١) واتە: ئاگاداربن و بزانن و تێفکرن کە: هەرچی درووست کردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە، (کەواتە: دەبا هەمووان فەرمانبەرداری ئەوبین و لەفەرمانی دەرنەچین)، موبارەك و پیرۆزو گەورەیە زاتی (اللە) پەروەردگاری جیهانیان.

دەدەن هەمـان ئـەو فێـڵ و تەڵەكانـە بكـەن كە لەدونيادا دەيانكرد، لەوێـش دەيانـەوێ بچنـە ڕيـزى ئيمانـداره ڕاسـتگۆكان، بەهەمـان سـيفاتى ئيمانـداران خۆيـان دەردەخـەن بـۆ ئـەوەى هەمـوو ئـەو دەسـتكەوت و پاداشـتانەيان پـێ بـدرێ كـە بـە ئيمانـداران دەدرێ، بـەڵام لـە ئيمانـداران جيـا دەكرێنـەوەو لەڕيـزى ئـەوان دەردەهێنرێن، پێيـان دەگوتـرێ: بگەڕێنـەوه بـاى پێويسـتى خۆتـان ئـەو چاكانـە بەدەسـت بهێنـن كـە لـە دونيـادا پشـتتان تێدەكـردو نەتاندەويسـت، بـەڵام ئـەوێ قيامەتـە، خـۆ دونيـا نيـە كـە خەڵكـى لێپێچينەوەيـان لەگـەڵ بكـرێ بەگوێـرەى ڕواڵـەت و لايەنـە ديـارو ئاشـكراكانيان، ئەمـە سـەرەڕاى ئـەوەى لـەوێ ئـەو دەرفەتـەش نەمـاوە تـا دوڕووان تـۆوى نيفاقـى تێـدا بچێنـن، ئەمـڕۆ دادگـەرى و لێپێچينـەوە هـەر بـۆ خوايـەو بەتەنهـا خـۆى بڕيـار لەسـەر چارەنوسـى شـتەكان دەدات، ئەمـڕۆ بڕيـارو حوكـم لەسـەر ئـەو شـتانە دەدرێ كـە ئينسـانەكان لەناخـى خۆيانـدا شـاردوويەتيانەوە، نـەك لەسـەر ئـەو شـتانەى بەزمـان و ئەندامەكانـى تـر دەردەخرێـن و بەخەڵكـى پێشـان دەدرێـن.

باوكـم ڕەحمەتـى خـواى لێبـێ لەزۆربـەى بۆنـەو يادەكانـدا ئـەم دوو ئايەتـەى دوبـارە دەكـردەوە، تيشـكى دەخسـتە سـەريان و مەترسـى ئـەو ديمەنـەى دەخسـتە ڕوو، چەنديـن جاريـش بەوپـەڕى ملكەچـى و زەليليـەوە دەپاڕايـەوە خـواى گـەورە نەيخاتـە ڕيـزى ئـەو كەسـانەوە كـە لـە قيامەتـدا پێيـان دەفەرمـووێ: بگەڕێنـەوە بـۆ دونيـاو نـورو ڕوناكـى بـۆ ئێرەتـان بێنـن، دواتـر پشـتيوان بەخـوا كۆمەڵێـك لـەو دوعـاو موناجاتانـە دەهێنيـن كـە ئەنجامـى دەدان.

ئـەو نمونانـەی هێنامـەوە لەبـارەی پەیوەنـدی باوكـم بـە قورئانـەوە دڵۆپێـك بـوون لـە دەریایـەك، بـاس و خواسـی تێڕامـان و هەڵوەسـتەكانی ئـەو لەبەرامبـەر ئایەتەكانـی قورئـان كاتێكـی دوورو درێـژی دەوێ، كـە چۆن ئـەو ئایەتانـە كاریگەریـان لەسـەر دەروونـی ئـەو هەبـووە، بەهەمـان شـێوە ئەگـەر بمانـەوێ باسـی ورد بوونـەوەی ئـەو بكەیـن لـە مانـاو مەبەسـتی ئایەتـەكان كاتێكـی زۆری دەوێ.

**ویـردو زیكـرەكانی:**

كات و سـاتەكانی باوكـم پـڕ بـوون لـە ویـردو زیكـرو یـادی خـوای پـەروەردگار، جگـە لـەو كاتانـەی كـە خەریكـی نوێـژ كـردن و نـان خـواردن و خەوتـن بـوو، دەبـێ ئەوەشـمان لەبیـر نەچـێ كـە قورئـان خوێنـدن و سـەرقاڵ بـوون بـە زانسـت لـە پیرۆزتریـن و گەورەترینـی زیكرەكانـن، باوكـم لـە هەمـوو كاتێكـدا زیكـری خـوای پـەروەردگاری دەكـرد تەنانـەت ئـەو كاتانـەش كـە بەڕێگـەدا دڕۆیشـت، بەپێـی توانـا هەمـوو كارو بـارە دونیاییەكانیشـی تێكـەڵ بە زیكـرو یـادی خـوای پـەروەرگار دەكـرد، ئەگـەر بێئاگاییـەك ڕووی تێبكردایـە لەهـەر كاتێكـدا، ئـەوا زوو بەخۆیـدا دەهاتـەوەو دووبـارەو سـەرلەنوێ سـەرقاڵی خوێندنـی زیكـرو ویردەكانـی دەبـوو.

باوكـم باسـی یەكێـك لـەو ڕۆژانـەی دەكـرد كـە بـۆ ماوەیـەك بـێ ناگایـی ڕووی تـێ دەكات، دواتـر خـوای پـەروەردگار بیرخەرەوەیەكی بۆ دەنێـرێ و لـەو بـێ ئاگاییـە خەبـەری دەكاتـەوە، تـا كۆتایی تەمەنیشـی ئـەو بەسـەرهاتەی لەیـاد نەكـرد، بـەم شـێوەیە بـۆی گێڕاینـەوە:

{گوتـی: مـن لـە شـوێنێك بـووم لـەدەورو بـەری شـاری بەیـروت بەمەبەسـتی سـەردانی کردنـی نەخۆشـێك کـە ناسـیاوێکی خۆمـان بـوو خەڵکـی جەزیـرە بـوو، لـە باخچەیـەك ڕامابـووم پـڕ بـوو لـە داری لیمـۆ، باخچەکـە زۆر جـوان بـوو، گوڵـی تـازەی دەرکردبـوو، بەجۆرێـك ئـەو نـاوەی پـڕ کردبـوو لـە بۆنـی خـۆش، منیـش دەسـتم لەپشـتی خـۆم گرتبـوو بەوێـدا تێدەپەڕیـم و خەیاڵـم دەکـرد، هێنـدەم زانـی دەسـتێك لـە پشـتەوە قۆڵـی گرتـم، منیـش ئـاوڕم دایـەوە بینیـم پیاوێکـەو نایناسـم، پێشـم وانەبـوو پێشـتر بینیبێتـم، سـەلامی لێکردم پاشـان گوتـی: ئایـا دەتوانـی ماڵـی ئـەو کەسـەم پێشـان بـدەی کـە ئـەم لیمۆیانـەی بۆیـە کـردووە؟ منیـش پێـم گـوت: مـن کەسـێکی غەریبـم لـەو نـاوە کـەس ناناسـم، تەماشـای کـردم و گوتـی: منیـش وەك تـۆ غەریبـم! پاشـان ڕاچڵەکیـم و وەك ئـەوە وابـوو لەگـەڵ قسـەکەی ئـەو لەخـەو خەبـەرم بێتـەوە، زانیـم ئـەو پیـاوە چـی دەوێ و مەبەسـتی چییـە، پێـم گـوت: دڵـی ئیمانـدار!}..

نازانـم دوای ئـەوە گفتوگۆکەیـان بەکـوێ گەیشـتووە بـەڵام باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ وای دەبینـی پرسـیاری ئـەو پیـاوە (پێدەچـێ یەکـێ بووبـێ لـە پیاوچـاکان) بەئاگاهێنانـەوەی ئەوبـووە لـە بێئاگایـی، بیـرو هۆشـی باوکمـی لەسـەر جوانـی ڕەنگـی لیمـۆکان و بۆنـی خۆشـی گوڵـەکان لابـردووەو بـەرەو بیـر کردنـەوە لـە بەدیهێنـەرو خالقـی ئـەم جوانییـەی بـردووە.

جارێکیـان یەکـێ لـە ناسـیاوانی لـە مالیزیـاوە داوا لـە باوکـم دەکات هەواڵـی پـێ بـدات دەربـارەی ئـەو زیکـرو ویردانـەی کـە

ئـەم لـە شـەوو ڕۆژێكـدا ئەنجاميـان دەدا، بـۆ ئـەوەی ئەويـش چـاوی لـێ بـكات، باوكيشـم ئـەو زيكـرو ويردانـەی بـۆ دەنێـرێ كە لـە شـەوو ڕۆژيكـدا ئەنجاميـان دەدات، لەگـەڵ ئـەو زيكرانـەی كـە لـەدوای نوێـژە فـەرزەكان و، هەڵسـان لەخـەوو، دوای دەسـتنوێژو، ....هتـد، كـە لـە كتێبەكانـی سـوونەتەوە هاتـوون.

ئـەو زيكـرو ويردانـە شـتانێكی زانـراون و لـە كتێبـی ئـەزكاری پێشـەوا نەوەويـدا ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ هاتـوون، بـەڵام جگـە لـەو زيكرانـە، مـن لێـرە ئـەو زيكرانـە دەنووسـم كـە باوكـم خـۆی پێـوە پابەنـد كردبـوون و ئەنجامـی دەدان، بـۆ ئـەو پياوەشـی نـارد كـە لـە ماليزيـاوە داوای لـێ كردبـوو:

• خوێندنی سوڕەتی ياسين هەموو بەيانيان و ئێواران.

• خوێندنی سوڕەتەكانی (السجدة، الواقعة، الملك) هەموو ئێوارەيەك.

• زيكری (سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم، أستغفرالله) سەد جار، بەر لە نوێژی بەيانی.

• زيكری (لا إله إلا الله، سبحان الله، الحمدلله، أستغفرالله) دە جار، لەنێوان بانگ و نوێژی بەيانی.

• زيكری (أستغفرالله الحي القيوم وأسأله التوبة) سەد جار، هەموو بەيانيان و ئێواران.

• خوێندنی سوڕەتی ئيخلاص سەد جار بەيانيان و ئێواران.

• زيكری (لا إله إلا الله) سەد جار هەموو بەيانيان و ئێواران.

• زیکری (اللهم صل على النبي الأمي محمد وعلى آله وصحبه) سەد جار هەموو بەیانیان و ئێواران.

• زیکری (سبحان الله والحمدلله ولا إله إلا الله والله أكبر) سەد جار هەموو ڕۆژێك.

• زیکری (لا إله إلا الله، وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير) سەد جار هەموو بەیانیان و ئێواران.

• ئەمە سەرەڕای ئەو زیکرو نزایانەی هەموو بەیانیان دەیخوێند کە ئەگەر بیهێنین بابەتەکە زۆر درێژ دەبێتەوە، وەك وێردەکانی ئیمام نەوەوی، لەگەڵ ئەو زیکرانە: (سبحان الله العلي الديّان، سبحان الله شديد الأركان، سبحان من يذهب بالليل ويأتي بالنهار، سبحان من لا يشغله شأن عن شأن، سبحان الله المُسبح في كل مكان)، هەروەها: (اللهم إني أعوذ بك أن أشرك بك وأنا أعلم، وأستغفرك مما لا أعلم، إنك علام الغيوب) سێ جار.

پاشان دەیگوت: (بسم الله ما شاءالله، لا يسوق الخير إلا الله، بسم الله ماشاءالله لا يصرف السوء إلا الله، بسم الله ماشاء الله، ما كان من نعمة فمن الله).

هەروەك هەموو بەیانیەکیش بەردەوام بوو لەسەر خوێندنەوەی قەصیدەی بوصەیری موضەری، کە دەست پێ دەکات بە: {يا رب صل على المختار من مضر .... والأنبياء وجميع الرسل ما ذكروا}.

لەگەڵ هاتنی بەیانیدا دەستی دەکرد بە خوێندنی ویردەکانی بەیانیان، بەڵام ویردی ئێوارانی دوای نوێژی عەسر دەخوێند،

ئەگەر دواى نوێژى عەسریش سەرقاڵ بووایە بە وانە گوتنەوە، یاخود هەر شتێكى دیكەى نزیك لە وانە گوتنەوە، ئەوا بەوپەڕى گرنگى پێدانەوە هەوڵى دەدا دواى سەرقاڵ بوونەكەى ئەو ویردو زیكرانە بخوێنێ كە لەدەستى چووە.

بەكورتى: بەهیچ شێوەیەك لە ژورە بچووكەكەى نەدەبینرا سەرقاڵى شتێك بێت غەیرى قورئان خوێندنەوە، یاخود گەڕان بەدواى مەسەلەیەكى زانستى، یاخود تەسبیحى بەدەستەوە بوو زیكرەكانى دەخوێند[1].

---

(١) باوكم ڕقى لەوە بوو تەسبیح بگرێتە دەست بەمەبەستى خۆ بەدیار خستن یان كات بەسەر بردن، تەنیا بۆ ئەو مەبەستە تەسبیحى دەگرتە دەست كە زیكرو وێردەكانى خۆى پێ ئەنجام بدات، لەوانەیە پرسیار بكەى هەندێ لە خەڵكى دەڵێن: بەكارهێنانى تەسبیح بیدعەیەو درووست نیە، ئەمە چۆنە؟

لەوەڵامدا دەڵێم: پێغەمبەرى خوا ﷺ ئامۆژگارى كردووین ڕۆژانە سەد جار خواى پەروەردگار بەپاك بگرین، وەك ئەوەى لە صەحیح (موسلیم) دا هاتووە، بەو خەڵكە دەڵێم كە پێیان وایە بەكارهێنانى تەسبیح بیدعەیە: ڕێگایەكم پێشان بدەن بۆ ئەوەى ئەو سەد جارەى پێ بژمێرم؟ هەر ڕێگایەكیش كە تۆ پێشنیارى بكەى بۆ سەرژمێرى كردنى زیكرەكان دەبێ بیدعە بێ، چونكە لە فەرمایشتەكەدا نەهاتوە بەچى ئەو ژمارەیە سەرژمێر بكرێ، جیاوازى خستنە نێو هۆكارێك لەگەڵ هۆكارێكى تر بەوەى یەكێكیان درووستە زیكرى پێ بكەیت و ئەوەى دیكەیان درووست نیە، حوكمێكى باتڵ و پووچە، ئەوانەى دەڵێن: بیدعەیە ئەگەر بیر بكەنەوە دەزانن لە شەریعەتى ئیسلامیدا بنچینەیەك هەیە دەڵێ: [هەر شتێكى داواكراو ئەگەر پەكى كەوتبێ لەسەر شتێكى دیكە، ئەوا شتەكەى دیكەش دەبێتە داوا كراو]، بۆ وێنە ئەگەر لەتوانامدا نەبوو

بەجوانی پێشوازی لەو میوانانەشی دەكرد كە دەهاتن بۆ ئەوەی سوودێكی قیامەتی بەدەست بهێنن، یاخود پێویستیەكی دونیاییان هەبوو بەگوێرەی توانا دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەكردن، هەر كاتێك كارەكەشی بۆ ئەو كەسە تەواو بكردایە، دوبارە دەگەڕایەوە سەر ئەنجامدانی زیكرو ویردەكانی.

**پاڕانەوەو موناجاتەكانی:**

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەو دوعایانەی لە كتێبەكانی سونتەتدا هاتوون لەبەری بوون و بەردەوام ئەنجامی دەدان و دووبارەی دەكردنەوە، جگە لەو دوعایانەش، چەند دوعایەكی دیكەی هەبوون، هەر كاتێ هەست و شعوری ترسان لەخواو بەگەورە گرتن و ستایش كردنی خوا هێرشیان بۆ دەهێنا پێیان دەپاڕایەوە.

كات و سەعاتی زۆری بەسەردا دەچوو ئەم هەر خەریكی دوعاو پاڕانەوە بوو، دوعاكانی درێژ دەكردەوە، بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ ستایشی خوای پەروەردگاری دەكرد، لە تایبەتترینی ئەو كاتانەی كە ئەو دوعایانەی تێدا دەكرد شەوی هەینی بوو، دوای ئەوەی لە خەتم كردنی قورئان دەبوویەوە، زۆریش

---

هەڵبستمەوە بۆ نوێژی بەیانی مەگەر بە بەكارهێنانی زەنگی ئاگادار كەرەوە نەبێ، ئەو كاتە زەنگە ئاگادار كەرەوەكەش دەبێتە داوا كراو وەك نوێژی بەیانی، كەسێ خاوەنی بیرو هۆش بێ لەو بۆچوونەی ئێمە دەگات و پاڵپشتی دەكات، ئەگەر بینیت دوای ئەو ڕوونكردنەوەش هەر خۆی نەزان دەكات ئەوا بزانە ئەو كەسە دەلالی كەل و پەلی فیتنەو ناشووبە، بۆیە ئاگاداری نێوان و خۆت و ئەوبە!

وابـوو کـە لەسـەرەتای هەفتـە، واتـە: لـەڕۆژی شـەممە دەسـتی پـێ دەکـردو لـە ناوەڕاسـتی شـەوی هەینـی هەمـان هەفتـە خەتمەکـەی تـەواو دەکـرد، ئەمـە لـە کاتێکـدا خـۆی بەتەنیـا لـە ژووره بچووکەکـەی دەبـوو هیـچ کەسێکی بـەدەورەوە نەبـوو، دوای تـەواو بوونـی خەتمەکـە ئەوەنـدەی خـوا بیویسـتایە دەپاڕایـەوە، زۆر جاریـش لەکاتـی پاڕانـەوەکان حاڵێکـی سـەیرو نامـۆی لـێ دەهات، چەندیـن جـار بەهـۆی ئـەو حاڵانـەی لێـی هاتـوون خەبـەرم بۆتەوە، لەکاتێکـدا کـە بەتەنیشـت ژوورەکـەی ئـەوەوە نوسـتووم.

چەنـد شـێوازێکی هەبـوو بـۆ پاڕانـەوە لەخـوا، موناجـات و ڕازو نیازەکانیشـی جـۆراو جـۆر بـوون، هەمـووی بەدەسـت و خەتـی خۆی لـە پەڕاوێکـی بچـووك تۆمـار کردبـوو، وا پێدەچـوو لەچەنـد کاتێکـی تایبەتـدا دەگەڕایـەوە سـەر پـەڕاوە بچووکەکـەی و دەیخوێنـدەوە.

لــەو بــارەوە، لەوانەیــە هێنانــەوەی چەنــد نمونەیــەك لــە پاڕانەوەکانــی کــە لەکاتــی تایبەتــدا ڕازو نیــازی پــێ لەگــەڵ خـوادا کـردوون بهێنینـەوە باشـتر بـێ لـەوەی بـاس لـە هەسـت و شـعوری ئـەو بکەیـن، مـن وەك خـۆی و بـێ دەسـتکاری هـەر لـەو دەستنوسـەی خۆیـەوە کـە خـۆم خوێندوومەتـەوە چەنـد نموونەیەکی بـۆ خوێنـەر لـێ دەهێنمـەوە کـە پـڕن لـە دیمەنـی بەگەورەدانانـی خـواو، ڕۆچـوون بەنێـو سـتایش کردنیـدا.

ئەمە یەکێکە لە دوعاکانی:

{خودایـە! ستایشـی تـۆ دەکـەم، ستایشـێك بـە ئەنـدازەو ژمـارەی ئـەو ستایشـانە لـە ئاسـمانەکان و زەوی بۆتـۆ دەکـرێ، لـە ئەزەلـەوە

تــا ئەبــەد، چــۆن ستایشـــت نەكــەم لەكاتێكــدا تــۆ كاربەرجــێ و بەبەزەییـت، بـێ نیـازو بەخشـەریت، زانـاو نـەرم و نیـان و لەسـەر خۆیـــت، پـــەروەردگارا! ئەگــەر ئەندامەكانـــی لاشـــەم هەمـــووی ببونایەتـە دەم لەهـەر دەمێكیشـمدا بـە ئەنـدازەی دروسـتكراوەكانت زمانـــم هەبـــووان، ئەگــەر هەمـــوو ئەندامەكانـــم دەســـت بوونایـــە، درەختەكانیـش هەمـووی قەلەمـی مـن بوونایـە، دەریـاكان هەمـووی مەرەكەبـی مـن بووان، پاشـان بەهـەر زمانێك لـەو زمانانە سـوپاس و ستایشـی تـۆم بكردایـە، بەهـەر دەسـتێك لـەو دەسـتانەش قەلەمێكـم بگرتایـەو بمنوسـیایە، بەڵكـو ئەگـەر چـاوەكان هەموویـان چـاوی مــن بــووان، پاشــان بەهەمــوو ئــەو چاوانــە ســەیری ســیفاتەكانی تـۆم بكردایـە، هێشـتا دڵـم ئـاوی نەدەخـواردەوەو نەدەگەیشـتم بـە بچووكتریـن و نزمتریـن پلەی سـتایش كردنـی تۆ، ئەی ئەو كەسـەی غەیـری خـۆت نەبـێ هیـچ كەسـی دیكە بـەو شـێوەی كە شایسـتەتە قـەدرو ڕێـزت نازانـێ، هیـچ كەسـێك لەوانـەی پێتـدا هەڵدەڵێـن و وەسـفت دەكـەن نازانـن چـۆن سـوپاس و ستایشـت بكـەن و بـەو شـێوەیەی كـە شایسـتەیت بتناسـن، لەكاتێكـدا خۆت درووسـتكەرو بەدیهێنـەرو سەرپەرشـتیاری هەمـوو شـتێكیت، مـن بێتوانـاو بـێ دەسـەڵاتم، خودایـە صـەڵات و سـەلام بنێـرە بـۆ سـەر خۆشەویسـت و پاڵفتــە كــراوو خەلیلــی خــۆت پێغەمبــەری نەخوێنــدەواری هەڵبژێـردراوی خـۆت، پەیامبـەری پێشـەوای نزیـكان و چـاكان، صـەڵات و سـەلامێك كـە هیـچ یەكێـك لـە هەڵبژێردراوانـت بـەو شـێوازە صـەڵات و سـەلامیان بـۆ نەناردبـێ، بەبەردەوامـی و بـێ پسـانەوە تـا ڕۆژی پەسـڵان، صـەڵات و سـەلامێك پـڕ بـە پێسـت

و شايسـتەی ئـەو مانـاو دەلالەتانەبـێ كـە ناوەكانـی موحەممـەدو ئەحمـەدو ناوەكانـی تـری دەیگەیەنـن، صـەڵات و سـەلام لەسـەر خـاوو خێـزان و هـاوەڵان و شـوێنكەوتوانی بـژاردەی، وەك چـۆن صـەڵات و سـەلامت ڕژانـد بەسـەر خەلیـل و خۆشەویسـتی خـۆت ئیبڕاهیـم و شـوێنكەوتووانی، ئـەو پێگـەو مەقامـەی پـێ ببەخشـە كـە لەنزیكـی خۆتەوەیـە لـە ڕۆژی قیامـەت، لەسـەرووی پێگـەو مەقامـی چـاكان و پـاكان}.

{پاكـی و بێگـەردی بۆتـۆ ئیلاهـی، سـوپاس و ستایشـی بـێ هەژمار بۆتـۆ، مـن بـاوەڕم پێـت هێنـاوە، وە بـاوەڕم بـە گەورەیـی و هێـزو دەسـەڵاتت هێنـاوە، بـەڵام تەمەنـم گوزەشـت لـە بێنرخـی و نەزانـی، ئێسـتاش نازانـم چـی بكـەم؟ هیـچ هێـزو توانـاو هەوڵدانێـك نیـە بـۆ گۆڕانـكاری و بـاش بـوون و ئیصـڵاح بـوون جگـە لـە تـۆ، مـن هیـچ سـوودو زیانێكـم بـۆ دەرونـی خۆم بەدەسـت نیـە، نێوچەوانم بەدەسـت تۆیـەو چۆنـی خـۆت مەیلـت لەسـەر بـێ و بتـەوێ ئـاوا ڕەفتـاری پـێ دەكەیـت، بۆیـە پـەروەردگارا! ئەمـڕۆ هێشـتا ئـەو ڕۆژە نەهاتـووە كـە بەئەهلـی دۆزەخ دەڵێیـت: بێدەنـگ بـن و بەزەلیلـی و ڕیسـوایی تێیـدا بمێننـەوە، ئێسـتا ئێمـە لەدونیادایـن تەوبـەو گەڕانـەوەی تێـدا وەردەگیـرێ، تەوبـەم لـێ وەربگـرە ئـەی خـودای تـەوواب، بێهێـزی و بێدەسـەڵاتیم بگـۆڕە بـۆ بەهێـزی و بەتوانایـی لەدینـداری، بمخـە ڕیـزی ئیماندارانـی بەهێـزو حەكیمانـی پارێـزگارو بەتەقـوا.

پـەروەردگارا! غەیـری تـۆ هیـچ خالـق و سـوود گەیەنـەرو زەرەر گەیەنەرێكـی دیكـە نیـە، نێوچەوانـی مـن بـەم شـێوەیە ئاڕاسـتە

بکـە کـە خـۆت پێـی ڕازیـت، پـەروەردگارا! هەمـوو چاکەیـەك هـی تۆیـەو لەتۆوەیـەو بۆتۆیـە، پـەروەردگارا! ئـەی جێگـەی ئومێـدو هیـوام! ئەگـەر تـۆ بەزەییـت پێمـدا نێتـەوە ئـەی کـێ بەزەیـی پێمـدا بێتـەوەو کـێ وەك تـۆ بەبەزەییـە؟ پـەروەردگارا! ئەگـەر تـۆ دامنەپۆشـی و سـترم نەکـەی کـێ دامپۆشـێ و سـترم بـکات و کـێ وەك تـۆ داپۆشـەرە؟ پـەروەردگارا! بەناوەکانـی لێبوردەیـی و لێخۆشـبویی و داپۆشـەریت لێـت دەپاڕێمـەوە، لێـم ببـوری و لێـم خۆشـبی و هەمـوو هەڵخلیسـکان و هەڵـەو پەڵەکانیشـم داپۆشـیت.

پـەروەردگارا! مسـوڵمانان هـەم چاکـەو هـەم خراپەیـان هەیـە، بـەڵام مـن هیـچ چاکییـەك لەخۆمـدا نابینـم پێشکەشـی تـۆی بکـەم و بۆتـی بێنـم، خراپەکانـم ئـەوە دیـارە کـە خراپـەن، کـردەوە چاکـە ڕواڵەتیەکانیشـم لەهەقیقەتـدا هـەر خراپـەن، مـن بـەو شـێوەی پێویسـتە بەندایەتیـم بۆتـۆ نەکـردووە، بـەو شـێوەیەی پێویسـتە تـۆم نەناسـیوە، هیـچ شـتێکم لەدەسـت نەماوەتـەوە (دڵـم پێـی خـۆش بـێ) جگـە لـە بەزەیـی تـۆ، بەزەییـت پێمـدا بێتـەوە، بەزەییـەك لـە تاریکیـەوە ڕزگارم بـکات بـەرەو ڕوناکیـی، ئـەو ڕوناکیـەی نـە دەبڕێتـەوەو نـە دەکوژێتـەوە}.

{پـەروەردگارا! مەمخـە ڕیـزی ئەوانـەی لـە قیامەتـدا بـە ئیمانـداران دەڵێـن: ئـەی ئێمـە لەگـەڵ ئێـوە نەبوویـن؟ ئەوانیـش پێیـان دەڵێـن: بـا، بەڵام ئێـوە خۆتـان تووشـی ئاشـوب و خراپەکاری کـرد دڵتـان پەیوەسـت کـرد بەدونیـاوەو پشـتتان هەڵکـرد و ئومێـدو خۆزگـەو هیـوا درێـژی بێئـاگاو مەغـروری کـردن، پـەروەردگارا!

هەرچەنـد سـەيری دەروون و عەقڵـی خـۆم دەكـەم دەزانـم لـە ئەهلـی ئاگـرم، هەرچەنـدە سـەيری بەخشـش و چاكـەو لوتفـی تۆش دەكـەم لەگـەڵ بەندەكانـت، دەبینـم كارەكـە ئاسـانەو بـەم شـێوەیە نیـە، پـەروەردگارا! ئەگـەر وەرمبگـری و قەبوڵـم بكەیـت، یـان ڕەتـم بكەیتـەوەو قەبوڵـم نەكەیـت، دڵـی مـن بـۆ هیـچ كەسـی دیكـە ناگونجـێ غەیـری تـۆ، هیـچ كەسـی دیكـەم پـێ شـك نایـە بتوانـێ ڕزگارم بـكات و سـوودم پـێ بگەیەنـێ و زەرەرم پـێ بگەیەنـێ جگـە لەتـۆ، دەرگاكـەی خۆتـم بەسـەردا دامەخـە ئـەی ئـەو كەسـەی دەرگا بـەڕووی كەسـدا داناخـەی، ئـەی بەزەییترینـی بەبەزەییـان، ئـەی بەزەییترینـی بەبەزەییـان، ئـەی بەزەییترینـی بەبەزەییـان}.

ئەمـەش یەكێكـی دیكەیـە لـەو موناجـات و ڕازو نیازانـەی باوكم لـە سـتایش و بەگـەورە گرتـن و پاڕانـەوەی پەروەردگاریـدا: {خوایە! سـوپاس و سـتایش بۆتۆ، سـوپاس و ستایشـی عارفێـك عیرفانەكەی بووبێتـە هـۆكاری لاڵ كەوتنـی لـە قسـە كـردن، خوایـە! سـوپاس و سـتایش بۆتـۆ سـوپاس و ستایشـی ئەو كەسـەی خەریكی سـەرژمێر كردنـی گونـاح و بێشـەرمیەكانیەتی لەئاسـتی تـۆداو دەبینـێ گونـاح و بێشـەرمیەكانی ئەوەنـدە زۆرن ئاسـمان و زەویـان پـڕ كـردووە، كاتێكیـش سـەیری گەورەیـی و بەخشـندەیی و بەخششـەكانت دەكات كـە هیـچ سـنورێكیان نیـە، شـەرمێك دایدەگـرێ هـەر مەپرسـە، خەریكـە لەشـەرمەزاری خـۆی و لەترسـی تـۆدا لاشـەی پارچـە پارچـە بـێ و دڵیشـی شـەق شـەق بێـت، پاشـان كـە سـەیری بەزەیـی و نـەرم و نیانـی و لێخۆشـبوون و داپۆشـینی تـۆ دەكات هەمـوو ئاسـمانەكان و زەوی و گشـت دروسـتكراوەكانی گرتۆتـەوە

ئاهێكـی بەبـەردا دەكـرێ و ڕووحـی دەرچـووی دەگەڕێتـەوە نێـو لاشـەی}.

{پـەروەردگارا! ئەگـەر مـن و هەمـوو درووسـتكراوانی دیكەشـت هەتـا هەتایـە بەهەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە تۆیـان پـێ بنـاسرێ، بتناسـین و بەهەمـوو شـێوەیەك مـەدح و ستایشـت بكەیـن، هێشـتا بـە ئەنـدازەی دڵۆپێكـە لـە دەریایـەك، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی ئـەم دڵۆپەیـەش هـەر لەلایـەن تۆیـەو تـۆ دەیبەخشـی، هـەر چەنـدە شـوكرانەت بكەیـن پێویسـتە دووبـارە شـوكرانەت بكەینـەوە لەسـەر ئـەوە كـە شـوكرانەمان كـردووی، بـەم شـێوەیە شـوكرانەبژێری كردنـی تـۆ یـەك بـەدوای یـەك دەڕواو تـەواو نابـێ، لەكۆتاییەكەشـی دەگەینـەوە ئـەو خاڵـەی كـە بێهێـزو بێتوانایـن لـە ستایش كـردن و شـوكرانە بژێـری تـۆ، هـەر خۆتیـت دروسـتكەری سوپاسـگوزاری و شـوكرانەبژێری و ئـەو بێـژەو لەفـزو قسـانەی كـە ئێمـە دەیكەیـن، خوایــە صــەڵات و ســەلام بنێــرە بــۆ بەنــدەو نێــردروای خــۆت پێغەمبــەری نەخوێنــدەواری قوڕەیشــی عەرەبــی، موحەممــەدی هەڵبژێردراو ﷺ لەنێو هەموو دروسـتكراواندا، بـۆ شـوێنكەوتوان و هاوەڵانـی بەڕێـزی لـە موهاجیریـن و ئەنصـاڕ}.

{خوایـە! ئـەی ئـەو خوایـەی بەهەمـوو سـیفەتێكی تەواو وەسـف دەكرێیـت، ئـەی ئـەو خوایـەی ئـاگاداری هەمـوو چاكەیەكیـت، ئـەی ئـەو خوایـەی بەزەیـی و لێخۆشـبوونت بـۆ گوناهبـاران لەتـەك گەورەیـی و دەسـەڵاتت بەسـەریاندا بەڵگـەو نیشـانەیە بـۆ تەواوێتـی و گەورەیـی و بەرزیـت، تـۆ توانـاو دەسـەڵاتت هەیـە

لەچــاو تروکاتێکــدا لەناویــان بەریــت و تەفــرو تونایــان بکەیــت، لێبوردەیــی و لێخۆشبوونت لەپاڵ ئـەو گەورەیـی و هێـزو دەسـەڵاتە زۆرەت ئەوپــەڕی کەمــاڵ و تەواوێتییــە، تەواوێتــی و کەماڵــی تــۆ کۆتایــی نایــەت و کــەم نابێـت ئــەی خـودای بەخشــەرو گــەورە و خــاوەن ڕێـزو پلـە و پایـە، گوناهەکانـم هەرچەنـدە گـەورەن و زۆرن و ناژمێردرێــن، بــەڵام بــەراورد بــە دەسـت کراوەیـی و لێبوردەیــی و بەخشــەریت شـتێك نیـە غەیـری دڵۆپێـك لـە بارانــی ڕەحمەتــت، لێبوردەیــی تــۆ نــە لــەڕووی شــەرعی و نــە لــەڕووی عەقڵیــەوە شــتێکی مەحــاڵ نیــە، تــۆ هەرشــتێکی بتەوێـت و ویسـتت لەسـەر بێــت توانــات بەســەر جێبەجــێ کردنیــدا هەیــە، پــەروەردگارا وا بکەیـت ئومێـدو هیـوام بەتـۆ پێچەوانـە نەبێتـەوە، چونکـە خـۆ مـن هیــچ پەروەردگارێکــی دیکــەی غەیــری تــۆم نیــەو هیــچ بەزەیــی و میهرەبانێکیـش شـك نابـەم غەیـری تـۆ، هیـچ کەسـێکیش جێگـەی ئومێـدو دڵنیایـی نیـە جگـە لەتـۆ، تـۆ سـەرچاوەی هەمـوو بەزەیـی و ڕەحمێکیــت، ئــەی بەخشــەری بێنیــاز، ئــەی بیســەری زانــا}.

هــەر کاتێکیــش زمانــی بوەسـتایە لـە وێـردو زیکـرەکان ئـەوا دڵــی دەسـتی دەکـرد بـە بیـر کردنـەوەو تێڕامـان، سـەرقاڵ دەبـوو بـە بیـر کردنـەوەو تێڕامـان لـە ژیانـی ڕابـردووی، هـەر لەکاتـی منداڵێتیــەوە، تــا چوونــی بــۆ کاری کشــتوکاڵی و جوتیــاری و پاشــان وەرگرتنــی زانســت، دواتــر کــۆچ کردنــی لەپێنــاوی خــوا بـۆ وڵاتــی شــام، بیــر کردنــەوەو تێڕامانــی دەکــرد لــەو یارمەتــی و چاودێریـە خواییـەی کـە یـاوەری بـوو، ڕۆژێـك لـە ڕۆژان لێـی جیـا نەبوویــەوە، نــەك هــەر ڕۆژێــك لــە ڕۆژان بەڵکــو هیــچ کاتێــك لــە

کاتەکان لێی جیا نەبوویەوەو خوای پەروەردگار ئەو یارمەتی و چاودێری کردنەی لەسەر هەڵنەگرت، دوای ئەو تێفکرینە دوورو درێژەش لەبێدەنگی و تێڕامانەکەی خۆی دەهاتە دەرەوەو بەهەموو هەست و شعورو کیان و بوونیەوە دەیگوت: {سوپاس بۆ ئەو خوایەی منی لە دایك و باوکێکی مسوڵمان درووست کرد، فێری قورئان و دینیان کردم، پاشان کۆچکردنی لە پێناوی خۆیدا بەرەو ئەو زەویەی کە خۆی بە موبارەك وەسفی دەکات پێ بەخشیم، پاشان تەوفیقی دام و دەستی گرتم لە شوێنێك کە تێیدا غەریب و نامۆو بێکەس بووم، بێ ئەوەی خۆم هیچ دەستپێشخەری و دەستکەوت و دەسەڵات و مشور خواردنێکم تێیدا هەبێ، پاشان ڕێزی لێگرتم بە پێدانی خانووێك هەر لەو شارە، بێ ئەوەی خۆم چاوەڕوانی ئەوە بکەم ڕۆژێك لەڕۆژان وا بەئاسانی دەبمە خاوەنی خانووێك، بێ ئەوەی ماندوبوون و هەوڵدانێکی ئەوتۆش لەپێناویدا بەخەرج بدەم}.

ئەم جۆرە تێڕامان و بیر کردنەوانەی باوکم لەو هەموو بەخشش و نیعمەتە زۆرانە، هەرگیز لە خەڵوەتەکانیدا جیا نەدەبوویەوە، واتە: بەشێکی دانەبڕاو بوو لەو عیبادەتانەی باوکم لەخەڵوەتەکانیدا ئەنجامی دەدان، بەبەردەوام بەش بەش، ئەو هەموو دیمەنە زۆرەی فەزڵ و بەخششی خوای پەروەردگاری دەهێنایەوە نێو خەیاڵ و ئەندێشەی خۆی، هەندێ جار ئەو بیر کردنەوانە دەگەیشتە ڕادەیەك حاڵیان بەسەر بابمدا دەهێنا، هەر ئەو حاڵەش کە بەسەریدا دەهات وای لێدەکرد هەندێ جار بەدەنگی بەرز ئاوازی ستایش و سوپاسگوزاری خوای

گـەورە بچـڕێ دەمـێ بەزمانـی کـوردی و دەمـێ بەزمانـی عەرەبـی لەنێـو ئاوازەکانیـدا ستایشـی خـوای پـەروەردگاری دەکـردو بێتوانایـی خۆشـی لـە ئاسـت شـوکرانەبژێری ئـەودا پێشـاندەدا.

ئەمـە ئەگـەر بەتەنیـا بووایـە، بـەڵام ئەگـەر لەگـەڵ یەکـێ لـە نزیـکان و ئەندامانـی خێزانەکـەی بوایـە هیـچ چارێـك نەبـوو هـەر دەبـوو باسـی ئـەو چیرۆکـەی بـۆ بـکات کـە چـۆن خـوای پـەروەردگار فـەزڵ و بەخششـی خـۆی بەسـەردا بارانـدووە، چـۆن لەکاتێکـدا منداڵێـك بـووەو بیـری لەهیـچ نەکردۆتـەوە، پاشـان چۆن بۆتـە قوتابـی و فێرخـوازی زانسـت، پاشـان چـۆن خۆبەخشـانە چۆتـە شـارەکانی وان و بەتلیـس بـۆ جیهـاد کـردن و چـۆن خـوای پـەروەرگار لەهەنـدێ لـەو کـوردە گەمژانـــەو پۆلیســە تورکانـەی ئەتاتورکـی پاراسـتووە، پاشـان چـۆن ئـەو بەخششـە گەورەیـەی لەگەڵـدا کـردووەو هیجـرەت کردنـی لەپێنـاوی خۆیـدا بەقسـمەت کـردووە، چـۆن لـەدوای کـۆچ کردنـی بـەرەو دیمەشـق خـوای پـەروەردگار دەسـتی گرتـووەو ڕزق و ڕۆزی پێـداوەو فێـری ئـەوەی کـردووە بژێـوی ژیانـی خـۆی و خێزانەکـەی دابین بـکات لەڕێگەی کڕیـن و فرۆشـتنەوە، لەکاتێکـدا پێشـتر هیـچ شـتێکی لەبـارەی کڕیـن و فرۆشـتنەوە نەزانیـوە، پاشـان چـۆن خـوای پـەروەردگار دوای تاقـە کوڕەکـەی ڕێـزی زیاتـری لێنـاوەو منـداڵ و نـەوەی باشـی پـێ بەخشـیوە.

هەواڵـی هەمـوو ئەو فـەزڵ و بەخشـانەی خوای پـەروەردگاری لەبـاس و خواسـی درێـژو تولانیـدا بـۆ دەگێڕاینـەوە، ئێمـەش بـەو

پـەڕی هـۆش و زەینـەوە گوێـیان لێـی دەگـرت، كاتێكیـش دەگەیشـتە كۆتایـی باسـەكە لەنێـو حەمـدو سوپاسـگوزاری و ستایشـی خـوادا جۆرێـك لـە مەسـتی و بێئاگابـوون دەیگـرت، پاشـان پێـی دەگوتیـن: بەخـوا، بەخـوا ئەگـەر هـەر هەمووـمـان سـەرمان بخەینـە سـەر زەویەكـی خـۆڵ بۆخـوا، پاشـان بـەرزی نەكەینـەوە تـا گیانمـان دەردەچـێ، ئـەوا هێشـتا شـوكرانە بژێـری كەمتریـن بەخشـش و نیعمەتـی خـوای پەروەردگارمـان نەكـردووە.

پاشـان دەگەڕایـەوە نێـو دەروونـی خـۆی و لەگـەڵ خۆیـدا دەكەوتـە قسـە كـردن، بـەو پـەڕی داخ و ئەسـەفەوە دەیگـوت: ئاهـ، ئاهـ ئێسـتا لێـرە بوومەتـە شـتێك و باسـم دەكـرێ، بەیانیـش خەڵكی پێـم دەڵێـن: شـێخ مـەلا، شـێخ مـەلا..! كەچـی شـتێك نەبـووم جگە لـە كوردێكـی نـەزان (دەروێشـێك) لەنێـو هـاوڕێ و نزیكانـم[١].

هیـچ گومانـی تێـدا نیـە ئـەم جـۆرە تێڕامـان و قـوڵ بوونەوانـە ناواخـن و كاكڵـی زیكـرو یـادی خـوای پـەروەردگارن، ئەگـەر

---

(١) بـا خوێنـەر دڵنیـا بـێ لـەوەی مـن ئـەو شـتانەی دەیڵێـم دروسـتكراوو چەنـد قسـەیەكی وەهـم و ڕازێـنراوە نیـن لەخەیاڵـی خۆمـەوە درووسـتم كردبـێ وەك ئـەو كەسـانەی شـت لـە خەیـاڵ و ئەندێشـەی خۆیانـەوە درووسـت دەكـەن و بەسـەرهاتی پـێ سـاز دەكـەن، بەڵكـو ئـەوەی دەیڵێـم وەسـف كردنـی كەسـێكە كـە باوكمـە بـەو پـەڕی ئەمانەتـەوە، بـەو پـەڕی وردی و دیقەتـەوە، باسـی قسـەو وشـەو حاڵـی باوكـم دەكـەم، تـا ئێسـتاش زۆربـەی قسـەكانی و دیمەنـە كاریگەرەكانـی و ئـەو حاڵانـەی كـە بەسـەریدا دەهاتـن لەزیهـن و مێشـكی منـدا خەتـم بـووە، باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ سوپاسـگوزاری و شـوكرانە بژێـری خـوای پـەروەردگاری زۆر بـۆ دووبـارە دەكردینـەوەو بەگوێیدا دەدایـن لەسـۆنگەی باسـكردنی بەسـەرهات و چیرۆكـی ژیانـی خۆی .

ئــەوەی دەگوتــرێ زیكــری خەفــی (شــاراوە) باشــترین جــۆری زیكــر كردنــە، ئایــا مەبەســت لــە زیكــری شــاراوە چییــە؟ ئــەو جــۆرە بیــر كردنــەوەو یادەوەریەیــە كاتــێ هەمــوو دڵ و دەروونــی خاوەنەكــەی دادەپۆشــێ، پاشــان وەریدەچەرخێنــێ بــەرەو شــهودو هەســت كــردن بــە حــزوری خــواو تەنیــا بینینــی خــوا.

ئێمــە تێبینــی ئەوەمــان دەكــرد هەرچەنــدە باوكــم تەمەنــی زیاتــر دەبــوو ئــەو بیــر كردنەوەیــە زیاتــر لــە دەروونیــدا نــەش و نمــای دەكــرد، بەڵكــو وای لێهاتبــوو ئــەو تێرامــان و بیــر كردنەوانــەی كردبــووە بەشــێك لــە زیكــرو وێردەكانــی ژیانــی، لەنێــوان ڕۆژێــك و ڕۆژێكــی تــردا لەگەڵــی دەژیــا، كاتێكیــش دەچــووە نێــو ئــەو جــۆرە زیكــرەو بیــرو هۆشــی خــۆی دەبــردە ســەر بەخشــش و نیعمەتــە زۆرەكانــی خــوای پــەروەردگارو لەگەڵیانــدا دەژیــا، زیكــرو یــادی ئــەو بەخششــانەی خــوای پــەروەردگار دەبوونــە پەردەیــەك لەنێــوان خــۆی و دونیــا، لەدونیــای دادەبڕانــدو بــێ ئــاگای دەكــرد، پــڕ دەبوو لــە شــوكرانەبژێری و ستاییشــكردنی خــوای پــەروەردگار.

## ئەنجامدانی حەج و عەمرەو، زیارەتی پێغەمبەری خوا ﷺ

یەكەم بەجێهێنانی فەریزەی حەج لەلایەن باوكمەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٣٠)، ئەوكات من تەمەنم یەك ساڵ بوو، دوای ئەوە تا كۆتایی چلەكان هەلێكی دیكەی بۆ نەڕەخسا بگەڕێتەوە ماڵی خواو حەجێك یاخود عەمرەیەكی دیكە ئەنجام بدات، ئەمە لەگەڵ ئەوەی ئومێدی زۆری هەبوو خوای پەروەردگار ئەو ڕێزەی لێبنێ و بۆ جاری دووەم سەردانی ماڵی خوا بكات، بۆ ئەوەی پاداشتی یاخود قەبوڵ بوونی حەجەكەی یەكەمی تۆكمەترو تۆختر بێ، وەك چۆن بۆخۆی زۆر جار ئەمەی دەگوت، بەڵام دەست كورتی و هەژاری ڕێگەی نەدەدا ئەو ئومێدو هیوایەی بێتە جێ.

ڕۆژێكیان گەنجێكی شكڵ و شێوە جوان هاتە خزمەت باوكم، پێشتر زیارەتی باوكمی نەكردبوو، یەكتریشیان نەبینیبوو، خۆی بە باوكم دەناسێنێ و پێی دەڵێ: من ناوم حاجی حەسەن ئەلبەحریە، كاری ئەو گەنجە بەكرێ گرتنی كەشتی بوو لە وەرزی حەج كردندا، بۆ ئەوەی حاجیەكان لەسەر پشتی كەشتیەوە بگەیەنێتە ماڵی خوا، هاتبوو بۆ ئەوەی میوانداری باوكم بكات و داوای لێ بكات گەشتێكی ماڵی خوای لەگەڵ ئەنجام بدات لەو ساڵەدا، باوكم بە سوپاسەوە

ئــەو میوانداریــەی ئــەوی قەبــوڵ كــرد، بــێ ئــەوەی بزانــێ كــێ ئــەو گەنجــەی ڕاسـپاردووە بـۆ ئـەو میوانـداری و ڕێـز لێنانـە، لـە كاتێكــدا هــەر ناشیناســێ.

ئەمــەش یەكێــك بــوو لــەو بەخشــش و نیعمەتانــەی هەرگیــز لەبیــری باوكــم نەدەچــوەوە، لەكاتــی زیكــر كــردن و تێڕامانــدا بـەردەوام سوپاسـی خـوای لەسـەر دەكـرد، باوكـم زۆر دەروون ئارام بـوو لـە ئاسـت ئـەو حەجـەی دووەمـی كـە بـێ هیـچ ئامـادەكاری و چاوەڕوانیــەك بــۆی پێشــهات، لــەو كاتــە بــەدواوە پەیوەنـدی نێـوان ئـەوو حاجـی حەسـەن ئەلبەحـری تونـدو تـۆڵ بـوو، بیـرم دێ چەندیـن جـاری دیكـە بـەو پـەڕی ڕێـزو پێزانینـەوە میوانـداری باوكمـی كـرد لـەو گەشـتە دەریاییانەیـدا بـۆ ماڵـی خـوا.

پاشــان حاجــی حەســەن لەیەكێــك لــەو گەشــتانەیدا تووشــی ڕووداوێكــی ترســناك بــوو، لــە ڕووداوەكــەدا بەشــێوەیەكی زۆر سەرســوڕهێنەر ڕزگاری بــوو، لەگــەڵ ئــەوەش كــە ڕزگاری بــوو بـەڵام بەهـۆی ڕووداوەكـەوە تووشـی نەخۆشـیەك بـوو لـە لاشـەیدا، وای لێكــرد لەهەمــوو چالاكیەكانیــدا بوەســتێ، بەچەنــد ســاڵێك دوای ئــەوە وەفاتــی كــرد.

لەســەرەتای حەفتاكانــداو دەســتپێكی مانگــی ڕەمەزانــدا هەلێكی دیكـە بـۆ باوكـم هاتـە پێشـەوە بـۆ ئـەوەی سـەردانی ماڵـی خـوا بــكات، مانگێكــی تــەواو لــەوێ دەچێتــە ئیعتیــكاف و دوای ئــەو مانگــەش ڕوو دەكاتــە مەدینــەی منــەووەڕە، لەتــەك پێغەمبــەری خــوادا ﷺ دەمێنێتــەوە تــا كاتــی هاتنــی وەرزی حــەج، پاشــان

دەگەڕێتەوە بۆ دیمەشق، باوكم ئەوەی پێ باشتر بوو ئەم گەشتانە لەسەر حیسابی خۆی و بەپارەی تایبەتی خۆی ئەنجام بدات سەرەڕای ئەوەی پارەیەكی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام بۆچوونی وابوو ئەم شێوە سەفەر كردنە (واتە: بەپارەی خۆی) لەلایەك زیاتر دەبێتە جێگەی ڕەزامەندی خوای گەورە، لەلایەكی دیكە گونجاوترە بۆ ئەدا كردنی مافی پەروەردگارێتی بەسەر بەندەكانیەوە، بەڵام هیچ بانگهێشت كردنێكی بۆ ئەنجامدانی بەدەل حەج بە چەند مەرجێكی تایبەت كە هەردوولا پێوی پابەند بن ڕەت نەدەكردەوە.

لە كۆتایی ئەم باسەدا كە بریتییە لە -قسە كردن لەسەر پەرستشەكانی باوكم و تایبەتمەندی ئەو پەرستشانە لەلای ئەو- دەمەوێ قسە لەسەر ئەوە بكەم باوكم لەو حوكمە شەرعیانەدا كە بەندەكانی خوا تێیدا سەرپشكن لەنێوان ڕوخسەت و عەزیمەت، باوكم دەستی بە عەزیمەتەوە دەگرت نەك ڕوخسەت، بەتایبەت لەو حوكمە شەرعیانەدا كە تایبەتن بەهەردوو مەناسیكی حەج و عەمرە، لەو شتانەدا كە ئینسان دەتوانێ ڕوخسەت وەربگرێ ئەم خۆی لەسەر ئەوە ڕانەهێنابوو ڕوخسەتەكە وەربگرێ، مەگەر حاڵەتێكی زۆر دەگمەن هاتبێتە پێش، یان زۆر زۆر پێویستی بكردایە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەگەر خەڵك پرسیاریان لەو مەسەلانەدا لێ بكردایەو داوای فەتوایان لێ بكردایە مەسەلەكەش ڕوخسەتی هەڵگرتایە، ئەوا ڕوخسەتەكەی پێ ڕادەگەیاندن و قەدەغەی نەدەكردن لەوەی دەستی پێوە بگرن.

بەدرێژایی ئەو ساڵانەی کە باوکم چەند جارێك حەج یان عومرەی تێدا ئەنجامدان هیچ هەلێکم بۆ نەڕەخسا حەجێك یان عومرەیەکی لەگەڵ ئەنجام بدەم، لەگەڵ ئەوەش زۆر تینوو بوم بۆ سەفەرێکی لەو شێوەیە لەگەڵ ئەودا، بەتایبەت کاتێ دەمبینی خەڵکی چۆن پێشبڕکێ دەکەن لەوەی بەهاوڕێیەتی ئەو سەفەرێکی حەج بکەن، دواتریش کە دەگەڕانەوە لێم دەبیستن چەندە دڵخۆش و ئاسودە بوونە لە سەفەرەکەیاندا لەگەڵ باوکم، وەسفی بەندایەتی و زیارەت و حاڵی باوکمیان دەگێڕایەوە لە حەجدا منیش گوێم بۆ دەگرتن، هۆکاری ئەوەش کە بۆم هەڵنەکەوت سەفەرێکی لەگەڵ بکەم ئەوەبوو کاتێ جێیدەهێشتین هەموو کارەکانی خۆی بەمن دەسپارد، ئەوکاتیش هیچ بەدیلێکی دیکەی نەبوو کارەکانی بۆ ئەنجام بدا غەیری من، دیاربوو ئەویش هەستی بەو خۆزگەو ئاواتەی من کردبوو، یاخود ڕەچاوی ئەو داخ و ئەسەفەی منی کردبوو بەرامبەر ئەو گەشتە نایابانەی دەیکردن، بیستبووی چۆن ئەوانەی لەگەڵی دەبوون لەسەفەرەکانیدا خۆشحاڵی و دڵخۆشی خۆیان لەلای من دەردەبڕن، بۆم باس دەکەن چەندە سوودیان لە باوکم وەرگرتووە، لەو سۆنگەیەوە جارێکیان نامەیەکی بۆ ناردم، ئەو کات گەشتەکەی لەسەرەتای مانگی ڕەمەزانەوە کردبوو، نامەکە ئەو ئێش و ئازارانەی هەندێ کەم کردمەوە کە لەبێبەش بوونم لەتەك ئەودا دەمچەشت، لەکاتێکدا کەسانی نامۆو بێگانە کەڵك و سوودیان لە بوونی باوکم وەردەگرت لە گەشتەکەیان بۆ ماڵی خوا، لە نامەکەیدا نوسیبووی: {من لێرە

عیبادەتێك ئەنجام دەدەم شتێكی تاكە كەسییەو تەنیا بۆخۆمە، بەڵام ئێستا تۆ لەشوێنی خۆتدا خوای پەروەردگار لەكارێكدا بەكارت دەهێنیێ هەم خۆی پێی ڕازیە، هەم سوودو قازانجەكەی بۆ زۆرێك لە خەڵكیە، من لێرە كاتێ وەزیفەی خۆم ئەنجام دەدەم وەك (فعلی لازم) وام لەزمانی عەرەبی كە تەنیا بۆخۆیەتی و تایبەتە بەخۆی، بەڵام تۆ لەشوێنی خۆتدا كاتێ وەزیفەكەت ئەنجام دەدەی وەك (فعلی موتەعەددی) وای لەزمانی عەرەبی، كە كار بۆ غەیری خۆی دەكات}.

بێگومان ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەو قسانەی وەك دڵدانەوەو ڕازی كردنی من نوسیبوو، ئەگینا لەڕاستیدا ئەو لەو سەفەرانەیداو لەكاتی ئەنجامدانی مەناسیكەكان پێشەوایەتی زۆرێك لە خەڵكی دەكردو دەبوویە سەرچاوەی خێرو بێر بۆ ئەوانیش نەك هەر بۆخۆی، بەرچاو ڕوونی پێدەدان و فێری دەكردن، دواتر زانیم لەنێوان هەردوو جەژن لەحەرەمی مەككەدا دادەنیشت و وانەی بەوكەسانە دەگوت كە دەیانویست باوكم وانەیان پێ بڵێ، لەهەر بابەتێك لە بابەتەكانی زانستی شەرعی، بەتایبەت ئەو بابەتانەی پەیوەندیان بە مەناسیكی حەج هەیە.

ئەو كەسانەی بۆیان ڕەخسابوو لەگەڵ باوكم سەفەری حەج بكەن -موحەممەد تۆفیقی كوڕم یەكێك بوو لەوانە- بۆیان گێڕامەوە باوكم هەر لەو كاتەوە لە دیمەشق بەڕێ دەكەوت تا كۆتایی سەفەرەكەو گەڕانەوەی زۆر بەوردی و بەدیقەتەوە گرنگی بە جێبەجێ كردنی هەموو سوننەتێكی مەناسیكەكان دەدا.

لەبـارەی ئـەوەش کـە تایبەتـە بـە وەرچەرخـان و ڕووو وەرگێڕانـی بـە فیکـرو بەزمـان لەخـودی دونیـاو سـەرقاڵیەکانی دونیـا، هەروەهـا خـۆ یـەکلا کردنـەوەو ڕووکردنـە عیبـادەت بەتـەواوی و بەبەردەوامـی، بەجۆرێـك بـوو دەتوانـم بڵێـم دەگمـەن بـوو، کـەم کـەس هەیـە لـەوەدا وەك باوکـم بووبـێ، لەسـەفەرەکەیاندا هەرکاتێ دەوروبەرەکـەی باسـی دونیایـان بکردایـە، یاخـود بکەوتنایەتـە نێـو هەنـدێ خۆشـی موبـاح و ڕێگە پێـدراو، یـان خـواردن و خواردنەوە، ئـەوا یەکسـەر بیـری دەخسـتنەوە: کـە دەبـێ ئاگاداربـن! ئـەوان هاتوونەتـە ئـەو شـوێنە بـۆ ئـەوەی خۆیـان خاڵـی بکەنـەوە لەدونیـا، بیـری دەخسـتنەوە ئـەوان هاتوونەتـە ئـەو شـوێنە (واتـە: هاتوونەتـە ماڵـی خـواو مزگەوتـی حـەڕام) بـۆ ئـەوەی لـە سـەرقاڵی و بـێ ئاگاییەکانـی دونیـا دوور بکەونـەوە، نـەك خۆیانـی پـێ سـەرقاڵ بکـەن و باسـی بکـەن.

ئەگـەر لـە حەجـدا عادەتـی خەڵکـی وابـێ تەنیـا لـەڕۆژی عەرەفـە زیاتـر دوعـا بکـەن و خۆیـان خاڵـی بکەنـەوەو تەرخانـی بکـەن بـۆ دوعـا کـردن، ئـەوا ئـەو خەڵکـەی لەگـەڵ باوکـم بـوون هـەر لـەو کاتـەی ئیحـڕامیان دەبەسـت وەك ئـەوە وابـوو لـە عەرەفە بـن، زۆرێـك لەوانـەی لـەڕۆژی عەرەفـە لەگـەڵ باوکـم بـوون لەوانە موحەممـەد تۆفیقـی کـوڕم یەکـێ بـوو لـەو کەسـانەی لەگەڵیـدا بـوو، بۆیـان گێڕامـەوە باوکـم لـەو ڕۆژەدا بەهیـچ شـێوەیەك لای نەدەکـردەوە بـەلای هیـچ شـتێك لەکارەکانـی دونیـا، لای نەدەکـردەوە بـەلای پەیوەندیەکانـی لەگـەڵ خەڵـك، تەنهـا خەریکـی ڕوو کردنـە خـوا بـوو بەزیکـر کـردن و خـۆی یـەکلا کردنـەوەو

دوعـا كـرن و هەسـت كـردن بـە چاودێـری خـوای پـەروەردگار، دەیانگـوت: دوعاكانـی لەیـەك وەسـتاندا لـەدوای نیوەڕۆوە دەسـتی پـێ دەكـرد تـا كاتـی ڕۆژئـاوا، بـێ ئـەوەی گـوێ بداتـە تیشـكی سـوتێنەری خـۆرو ئـەو گەرمـا زۆرەی ئـەو ڕۆژە، بـێ ئەوەی هەسـت بـە مانـدوو بـوون بـكات، یـان چەترێـك بخاتـە سـەری، جارێكیـان یەكـێ لەوانـەی لەگەڵـی بـوون چەترێـك لـە سـەری باوكـم نزیـك دەخاتـەوە بـۆ ئـەوەی سـێبەری بكاتـێ و تیشـكی ڕۆژ لێـی نـەدا، بــەڵام ئــەم بەئامــاژە داوای لــێ دەكات چەترەكــەی لــێ دوور بخاتــەوە.

باوكـم وای دەبینـی بەكارهێنانـی چەتـر لـەو ڕۆژەدا جۆرێكـە لـە خۆشـگوزەرانی و زێدەڕۆیـی، ئـەو خۆشـگوزەرانیەش لـە ڕۆژی عەرەفـەدا پێچەوانـەی ئـەو وەسـفەیە كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەبـارەی وەسـفی حاجـی فەرموویەتـی: تـۆزاوی و قـژو ڕیـش تێـك ئـاڵاو، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی چوونـە نێـو خێمـەو ژێـر چەتـر پێچەوانـەی زەلیـل بـوون و خـۆ بەبچـووك زانینـی ئـەو كەسـەیە كـە دەسـتەكانی درێـژ كـردوون بـۆ لای خـواو داوای لـێ دەكات.

دەیانگـوت: ئـەو لەدوعاكانیـدا یـان ئەوەتـا غەرقـی هەسـت و شـعوری بەندایەتیـی بەندەیـەك دەبـوو كـە لـە چارەنووسـی خـۆی بترسـێ، یانیـش غەرقـی هەسـت و شـعورێكی پـڕ لـە خۆشەویستی دەبـوو شـەوق و تامەزرۆیی بـۆ خۆشەویسـتەكەی خـۆی دەردەبڕی، هەنـدێ جاریـش غەرقـی هەسـت و شـعورێك دەبـوو وەك ئـەوەی لـەو ڕۆژەدا بارانـی ڕەحـم و بەزەیـی ئیلاهـی ببینیـێ، ئەمـەش وای

لێدەكـرد پەنـا بـۆ ڕەحـم و بەزەیـی خـوای گـەورە ببـاو بیكاتـە هۆكارێـك و پێـی بپاڕێتـەوە بـۆ خـۆی و منداڵەكانـی و نەوەكانـی و براكانـی و هەمـوو مسـوڵمانان، دەپاڕایـەوە بـۆ ئـەوەی خـوای پـەروەردگار ئیصڵاحـی حاڵیـان بـكات و خـوارو خێچیەكانیـان ڕاسـت كاتـەوەو لەگوناهەكانیـان خـۆش بـێ.

وەك پێشـتر ئامـاژەم پـێ كـرد تەنانـەت بـۆ جارێكیـش بـۆم هەڵنەكـەوت حەجێـك یـان عومرەیەكی لەگـەڵ ئەنجـام بـدەم، بـۆ ئـەوەی وەك بینەرێـك بـە شـێوەیەكی درێژتـرو زیاتـر باسـی بكـەم، ئـەوەی باسـم كـرد لـەو بـارەوە لـەو برایانـەم بیسـتبوو كە خۆشـحاڵ بووبـون بـە لەگەڵدابوونـی باوكـم، لـە كەسـانێكم بیسـتووە كـە لەزۆربـەی هـەرە زۆری مەناسیكەكان ئامینیـان بـۆ دوعاكانـی ئـەو كـردووەو لەگـەڵ گریـان و دوعاكانـی ئـەودا ئەوانیـش گریـاون.

لەبـارەی ئـەدەب نواندنیشـی لەكاتـی زیارەتـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و مزگەوتەكـەی و شـوێنەوارەكانی لـە مەككـەو مەدینـەو زیارەتی گۆڕسـتانی بەقیـع و شـوێنەواری غـەزاكان، ناتوانـرێ وەك ئـەوەی شایسـتەیە وەسـف بكـرێ مەگـەر كەسـێك ئـەو وەسـفە بـكات كـە بەچـاوی خـۆی باوكمـی لـەوێ بینیبـێ، مەحاڵـە قەڵـەم بتوانـێ تەعبیـر لـەو جـۆش و خرۆشـەی دڵـی باوكـم بـكات و هەقـی خـۆی لەباسـكردنی ئـەو جـۆش و خرۆشـە پـێ بـدات.

باوكـم سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی بچـێ بـۆ ئـەو خانـووەی كـە پێغەمبـەری خـوای ﷺ لـێ لەدایـك بـووە، بـۆ ئـەوەی تەبـەڕووك بەو شـوێنە بـكات، ئـەوەی چووبـێ بـۆ سـەفەری حـەج یاخـود عومـرە

ئـەو خانـووەی بینیـوە لـە مەککـە، ئێسـتا کراوەتـە قوتابخانەیـەك بـۆ لەبـەر کردنـی قورئـان، بـەڵام لـە کاتێکـدا کـە تەبـەڕوك کـردن بـە شـوێنەوارەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەوێ قەدەغەیـەو ڕێگـری لـێ دەکـرێ چـۆن ئـەم کارە بـکات؟

دەچێتــە لای بەڕێوەبــەری قوتابخانەکــە لــەو کاتــەدا کــە لــە نووســینگەکەی خۆیدایــە خــۆی پــێ دەناســێنێ و پێــی دەڵــێ: مەبەســتیەتی ببێتــە یەکێــك لــەو کەســانەی دەیانــەوێ ببنــە قوتابــی لــەو قوتابخانەیــە بەمەبەســتی ئەزبــەر کردنــی قورئــان، بەڕێوەبەرەکــەش داواکــەی باوکــم قەبــوڵ دەکات، مۆڵەتــی دەدا بچێتــە ژوورەوە، باوکــم دەچێتــە ژوورەوە بــەو پــەڕی خشــوعەوە هەمـوو کـون و کەلەبەرەکانـی شـوێنەکە دەگـەڕێ و کارلێـك لەگـەڵ شـوێنەکە دەکات، پاشـان دادەنیشـێ و پێویسـتی خـۆی پێشـان دەدا بــۆ ئــەو کەســەی قورئانیــان پــێ ئەزبــەر دەکات.

دەڵێــم: چەنــدە جێــگای داخ و ئەســەفە مســوڵمان ناچــار بــێ کارێکــی لــەم شــێوەیە بــکات -کەچــی لــە وڵاتێکــی مســوڵمان و لەنێــو مســوڵمانانێکدا بــێ کــە شــانازیش بــە مســوڵمانێتیەکەی خۆیـان بکـەن- ناچـار بکـرێ نیەتـی خـۆی بشـارێتەوە کـە دەیـەوێ تەبـەڕوك بـەو شـوێنە پیـرۆزە بـکات کـە پیـرۆز بـووە بـە لەدایـك بوونــی پێغەمبــەر ﷺ تیایــدا.

باوکــم هــەر جارێــك چووبێتــە شــاری مەدینــە، لــە خانووێکــی ســادەو ســاکاردا نیشــتەجێ بــووە، خانــووی یەکــێ لــە پیاوچــاکان کــە نــاوی موحەممــەد زەکەریــا ئەلبوخــاری بــوو، یەکــێ لــە

سـاڵەكان دواى تـەواو بوونـى لـە مەناسـيكەكانى عەمـڕە ڕوو دەكاتە مەدينـەى مونـەووەڕە، ئـەو كاتـە مانگـى ئـاب دەبـێ و كـەش و هەواكـە يەكجـار گـەرم دەبـێ، تۆفيقـى كوڕيشـم لـەو گەشـتەيدا لەگەڵـى دەبـێ، زۆر مانـدوو شـەكەت دەبـێ بەتايبـەت بەهـۆى گەرمـاى زۆرەوە، هـەر بەهـۆى مانـدو بـوون و گەرميـەوە تووشـى وشـــك بوون (التجفـاف) دەبـێ، كاتـێ دەگاتـە خانـووى شـێخ موحەممـەد زەكەريـا ئەلبوخـارى، حاڵەتـى تەندروسـتيى بەتـەواوى تێـك دەچـێ و خـواردن و خواردنـەوەى بـۆ ناخـورێ، تۆفيقـى كوڕيشـم داواى مۆڵەتـى لـێ دەكات بـۆ ئـەوەى بچـێ دكتۆرێكـى بـۆ بێنـێ، باوكيشـم ڕەتـى دەكاتـەوەو پێـى دەڵـێ: {مـن هەشـتاو پێنـج سـاڵە چاوەڕێـى كۆتاييەكـى وا دەكـەم لـەو شـوێنە}!!

تۆفيـق گوتـى: تووشـى دڵە ڕاوكـێ بووم و ئـەو قسـەيەى باپيرم زۆر منـى ترسـاند، ترسـام وەفـات بـكات، خێـرا خـۆم گەيانـدە مزگەوتـى پێغەمبـەرى خـواو ﷺ دوو ڕكعـات نوێـژم كـرد، پاشـان هەڵسـام و چوومـە لاى ئارامگـەى پێغەمبـەرى خـوا ﷺ، بـەو پـەڕى زەليلـى و داواى يارمەتيـەوە لەبەرامبەريـدا وەسـتام و ئەوەنـدەى لەتوانامـدا بـوو پێداگيـرى و ئيلحاحـم كـرد، تەوەسسـولم بـە پێغەمبـەرى خـوا ﷺ كـرد كـە خـواى پـەروەردگار شـيفاى باپيـرم بـدات و لـەش سـاغى بـۆ بگەڕێنێتـەوە، دواى ئـەوەى گەڕامـەوە بينيـم باپيـرم لـە حاڵێكـى باشـدايە، گوتـم: باپيـرە سـوپاس بۆخـوا واديارە باشـتر بوويتـە، گوتى: بەڵـێ، تـازە لـە خەومـدا كەسـانێك هاتنـە لام جامێكـى پـڕ لـە ئاويـان هەڵگرتبـوو، ويسـتيان لەجامەكـە ئـاوم پـێ بـدەن، منيـش پێـم گوتـن: بـەڕۆژووم، (بەفعليـش بەڕۆژوبـوو) يەكێكيـان هاتـو ناچـارى كـردم

دەمـم بكەمـەوە، يەكێكـی دیكەشـیان هـات و ئاوەكـەی بەسـەر دەمم وەكـرد، تۆفیقیـش پێـی دەڵـێ: تـۆ نەتهێشـت بچـم دكتـۆرت بـۆ بانگ بكـەم، هیـچ چارێكـی دیكـەم نەمـا ئەوەنەبـێ بچـم سـكاڵای خـۆم ببەمـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ، ڕۆیشـتم و بـەو پـەڕی ملكەچـی و زەلیلیـەوە تەوەسسـولم بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ كـرد بـۆ ئـەوەی خوای پـەروەردگار شـیفات بـدات.

ئـەو پیـاوە صاڵحـە كـە نـاوی موحەممـەد زەكەریـا بـوو ڕوو لـە باوكـم دەكات و لێـی دەپرسـێ ئێسـتا تەندروسـتیت چۆنـە؟ باپیـرم پێـی دەڵـێ: خۆشەویسـتەكەم شـیفای دام!

شـێخ موحەممـەد زەكەریـا بەهـۆی ئـەو قسـەیەی باوكـم حـاڵ دەیگـرێ و هـاوار دەكات: اللـە، اللـە، دوای ئـەوە هۆشـی لەخـۆی دەبـڕێ و ماوەیـەك لـەو حاڵەیـدا دەمێنێتـەوە، كاتێكیـش بەهـۆش خـۆی دێتـەوە باوكـم پێـی دەڵـێ: ئـەی شـێخ موحەممـەد! خاوەنـی مەقـام پلـەی گەورەتـرە لـە خاوەنـی حـاڵ، شـێخیش پێـی دەڵـێ: ئێمـە لەسـەر ڕێـگادا دەڕۆیـن و لـە ڕۆیشـتنداین، داوا لەخـوای گـەورە دەكەیـن ویصاڵـمان پـێ ببەخشـێ و بمانگەیەنـێ.

### زیارەتی باوكم بۆ لای پیاوچاكانی زیندوو، مردوو:

باوكـم بۆچوونـی وابـوو وەك چـۆن بەزەیـی خـوا دادەبـەزێ لەكاتـی بـاس كردنـی پیاوچـاكان، بەهەمـان شـێوە لـەو شـوێنانەش بەرەكـەت و بەزەیـی خـوا دادەبـەزێ كـە ئەوانـی لێـن، جـا چ بەزیندوویێتـی لەوێـبن، یاخـود بـە مردوویێتـی.

هــەر لەبــەر ئــەوە زۆر گرنگــی دەدا بــە زیــارەت و ســەردانی کردنـی پیـاو چـاکان، بـەو پـەڕی ئـەدەب و خاکـی بوونـەوە دەچووە دانیشـتنەکانیان، وای دەبینـی ئەمـە لـە گرنگترینـی گوێڕایەڵیەکانـەو ڕێـگای نزیـك بوونەوەیـە لەخـوا، زۆر جاریـش بـۆ ئـەم مەسـەلەیە ئــەو فەرمایشــتە قودســیەی دەهێنایــەوە کــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ دەفەرمــووێ: {ئەگــەر ســەردانت بکردایــە ئــەوا منــت لــەوێ دەبینـی}.

هەنــدێ لــەو پیاوچاکانــەی کــە باوکــم ســەردانی دەکــردن و چاوەڕێـی ڕەحـم و بەزەیـی خـوای گـەورەی دەکـرد بەهـۆی نزیـك بوونــەوە لێیــان، لــەو کەســانە بــوون کــە لەنێــو کۆمەڵــگا زۆر گرنگیـان پـێ نـەدەدرا، لەچینـی ئـەو زانـا دیـارو تایبەتانـە نەبـوون کــە خەڵکــی دەیانناســین، بەڵکــو لەوانەیــە لــەو کەســانە بووبــن نادیــارو شــاراوەن.

هەنـدێ جـار هاوڕێیەتـی ئـەوم دەکـرد لـەو زیـارەت و سـەردانانە، سـەرم سـوڕدەما لـە ئەدەبـی زۆرو ئەو پـەڕی خاکی بوونـی لەگەڵیاندا، لەکاتـی دانیشـتن و سـەردانی کردنیـان بەهیـچ شـێوەیەك شـتێك لـە زانسـت و زانیاریەکانـی خـۆی بەدیـار نەدەخسـت، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی کەسـێکی فەقتهـ بـوو ناوبانگـی دەرکردبـوو کـە شـارەزایی و زانیـاری فیقهـی وردی هەیـە، بەڵکـو بەشـێوەی قوتابیەکـی بێدەنـگ کــە بیــەوێ ســوود لــە مامۆســتاکەی وەربگــرێ لەخزمەتیانــدا دادەنیشـت، مەگـەر پرسـیاری لـێ بکرایـە یـان شـەرعەن پێویسـتی بکردایـە قسـەیەك بـکات ئەگینـا بێدەنـگ دەبـوو.

تــاو ناتاوێــك ڕووی دەكــردە شــاری (حیمــص)، بەمەبەســتی سـەردانی كردنـی هەنـدێ لـە زاناكانـی ئـەوێ و زیـارەت كردنـی هەنـدێ لەپیاوچاكانــی شــاراوەو نادیــاری ئــەو شــوێنە، چاكــەو ڕاســتگۆیی لــە خۆشویســتنی یەكــترو ئولفــەت بوونیــان بەیەكــتر لەنێـوان خۆیانـدا ئاڵوگـۆڕ پـێ دەكـرد.

هەروەهـا دەچـووە چیـای (جیبلـە) بەمەبەسـتی زیـارەت كردنـی ئیبراهیمــی كــوڕی ئەدهــەم ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ، هەروەهــا سـەردانی كردنـی هەنـدێ لـەو پیاوچاكانـەش كـە لەژیانـدا بـوون هـەر لـەو شـوێنە.

چوویـە شـاری (ڕەققـە)، بەمەبەسـتی زیـارەت كردنـی ئوەیسـی قەرەنــی، توشــی هەنــدێ ئاســتەنگیش بــوو لــە چوونەكەیــدا، موحەممــەد تۆفیقـی كـوڕم لـەو سـەردانەدا لەگەڵـی بوو، سـەردانەكە لـە مانگـی شـوباتی سـاڵی ١٩٧٢ بـوو، موحەممــەد تۆفیـق بـۆی بـاس كـردم باوكـم دوای ئـەوەی زیارەتـی ئوەیسـی قەرەنـی دەكات لـە گۆڕەپانێكـی نزیـك ئـەو شـوێنە دەوەسـتێ و كەمێـك بـاس لـە ژیانـی ئـەو پیـاو چاكـەو گەورەییەكـەی بـۆ هەنـدێ لـە خەڵكـی ئـەو شـوێنە دەكات، هـەم قسـەكانی و هـەم ڕواڵەتـی دەبێتـە هـۆی ڕاكێشـانی سـەرنجی زۆرێـك لـە خەڵكـی ناوچـەی ڕەققە، سـەرنجی دەخەنـە سـەرو دەوری دەدەن، بـۆی بـاس دەكـەن كـە ئـەوان لـەو سـاڵەدا تووشــی بــێ بارانــی و وشــكە ســاڵی بوونەتــەوە، داوای لێدەكـەن و ئیلحاحـی لـێ دەكـەن دوعایـان بـۆ بـكات تـا خـوای پـەروەردگار ڕزگاریـان بـكات و بارانـی ڕەحمەتیـان بـۆ ببارێنـێ،

وەك ئـەوەی پێیـان وابـێ باوكـم ڕزگاركەرێكـە بـۆ ئـەوان و خـوای گـەورە بـۆی ڕەوانـە كـردوون.

ئـەو سـاڵە كـە سـاڵی ١٩٧٢ بـوو شـاری ڕەققــە بەدەسـت وشكەسـاڵیەكی زۆر ترسـناك دەیناڵانـد، ئەوانـەی لـەو سـاڵەدا لـەوێ بـوون دەیانگـوت: تەماشـای لای ڕاسـت و چەپـی خـۆت بكردایـە پارچـە سـەوزاییەكی بچووكیشـت نەدەبینـی، ترسـناكترین دیمەنـی ئـەم وشـكە سـاڵیەش مـەڕو ماڵاتـی مـردارەوە بـوو بـوو كـە كەلەشـەكانیان لێـرەو لـەوێ كەوتبـوون.

تۆفیـق بـۆی گێڕامـەوە گوتـی: {باپیـرم زۆر زگـی پێیـان سـووتا، وەڵامـی داواكـەی دانـەوەو پێـی گوتـن: بـەدوای شـوێنێكی گونجـاودا بگەڕێـن بـۆ ئـەوەی تێیـدا كـۆ ببینـەوەو داوا لەخـوای گـەورە بكەیـن و لێـی بپاڕێینـەوە، ئەوانیـش ئاماژەیان بـە گۆڕەپانێكی فراوانـی مزگەوتێكـی كـۆن كـرد، هەموویـان بەیەكـەوە ڕوویـان كردە گۆڕەپانەكـە، هەواڵەكـە بەپەلـە بەنێـو خەڵكـی ڕەققـەدا بـڵاو بـۆوەو لەهەمـوو لایەكـەوە بەپەلـە ڕوویـان لـەو شـوێنە كـرد، باپیـرەم بـەو پـەڕی ملكەچـی و زەلیلـی و هـەژاری داوای لەخـوای پـەروەردگار كـرد، هـەروەك عادەتـی خـۆی لەدوعـا كردنـدا هـەر بـەو شـێوەیە بـوو، خەڵكەكـە هەمـووان لەپرمـەی گریانیانـداو ڕاسـتگۆیانە ڕوویـان كـردە خـوای پـەروەردگار}.

تۆفیـق گوتـی: {ئـەو شـەوە باوكـم بـووە میوانـی هەنـدێ لـە خەڵكـی ڕەققـەو منیشـی لەگـەڵ بـوو، هـەر لـەو شـەوەدا بـاران باریـن دەسـتی پێكـرد، پاشـان بارانەكـە تونـدی كـرد، پاشـان زیاتـر

توندی كردو بەهێزتر باری، وای لێهات سەقفی ئەو خانووەی كە لێی دانیشتبووین دەستی كرد بە دڵۆپە كردن و، دڵۆپەی باران لە سەقفەكەدا دەهاتە خوارەوە، خاوەن ماڵەكە بەپەلە ئێمەی بردە ژوورێكی تری خانووەكەی، دوای كەمێك سەقفی ژوورەكەی تریش دڵۆپەی كرد، لەو ژوورەش بەهەمان شێوە دڵۆپی بارانمان بەسەردا دەباری، خەڵكی شارەكە یەكجار دڵخۆش بوون دوای ئەو هەموو دڵتەنگی و غەم و خەفەتە زۆرەی بەدەست بێ بارانییەوە خواردبوویان].

باوكم بەر لەو مێژووەش سەردانی قودس و مزگەوتی خەلیلی كرد، هەوڵی دا لەوێوە بچێ بۆ سەفەری حەج، بەڵام ئەمەی بۆ نەڕەخسا، لەوێوە ڕووی كردە بەغدا، بەمەبەستی زیارەت كردنی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و مەعروفی كەرخی و جونەیدی بەغدادی و ئەبو حەنیفەی نوعمان، لەگەڵ هەندێ لەو پیاوچاكانەی كە لەژیاندا مابوون، لەشاری دیمەشقیق خوا لێخۆشبێ شێخ صەلاح كیوان یەكێ بوو لەو پیاو چاكانەی باوكم زۆر سەردانی دەكردن بەمەبەستی نزیك بوونەوە لەخوای پەروەردگارو بەدەست هێنانی خێرو بەرەكەت.

لەیەكێ لە سەردانەكانیدا بۆ لای شێخی ناوبراو منیشی لەگەڵدا بوو، لەژوورێكی سەرەوەی خانووەكە پێشوازیمان لێ كرا، خانووەكەی لەیەكێ لە شەقامە بەرزەكانی گەڕەكی موهاجرین بوو، ژوورەكە پڕ بوو لە خەڵك، دوو پەنجەرەی بەرامبەر یەكی تێدا بوو.

وا ڕێککــەوت مــن لەبەرامبــەر ئــەو دوو پەنجەرەیــە دابنیشــم، پــەردەکان هەڵدرابوونــەوەو تیشــکی ڕۆژ دەهاتــە نــاو ژوورەکــە، ئــەوەی لەیادیشــم بــێ کاتەکــەی کۆتاییەکانــی وەرزی زســتان بــوو، منیـش لـە ڕێگـەی ئـەو دوو پەنجـەرەوە چـاوم کەوتـە سـەر چەنـد ئافرەتێـك کـە لـە سـەربانی خانووەکانـی دەورو بەری ئـەو خانووەدا کاریـان دەکـردو جـل و بەرگیـان هەڵدەخسـت، هیـچ یەکێکیـش لـە ئامـادە بـووان ئـەو دیمەنـەی نەدەبینـی کەمـن دەمبینـی.

ئــەوەم بەبیرداهــات کــە مســوڵمان لــە واقیعێکــی لــەم شــێوەیە پێویسـتە چـی بـکات؟ لەدەروونـی خۆمـەوە پرسـیارم دەکـرد، دەبـێ کەسـێك هەبـێ لـە ژوورەکـە پێـی خـۆش بـێ پەردەکـە دابخـرێ و تیشــکی ڕۆژ نەیەتــە ژوورەوە، لەکاتێکــدا هاتنــە ژوورەوەی ئــەو هەتـاوە لـەو کاتـەدا زۆر پێویسـت بـوو، یاخـود دەکـرێ داوا لـەو ئافرەتانــە بکــرێ ســەربان و دیــواری خانووەکانیــان بــۆ شــمەك هەڵخســتن یاخــود هــەر پێویســتیەکی تــری هاوشــێوە بــەکار نەهێنـن؟ یاخـود چارەسـەر ئەوەیـە هـەر کاتێـك چـاوەکان کەوتنـە سـەر ئـەو شـتانەی کـە نابـێ سـەیر بکرێـن، یاخـود لێیـان بڕوانرێ، دابخرێــن؟

هاتـە خەیاڵمـەوە هەمـوو ئـەو چارەسـەرانەی سـەرەوە لەشوێنی خۆیانــدا قورســن، مــن لــەو قســەو گفــتوگۆیـــــانە دابــووم لەگـەڵ خۆمـدا شـێخ صـەڵاح کیـوان دەسـتی کـرد بـە گێڕانـەوەی بەسـەرهاتێك بـۆ باوکـم، لەنـاو گێڕانـەوەی بەسـەرهاتەکەدا ڕووی لەمـن کـردو گوتـی:

{ڕۆڵـە! پێویستـان بەصەبـرو ئارامییـە پێویسـتـان بەصەبـرو ئارامییـە}، ئەمـە لەكاتێـكا شـێخ صـەلاح لـە گۆشـەیەك دانیشـتبوو هیـچ شـتێكی نەدەبینـی لـەو شـتانەی مـن دەمتوانـی ببینـم، پاشـان دووبـارە ڕووی كـردەوە باوكـم و گەڕایـەوە سـەر گێڕانـەوەی بەسـەرهاتەكە!!.

سـەرەتای یەكترناسـینی باوكـم و شـێخ صـەڵاح كیوانیـش بەسـەرهاتێكی زۆر غەریـب و دەگمەنـی هەیـە، بـەڵام دەمـی خـۆم دەگـرم لـە باسـكردنی، چونكـە وا گومـان دەبـەم هەردووكیـان ڕەحمەتـی خوایـان لێبـێ باسـنەكردنی بەسـەرهاتەكەیان پێخۆشـتر بـێ، پێـم وایـە بـاس نەكردنـی دەبێتـە جێگـەی ڕەزامەنـدی هەردووكیـان.

پێشـەوا نـەوەوی (موحیەددیـن یەحیـای كـوڕی شـەرەف ئەلنـەواوی) ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ لـە دیارترینـی ئـەو كەسـانە بـوو باوكـم زۆر بەگـەورەی دادەنـان و خۆشـی دەویسـتن، هەمـوو ئەوانـەی باسـی ژیانـی پێشـەوا نەوەویشـیان كـردووە كۆكن لەسـەر دەوڵەمەنـدی ئـەو زانـا پایـە بـەرزە لـە زانسـتی فیقهـو فەرمـوودەو زمـان و ڕیجـاڵ، هەروەهـا پێگەیـان زۆر بـەرز ڕاگرتـووە لـەڕووی چاكـی و وەلـی بـوون و تەقـواو پارێزكارییـەوە.

باوكـم هـەر كاتێـك هەلێكـی بـۆ بڕەخسـایە درێخـی نەدەكـرد لـە زیـارەت كردنـی گۆڕەكـەی لـە گونـدی نـەوای باكـوری شـاری دیمەشـق، لەیەكـەم سـەردانیدا بـۆ زیارەتـی ئیـمام نـەوەوی لەگەڵیدا بـووم، ئـەوكات تەمەنـم دە ساڵێك زیاتـر نەدەبـوو، درەختێكـی زۆر

سەيرو نامۆ لەناوەوەی گۆڕەكەدا بەرز بووبويەوە سێبەری لە گۆڕەكە كردبوو، پێم شك نایە دارێكی لەو شێوەیەم بینیبێ لەڕووی گەورەیی و فراوانیی، كاتێ دوای چەند ساڵێك بۆمان ڕەخسا جارێكی تر سەردانی گۆڕەكەی بكەین سەیرم كرد دارەكە وشك و زەرد هەڵگەڕاوە.

كاری باوكم لە زیارەت كردنی ئەم مردووانە لەوە كورتهەڵاتبوو كە بەو پەڕی ئەدەبەوە وەك ئەوەی لەژیاندا بن سڵاوی لێ دەكردن، هەندێ جار دوای سڵاو كردنەكە كەمێك قورئانی دەخوێند، پاشان ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بووایە دوعای بۆخۆی و مسوڵمانان دەكرد[1].

---

(١) ئەمڕۆ هەندێ لەخەڵكی نكوڵی لە خوێندنی قورئان دەكەن لەسەر مردوو، زیارەت كردنی مردووان بەشتێكی سووك و بێ بایەخ سەیر دەكەن، هەندێك هەن لەگەڵ ئەوەش كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كردووە بەم كارە كەچی نكوڵی لێ دەكەن، پێم وایە باشترین و وردترین قسە لەبارەی خوێندنەوەی قورئان لەسەر گۆڕ، یاخود لەكاتی مردن، قسەی ئیمام قەڕافی بێ لە كتێبی (فروق)، كورتەی قسەكانیشی بەم شێوەیەیە، دەڵێ:

(ئەو شتانەی ئینسانی پێ لەخوا نزیك دەبێتەوە سێ بەشە، بەشی یەكەمیان: ئەو شتانەن كە لەسەر خاوەنەكانیان كورتهەڵاتووەو حوكمەكەی و پاداشتەكەی تەنیا بۆ ئەو كەسانەیە كە بەكارەكە هەڵدەستن و ئەنجامی دەدەن، نە حوكمەكەی و نە پاداشتەكەی بۆ هیچ كەسێكی تر ناچێ، وەك ئیمان و ئیسلام، بەشی دووەمیان: ئەو شتانەن كە زانایان لەسەری كۆكن كە خوا مۆڵەتی داوە پاداشتەكەی بۆ مردوو بچێ، ئەمەشیان ئەو خێرو چاكانەیە كە بە ماڵ و سامان دەكرێت، یاخود وەك ئازاد كردنی كۆیلە، بەشی سێیەمیان: ئەو پەرستشانەن كە زانایان لەبارەیەوە ڕاجیان، ئەوانیش

## خۆ دوورگرتنی لە قەدەغەكراوەكانی خوای پەروەرگار و دونیا بەكەمگریەكەی

باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ لـە پەیوەندیـەكان و مامەڵەكانیـدا زۆر خـۆی دوور دەگـرت لەو شـتانەی خوای پـەروەردگار قەدەغەی كـردوون، زۆر ئـاگای لـە زمانــی خــۆی بــوو، زۆر چاودێــری

---

بریتیـن لـە: ڕۆژوو، حـەج، خوێندنـەوەی قورئـان، لـەلای مالیـك و شـافیعی ڕەحمەتـی خوایـان لێبـێ پاداشـتی هیچ یەكێـك لەوانە ناگاتـە مـردوو، ئەحمەدو ئەبـو حەنیفـەش ڕەحمەتـی خوایـان لێبـێ پێیـان وایـە پاداشـتەكەی دەگاتـە مـردوو). دوای ئـەوەی (قەڕافـی) بەڵگەكانـی هـەردوولا دەهێنێتـەوە، دەڵـێ: (ئـەو مەسـەلەیە هەرچەنـدە ڕاجیایی لەسـەرە، پێویسـتە ئینسـان پشـتگوێی بخاو گوێـی پێنـەدا، لەوانەیـە ڕاستەكەی ئەوەبـێ پاداشـتی ئـەم كارانە بگاتـە مردوو، چونكـە ئـەو كارانـە بەنسـبەت ئێمـەوە شـتانێكی غەیبیـن، ئەمـە ڕاجیایـی نییـە لەسـەر حوكمێكـی شـەرعی، بەڵكـو ڕاجیاییـە لەبـارەی واقیعێكـەوە كـە ئایـا بـەم شـێوەیەیە یاخـود نـا)، منیـش دەڵێـم: ئـەو قسـەیەی قەڕافـی لـەو پـەڕی وردیـی و ڕێـك و پێكیدایـە، هەرچۆنێـك بێـت خوێندنـەوەی قورئـان نـەك هـەر دروسـتە بەڵكـو عیبادەتێكـی گەورەشـە، ئـەوەی ڕاجیاییەكـەی دروسـت كـردووە خوێندنـەوەو نەخوێندنـەوە نییـە، بەڵكـو گەیشـتن و نەگەیشـتنیەتی بـە مـردوو، بێگومـان لـەو حاڵەتـەدا _ئیحتیـات- وەرگرتـن پێویسـت دەكات قورئانەكـە بخوێنرێتـەوە، پاشـان كۆتایـی بـە خوێندنەوەكـە بهێنرێ بـە دوعایەك كـە خـوای پـەروەردگار ئەنـدازەی پاداشـتی ئـەو خوێندنەوەیـە بـە مردووەكـە ببەخشـێ، لـەو كاتەشـدا ئومێـد وایـە خـوای پـەروەردگار دوعاكـە قەبـوڵ بـكات و پاداشـتی خوێندنەوەكـە بـە مردووەكـە بگەیەنـێ.

ئەوەی دەكرد ئاخۆ لە دانیشتنەكانیدا چی دەگوزەرێ، هەرگیز نەیدەهێشت زمانی لە غەیبەت كردنی خەڵكی بگەڕێ، ڕێی بەهیچ كەسێك نەدەدا لەوانەی لە مەجلیسەكەی دادەنیشتن غەیبەت بكەن، چ ئەوانەی وەك میوان دەهاتنە لای، چ ئەوانەش ئەم وەك میوان دەچووە لایان، ئەو كەسە هەر پلەو پایەیەكی هەبووایە ئەگەر بیویستایە غەیبەتی یەكێك بكات باوكم لێی قەدەغەی دەكرد.

هەرگیز خۆی بێدەنگ نەدەكرد لەهیچ خراپەیەك هەرچەندە ئەو خراپەیە بچووكیش بووایە، بەڵام لە قەدەغە كردنی خراپەدا ئەوپەڕی نەرمی و حیكمەتی بەكار دەهێنا، ئەگەر بینیباشی ئەو كەسەی كە ئەم بە نەرمی و حیكمەتەوە مامەڵەی لەگەڵ دەكات كەچی ئەو بە فرو فێڵ لەبەرامبەریدا دەوەستێ، زۆر لێی تووڕە دەبوو گوێشی بەوە نەدەدا ئەو كەسەی ئەم لێی تووڕە بووە كێیەو كێ نییە.

جارێكیان لەگەڵ هەندێ لەو كەسانەی بەڕواڵەت بە ئەهلی عیلم هەژمار دەكران، دەچێتە ماڵێك، كاتێ دادەنیشن لە گۆشەی ژوورەكەوە چەند پەیكەرێكی لە برۆنز درووستكراو دەبینێ كە بۆ جوانی دانراون، باوكم خاوەنی ماڵەكە ئاگادار دەكاتەوە لەوەی دانانی ئەم پەیكەرانە بە ئیتیفاقی زانایان شتێكی قەدەغە كراوە، ئامۆژگاری دەكات ئەو خراپیە لە ژوورەكەیدا لابدا، بەر لەوەی كابرا بەپەلە بچێ بۆ ئەوەی پەیكەرەكان لەوێ لاببا -وەك قەبوڵ كردن و وەڵامدانەوەیەك بۆ

ئامۆژگاریەكانی باوكم- یەكێ لەو زانایانەی لەگەڵ باوكم لە ماڵەكە دەبێ، دەڵێ: (ئەو شتانە یاری منداڵانن، وەك دەشزانین شتێك بۆ یاری و دڵخۆشكردنی منداڵان بێ ڕێگە پێدراوەو كێشەی نییە)، باوكم بەو قسەیە زۆر تووڕە دەبێ، یەكەم: لەبەر ئەوەی زانایەك دەیەوێ بەدرۆو باتڵ حەرامێك داپۆشێ كە بە ئیتیفاقی زانایان حەرامە، شتێكی ئاشكرایە پەیكەری لە بڕۆنز درووست كراو یاری منداڵان نییە، یاخود شتێك نییە منداڵ یاری پێ بكات، دووەم: لەبەر ئەو كارە گومڕاكەرو فێڵاویەی، وای گومان برد فێڵ لە باوكم دەكات بەوەی كە دوورە لەو عادەت و عورفە نوێیانەو شارەزای ئەو شتە سەردەمییانە نییە، سێیەم: لەبەر ئەوەی ئەو زانایە، لەبری ئەوەی ببێتە یارمەتیدەر لەسەر وشەیەكی هەق كە خاوەنی ماڵەكە قەبوڵی كردو وەریگرت، كەچی هەوڵیدا ببێتە بەربەست لەبەردەم خاوەن ماڵەكەو وەرگرتنی هەق، بەوەی هەڵیخەڵەتاند تا هەموو شتەكان لەشوێنی خۆیدا بهێڵێتەوەو هەڵینەگرێت.

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ زۆرجار باسی ئەو بەسەرهاتەی دەكرد لەسۆنگەی ئەوەی كە چەند ئازاری پێ دەگات كە حاڵی مسوڵمانان گەیشتۆتە ئەو ئەندازەیە وازیان لەوە هێناوە دینی خوا سەربخەن و ئامۆژگاری یەكتر بكەن لەسەر دەستگرتن بە هەق و ڕاستی، پاشان بە خەفەتێكی زۆرەوە پرسیاری دەكرد: ئێمە لەكوێی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خواین ﷺ كە فەرموویەتی: {مسوڵمان برای مسوڵمانە، ستەمی لێ ناكات، بچووكی ناكاتەوە، خەجاڵەت و شەرمەزاری ناكات}؟!

دەگەڕێمـەوە سـەر باسـی خـۆ پاراسـتنی لـە حـەرام.. شـتێکی زانـراوە خۆپاراسـتن و خـۆ دوورخسـتنەوەی مسـوڵمان ڕەنگدانەوەی چاودرێـری کـردن و سەرزەنشـت کردنـی نەفسـی خۆیەتـی، ئـەم وەرع و خۆپارێزیـەی ئەویـش ڕەنگدانـەوەی ئـەو گرنگیـدان و چاودێـری کردنـە تونـدەی بـوو بەسـەر هەڵسوکەوت و ئەندامـەکان و هەسـتەکانی، زۆریـش چاودێـری ئـەو ماڵـەی دەکـرد کـە دەچێتـە گیرفانـی و ئـەو خواردنـەی دەچێتـە گـەرووی، بـەوەی کـە ئایـا ئـەو ماڵـەو ئـەو خواردنـە لـەچ ڕێگەیەکـەوە پێـی گەیشـتووە؟

لـەو بـاوەڕە دام هەرکەسـێ باوکمـی ناسـیبێ و لەنزیکـەوە لەگەڵیـدا تێکـەڵ بووبـێ، هەمـوو جۆرەکانـی وەرع و خـۆدوور گرتن لـە حەرامـی لـێ بینیـوە، زۆر جـار لـە مەجلیسـێکدا خەڵکـی زۆری تێـدا بووایـەو موناقەشـە بکرایـە لەسـەر مەسـەلەیەکی زانسـتی، وازی لـە قسـە کـردن دەهێنـاو بێدەنـگ دەبـوو، لەبیـرو هۆشـی منـدا چەندیـن دیمەنـی لـەو شـێوەیەی باوکـم هـەن، هەندێـك لـەو دانیشـتن و مەجلیسـانە لـە دیمەشـق بەسـتراون و هەندێکـی تریـان لـە حەلـەب، هـۆکاری ئـەو بێدەنـگ بوونەشـی وەك دواتـر هەواڵـی پێـدام ئەوەبـوو هەرکاتێـك هەسـتی کردبـێ پاڵنەرێکـی دەرونـی هانـی دەدا بـۆ قسـە کـردن و سەرخسـتنی خـۆی وازی لـە قسـە کـردن هێنـاوە، لەبـەر ئـەوە وای گومـان بـردووە ئـەم جـۆرە موناقەشـەو قسـە کردنـە خەسـارەتمەندی بەدواوەیـەو هیـچ بەرژەوەنـدی و خێرێکـی بـۆ دینداریەکـەی ئـەو تێـدا نیـە، بۆیـە پەنـای بردۆتـە بـەر بێدەنگـی.

ئەگـەر قسـە كردنـم لەسـەر ئـەو مەجليـس و گفتوگۆيانـەی كـە ڕوويانـداوە لەنێـوان باوكـم و ئەوانـی تـر بـە چـاك و بەسـوود زانيبوايـە بـۆ ديـن، ئـەوا هەندێكـم بـە نموونـە دەهێنايـەوە، بـەڵام دەترسـم پێچەوانەكـەی دەرچـێ.

دێمە سـەر قسـە كردن لەسـەر چەند ديمەنێـك لـە وەرع و خۆپارێزی تونـدی باوكـم بەرامبـەر ئـەو پـارەوماڵـەی بەدەسـتی دەكـەوت، وە بەرامبـەر ئـەو داوەت و خواردنانـەی بانگهێشـت دەكـرا بـۆی، ڕەنگـە ئـەم دووانـە قورسـترين جۆرەكانـی وەرع و خـۆدوور گرتـن بـێ لـە حـەرام، هەروەهـا ڕەنگـە زۆربـەی خەڵكـی ئەمـڕۆ بـە پێچەوانەكـەی واتـە: بـە خـۆ نەپاراسـتن لـە حەرامەكـەی موبتـەلا بووبـێ.

زۆر سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی نـەك ماڵـی حـەرام بەڵكـو هيـچ ماڵێكـی گومانلێكراويـش نەچێتـە نێـو گيرفانـی، ماڵێـك جێـی گومان بێ وەك زانايـان دەڵێـن: ئـەو ماڵەيـە كـە حـەڵاڵ و حەرامـی تێـدا تێكـەڵ بـووە، بنچينـەی حوكمـی شـەرعی لـەو بـارەوە بـەم شـێوەيەيە: منـداڵ دەتوانـێ بـە ئەنـدازەی پێويسـت ماڵـی باوكـی بـەكار بهێنـێ ئەگـەر ماڵەكـە گوماناويـش بـێ، بەهەمـان شـێوە باوكيـش دەتوانـێ ماڵێكی لەم شـێوەيەی كوڕەكـەی بەكاربێنـێ، هەروەهـا ئافرەتيـش بەنسـبەت ماڵـی پياوەكـەی بەهەمـان شـێوە، بـەڵام خـۆ دوور گرتـن و خۆپارێـزی ئەوەيـە ئينسـان لـە هەمـوو حاڵەتەكانـدا خـۆی لـە ماڵێـك بپارێـزێ كـە گومانی لێـی هەيـە، باوكيشـم يەكـێ بـوو لەوانـەی ئەوپـەڕی توانای خـۆی بەگڕ دەخسـت بـۆ خۆپاراسـتن لـە مـاڵ و سـامانێك كـە جێـی گومـان بـێ.

بۆيـە هيـچ شـتێكی نەدەخـوارد بەمووچـەی مـن كڕابووايـە، بـەردەوام ئامـۆژگاری منـی دەكـرد كە ئـەو پارەيـەی وەك مووچە وەری

دەگرم لەو شتانەی خەرج نەكەم كە دەخورێن و دەخورێنەوە، بەڵكو پارەكە لەو شتانەدا خەرج بكەم كە خواردن و خواردنەوە نین، بەڵێ باوكم فەتوای ئەوەی نەدابوو خواردنی ئەو پارەیە حەڕامە، بەڵام لەبەر زۆری وەرع و خۆپاراستن و وەرگرتنی (ئیحتیات) خۆی پابەند دەكرد بە شتانێك كە خەڵكی خۆیانی پێ پابەند نادەن و گوێی پێ نادەن، بۆیە هەموو جار دەیگوت: {ئەو شتانەی بەدەستی خۆم پەیدام كردوون و هەڵمگرتوون بەسمە بۆ ئەوەی خۆمی پێ بژیێنم}، هەروەها دەیگوت: {لەوانەیەماڵێك گومانم لەسەریەتی بیخەمە سەر ئەو ماڵە كە بەدەستی خۆم پەیدام كردووە لەو شتە زیادانە بێ كە پێویستم پێی نیە}.

هەر كاتێكیش یەكێ داوەتی بكردایە بۆ نان خواردن، لە سەرچاوەی ماڵەكە و چۆنیەتی بەدەست هێنانی دەكۆڵیەوە! ئەگەر گومانی حەڕام بوونی لەشتێك لە سەرچاوەی دارایی كەسەكە بكردایە یاخود بیزانیبایە لەو جۆرە ماڵەیە كە گوماناویە، ئەوا چەندەی لەتوانایدابوایە عوزری دەهێنایەوەو وەڵامی داوەتەكەی نەدەدایەوە.

لە شەستەكان لەگەڵ كۆمەڵێك لە زانایان چوون بۆ پارێزگای حەلەب، لەچوارچێوەی بانگەشە كردن بۆ هەڵبژاردنی موفتی كۆماری عەرەبی سوریی[1]، لەگەڵ زانایانی حەلەب پێك هاتن كە هەموویان یەك قسەیان هەبێ بۆ ئەم پرسە.

---

(١) پشتیوان بەخوا لەبەشەكانی داهاتوودا بەشێكی تایبەت تەرخان دەكەم لەبارەی پەیوەندی باوكم بە زانایانی دیمەشق و ئەو ڕۆژانەی كە چالاكی تێدا نواندن و ئەو ڕۆژانەش كە گۆشەگیری و دوورە پەرێزی هەڵبژارد.

دوای ئەوەی گەڕایەوە دیمەشق لایەنێك لە لایەنەكان پەنجا لیرەی وەك تێچووی گەشتەكە لە دیمەشقەوە بۆ حەلەب، بۆ باوكم نارد، بەڵام باوكم زۆر بەتوندی ڕەتی كردەوەو گوتی: {من لەو گەشتەمداو لە ئەنجامدانی ئەم كارەم خزمەتی هیچ كەسێكم نەكردووە، كارەكەم بۆ هێنانە دی بەرژەوەندیەكی تاكە كەسی نەبووە، تا شایستەی ئەوە بم لەبریدا ئەو پارەیەم پێ بدرێ، بەڵكو من لەم گەشتەو لەم كارەمدا واجبێكی شەرعیم جێبەجێ كردووە كە خوای پەروەردگار منی تێدا بەرپرسیار كردووەو پەیمانی خوام لەگەردن بووە، ئەگەر دەستكەوتێكی لەلای خواوە تێدا بووبێ ئەوە بۆمنەو، ئەگەر سزاو تۆڵەیەكیشی تێدا بێ ئەوا لەسەر منە}.

لەڕاستیدا دەڵێم: لەم سەردەمەی خۆمان هیچ مسوڵمانێكم نەبینیوە بەوێنەی باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەوەندە خۆی بپارێزێ لەو شتانەدا كە حەرامن و لەو شتانەشدا كە گومانیان لەسەرە، هیچ مسوڵمانێكم نەبینیوە بەوێنەی باوكم ئەوەندە ورد بێ لە خواردنی لوقمە نانێك كە پێی دەدرێ، یان لەچەند قرشێك كە دەچێتە گیرفانی پرسیاری لەبارەوە بكات لەكوێ هاتووەو چۆن هاتووە! لەم سەردەمەی خۆمان هیچ پیاوێكم بەوێنەی باوكم نەبینیوە ئەوەندە ئیحتیات و وەرعی هەبێ لە دینداریدا.

لەو بارەوە ڕووداوێكی (باوكم)یان بۆ باس كردم لە هەندێ لەسەفەرەكانیدا بەرەو شاری جەزیرە، بە پێویستی دەزانم بیهێنم، كورتەی ڕووداوەكە بەم شێوەیە بووە:

{لـەوێ دەبێتـە میوانـی هەنـدێ لـەو کەسـانەی دیـارو خـاوەن پێگـەن لـەو شـارەدا، ڕۆژێـك لـەو ڕۆژانـە دەچێتـە ماڵێـك پیاوێـك کـە گنـدۆرەی لەلایـە لەماڵەکـە دەبـێ، کاتەکـەش نیوەڕۆیەکـی وەرزی هاویـن بـووەو دونیـا زۆر گـەرم بـووە، کابـرا دوای کەمێـك دانیشـتن گندۆرەیـەك بـۆ باوکـم کـەرت دەکاو دەیخاتە سـەر سـفرەی خواردنەکـە، باوکـم گوتـی: پارچەیـەك یـان دوو پارچـەم لـێ خـوارد، پاشـان مۆڵەتـم لـە خـاوەن ماڵەکـە وەرگـرت بـۆ ئـەوەی بچـم بخەوم، لەخەونمـدا بینیـم قاپێکـی پـڕ خواردنـی پیـس و بێزلێکراویـان بـۆ هێنـام و لەبەردەمیـان دانـام، منیـش هەندێکـم لێـی خـوارد، لەپڕێکـدا بەتـرس و دڵەڕاوکـێ و ئـازارەوە لەخەوەکـە خەبـەرم بـۆوە، بەپەلـە هەڵسـام و بەشـوێن خـاوەن گندۆرەکـەدا گـەڕام، دوای ئـەوەی بینیمـەوە سـوێندمدا بەخـوا دەبـێ هەواڵـم پـێ بـدەی لەبـارەی سـەرچاوەی ئـەو گندۆرەیـەی بـۆت هێنابـوم؟ دوای پێداگیریەکی زۆر کابـرا گوتـی: لەڕێـگای هاتنـم بـۆ لای ئێـوە بـەزەوی فـلان کەسـدا تێپەڕیـم کـە گنـدۆرەی تێـدا چاندبـوو، لەنێـو گندۆرەکانـدا ئـەو گندۆرەیـەم پـێ جـوان بـوو لەگـەڵ خۆمـدا هێنـام}.

دوای ئـەوەی باوکـم گوێـی لـەو قسـانەی کابـرا دەبـێ پەنجـە دەخاتـە گـەرووی بـۆ ئـەوەی هەرچـی خواردوویەتـی بیهێنێتـەوە! لەوانەیـە ئـەو ڕووداوەو ئـەو خەونـەش کـە بینیبـووی تـرس و دڵەڕاوکێـی ئـەوی زۆر زیاتـر کردبـێ لـە مـاڵ و سـامانێك کـە بەڕێگەیەکـی شـەرعی و خاوێـن بەدەسـت نایـەت، بـەردەوام گرنگـی دەدا بـە سـەرچاوەی ئـەو پـارەو مـاڵ و خواردنانـەی کـە بـۆی دەهـات.

ئەگــەر یەكــێ دیاریەكــی بــۆ بهێنایــە ئــەو دیاریــە خواردنێــك یاخـــود ماڵێــك بووایــە، ئــەو گومانــەی لا گەڵاڵــە دەبــوو كــە لەوانەیـە ئـەو ماڵـەی بەنیەتـی زەكات بـۆ هاتبـێ، بۆیـە هـەر بەپەلـە دەیگەڕانــدەوە بــۆ خاوەنەكــەی، ئەگــەر بۆشــی نەگونجایــە بــۆی بگەڕێنێتــەوە ئــەوا دەیــدا بــە كەســێك كــە یەقینــی هەبووایــە لــەو كەســانەیە زەكاتیــان پــێ دەچــێ.

جارێكیــان پێــی دەگوتــرێ: ئایــا تــۆش لــەو كەســانە نیــت كــە شایســتەی ئــەوەن زەكاتیــان پــێ بــدرێ، واتــە: ئایــا خۆشــت زەكاتت پــێ ناشــێ؟ ئەمیــش لەوەڵامــدا دەڵــێ: {ئەگەر پیــاو گەیشــتە قۆناغی پیــری، بــای ئەوەنــدە ماڵــی هەبــوو بەشــی ســاڵێكی تــەواوی بــكات ئــەو كات شایســتەی ئــەوە نییــە زەكاتــی پــێ بــدرێ، دەوڵەمەنــدی بــۆ كەســێك كــە لەتەمەنــی مندابــێ بریتییــە لــەوە بــای ئەوەنــدەی هەبــێ تــا ســاڵ دەســوڕێتەوە بەشــی بــكات، منیــش یەكێكــم لــەو كەســانەی ماڵەكــەم بەزیــادەوە بەشــی پێویســتیەكانی ســاڵێكم دەكات}.

زۆر ئــازاری پــێ دەگەیــی ئەگــەر هەســتی بكردایــە لەنێــو دەوڵەمەندەكانــدا كەســانێك هــەن دەیانــەوێ بــە پێدانــی بــڕە پارەیەك بــە زانایانــی وێنــەی ئــەم، هــەم خۆیــان نزیــك بخەنــەوە، هــەم ئــەو قــەرزەی لەســەریانە وەك زەكات لەســەر خۆیــان لابــەن، ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ وای دەبینــی ئــەم كارە جۆرێكــە لــەو فێڵــە قێــزەون و ناشــیرینانەی دەیانــەوێ لەخــوای بكــەن، بــەو كارەیــان دەیانــەوێ پــەردە بەســەر ئــەو بەشــە ماڵــەدا بــدەن كــە پێویســتە زەكاتــی لــێ

بـدرێ، دەیانـەوێ ماڵەكەیـان بكەنـە هـۆكاری بەدەسـت هێنانـی پێگـەو ڕێزێـك لـەلای زانایـان، یاخـود بـۆ ئـەوەی بێدەنگیـان بكـەن لـە ئاسـت كارەكانیـان، یاخـود بـۆ ئـەوەی لای ئـەوان مـەدح و ستایشـێك بەدەسـت بهێنـن.

ئەمـەی باسـكرا لەبـارەی وەرع و خـۆ دوورگرتنـی باوكـم بـوو لـە شـتە حـەرام و شـتە گومانلێكـراوەكان، هەرچـی بابەتـی دونیـا بەكەمگـری و زوهدیشـە ئەگـەر لەبـەر پاشـەڕۆژو بەرپرسـیارێتی خێـزان و منداڵەكانـی نەبووایـە ئـەوا دەسـتهەڵگرتن لەدونیـای بەپێـش دەخسـت و وەك زاهیدتریـن هاوەڵـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەژیـا.

كاتێـك لەماڵـەوە لەسـەر سـفرەی نانخـواردن دادەنیشـت ئـەو خواردنانـەی لەپێـش خۆیـەوە دەبینـی كـە هەریەكەیـان ڕەنگێـك و تامێكـن، لەترسـی تووڕەیـی و سـزای خـوا سەرزەنشـتی ماڵـەوەی دەكـرد، زۆر ئێـش و ئـازاری پێدەگەیشـت لـەوەی كـەوا ناتوانـێ وەك چـۆن شایسـتەیە سـوپاس و ستایشـی خـوای گـەورە بـكات لەسـەر ئـەو بەخششـانە، چەندیـن جـار ئەندامانـی خێزانەكـەی لەسـەر لا كردنـەوەو زیـاد بەكارهێنانـی خۆشـی و لەزەتەكانـی دونیا سەرزەنسشـت دەكـردن و دەیترسـاندن، هەنـدێ جـار بەتونـدی و هەنـدێ جاریـش بەنەرمـی، باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ وەك پێشـتریش باسـم كـرد ئـەو خواردنانـەی دەژمـاردن كەلەسـەر سـفرەكە بـوون، دەیگـوت: ئـەوە نانـە، ئـەوە برنجـە، ئـەوە گۆشـتە، ئـەوە سـەوزەواتە، هەمـوو خواردنەكانـی سـەر سـفرەكەی دەژمـارد،

پاشــان دەيگــوت: {ئێمــە لەكــوێ و شــوكرانەبژێری خــوا لەكــوێ؟ ئايــا ئەمانــە ئــەو نيعمەتانــە نيــن خــوای پــەروەردگار لەبارەيانــەوە پرســيارمان لــێ دەكات؟}

جارێكيــان زۆر سەرزەنشــتی كــردم و بەســەرمدا ڕۆيــی، نــەك هەر ئەوەنــدەو بــەس، بەڵكــو تەمبێــی كــردم لەســەر ئــەوەی مێزێكــی ســادەم كڕيبــوو بــۆ ئــەوەی ئەوراقەكانــی خۆمــی تێــدا دابنێــم و نووســينی خۆمــی لەســەر بكــەم، ئەمــەش لەســەرەتای كاری مامۆســتايی و دەرس گوتنــەوەم بــوو لــە قۆناغــی ناوەنــدی، وابزانــم ســاڵی ١٩٥٩ بــوو، لــەوە دەترســا بەهــۆی كاری مامۆســتاييم بــەرەو خۆبەگــەورە زانيــن بچــم و گرنگــی بــەو ڕواڵەتانــە بــدەم كــە بۆنــی خۆبەگــەورە زانينيــان لــێ دێ.

جارێكيــان ســوڕەييايەكم بەديــاری بــۆ هاوڕێيەكــم كــڕی بەبۆنەی ژن هێنــان بــوو، ياخــود بۆنەيەكــی ديكــە، بــاش لەبيــرم نەمــاوە، پليتێكــم بەنــاوی خۆمــەوە دايــە خاوەنــی دوكانەكــە كــە نــاوی هاوڕێكــەم و ناوونيشــانەكەيم لەســەر نووســيبوو، تەكليفــم لێكــرد بــۆ ئــەو ناوونيشــانەی ڕەوان بــكات كــە ماڵــی هاوڕێكــەم بــوو.

بــەڵام خــوای پــەروەردگار ويســتی وابــوو ئــەو كابرايــەی كــە ڕاســپێردرابوو دياريەكــە بگەيەنــێ تەنهــا ســەيری ئــەو ڕووەی پســوڵەكەی كردبــوو كــە نــاوو ناونيشــانی منــی لەســەر جێگيــر كرابــوو، لەبــری نــاوی ئــەو كەســە كــە دەبــوو دياريەكــەی بــۆ ڕەوان بكــرێ، بۆيــە بەهەڵــە ســوڕەيياكە دەهێنێتــە ماڵــی ئێمــە، قــەدەری خــوا ئــەو كاتــە منيــش لەمــاڵ نەبــووم، ئەندامانــی خێزانەكەشــم

وایـان زانیبـوو بۆخۆمانـم کڕیـوە، یاخـود برادەرێکـم بەدیـاری بـۆی نـــاردووم، کابـــرا دێتـــە ژوورەوەو لەشـــوێنێکی گونجـــاوی ژووری پێشـــوازی دەیبەســـتێ و دواتـــر دەڕوا.

باوکـم هەواڵەکـە دەبیسـتێ و دێتـە ژوورەوەو سـەیری دیمەنەکـە دەکات، هێشـتا مـن نەگەڕابوومـەوە ماڵـەوە، ئەمیـش دوای ئـەوەی سـەیری سـوڕەییاکە دەکات دەگەڕێتەوەو دەچێتـە ژووره بچووکەکەی خـۆی، دەرگاکـەش لەسـەر خـۆی دادەخا، بـەو پەڕی هەسـت کردن بـە ئێـش و ئـازارو داخ و ئەسـەفەوە لەژوورەکەیـدا دەمێنێتـەوە، بیـر دەکاتـەوە کـە کوڕەکـەی دوای ئـەو هەمـوو پـەروەردە دوورو درێـژو ڕاهێنانــە ئێســتا ڕووی کردۆتــە زێدەڕۆیــی و گرنگــی دان بەدونیــاو خۆشـیەکانی، هەروەهــا پشـتی کــردووە لــەو ئامانــج و مەبەســتەی کـە باوکـی ئەمـی لەسـەر پـەروەردە کـردووە.

کاتێـــك گەڕامـــەوە ماڵـــەوە، توشـــی شـــۆك بـــووم بـــەو کارە کـــە هیـچ دەسـتێکی منـی تێـدا نەبـوو، باوکـم دەرسـێکی پێـدام هەرگیـز لەبیــری نەکــەم، سەرزەنشــتی زۆری کــردم و وازی لــێ نەهێنـــام تـــا دوای ئـــەوەی کـــە بـــۆم ڕوونکـــردەوەو زانـــی ئـــەو شـــتە بەهەڵـــە ڕوویـــداوەو مـــن مەبەســـتێکی لـــەو شـــێوەیەم نەبـــووە.

## هەڵوێستی باوكم لەبارەی تەصەووف و بیدعە

**تەصەوفی پاك خێراترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە بەروبوومی ئیمان:**

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ باوەڕی تەواوی بەوە هەبوو تەصەوفی خاوێن ناوەڕۆك و كاكڵەی ئیسلامە، جەختی لەسەر ئەوە دەكردەوە ئەگەر مسوڵمان هەقیقەتی تەصەووف نەچێژێ، ئەوا هەر لە چوارچێوەی ڕواڵەتدا دەمێنێتەوەو ناگاتە ناوەڕۆك، وە ناتوانێ لە بازنەی ئیسلامدا بەرز بێتەوە بۆ هەقیقەت و ڕاستی ئیمان.

هەروەها پێداگیری لەسەر ئەوە دەكرد تەصەووف چەند وشەیەك نییە بەمیرات جێبابێ و یەك بۆ یەكی بگوازێتەوە، هەروەها زانستێكیش نیە ئەزبەر بكرێ، بەڵكو حاڵێكە بەبەر مسوڵماندا دەكرێ و بەرزی دەكاتەوە تا ئەو ئەندازەیەی خوای پەروەردگار (بەچاوی دڵ) دەبینێ، ئەگەر مسوڵمان بەرز نەبێتەوە بۆ ئاستی ئەو بینینە، ئەوا دەقەكانی ئەحكامی شەرعی و هەموو ئەو شتانەشی كە دەوری دەدەن، بەتەنیا ناتوانن گرەنتی پابەند بوونێكی هەقیقی بە فەرمانەكانی خوای پەروەردگاری پێ بدەن.

پابەند بوونی هەقیقی بە فەرمانەكانی خوای پەروەردگار لە ئەنجامی گەورە بوون و گەشەسەندنی بەروبوومی ئیمان لەدڵدا

درووسـت دەبـێ، باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ دەیگـوت: ئـەو جـۆرە ئیمانـە بەروبوومەكـەی بریتییـە لـە: خۆشویسـتنی خـوا، بەگـەورە دانـان (تەعزیمـی)، لێترسـانی، ڕازی بـوون پێـی، متمانـە پـێ كردنـی، پشـت پـێ بەستنی، هەروەهـا خـۆ ون كـردن لەغەیـری خـوا لەهەمـوو ئـەو بـەرو بومانـەدا.

لـە ئەنجامـی نـەش و نمـای ئـەو بەروبوومانـەی ئیـمان كـە باسـمان كـرد بینینـی خـوا لەلایـەن بەنـدەوە تەحقیـق دەبـێ، هـەر ئەوەشـە وای لێـدەكات لـە قەدەغـە كراوەكانـی خـوای پـەروەردگار بپرینگێتـەوەو وای لێـدەكات ڕێـك و ڕاسـتبێ لەسـەر پابەنـد بوونـی بـە واجبـەكان و ئادابـە شـەرعیەكان، بەهـۆی ئـەو ئیمانـەوە وای لێـدێ لەهەمـوو حـاڵ و بارودۆخێكـدا لەگـەڵ خوابـێ، هەروەهـا لەكاتـی هەسـت كردنـی بەچاودێـری خـوا بەسـەریەوە، لەكاتـی زیكـر كـردن هەسـت و شـعوری كارلێـك دەكـەن لەگـەڵ: ترسـان لەخـواو، خۆشویسـتنی خـواو، ڕازی بـوون بەخـواو، متمانـە كـردن بەخـوا، تەصەووفـی ڕاسـت هیـچ مانایەكـی دیكـەی نیـە غەیـری ئـەوەی كـە مسـوڵمان دەگەیەنـێ بـە پلـەی هەسـت كـردن بـە بینیـن و حـزوری خـوا، یاخـود بەهـۆی تەصەووفـەوە خـۆی دەگەیەنێتـە بەروبوومـی ئیـمان، یاخـود دەیگەیەنێتـە هەقیقەتـی یەكخواپەرسـتی، ئەوانـەی باسـم كـرد چەنـد بێژەیەكـی جیـا جیـان بـەڵام هەموویـان یـەك مانـا دەگەیەنـن.

باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ بۆچوونـی وابـوو حەقیقەتـی ئـەو تەصەووفـە ڕاسـت و درووسـتە لەنێـو كتێبـی ڕیسـالەی قوشـەیریدا

بـە ئاشـكرا دەبیـنرێ، ئەمـەش بەهـۆی زۆریـی پەیوەسـت بوونـی کتێبەکەیـە بـە قورئـان و سـوننەتەوە، هـەر لەبـەر ئـەو هۆیـەش باوکـم ڕیسـالەی قوشـەیری زۆر دەخوێنـدەوەو هۆگـری بووبـو، کاتێکیـش لـە کۆتاییەکانـی تەمەنیـدا چاوەکانـی بێهێـز بووبـون و نەیدەتوانـی بیخوێنێتـەوە بانگـی منـی دەکـرد بـۆ ئـەوەی لـەلای دابنیشـم و بەشـێکی زۆری کتێبەکـەی بـۆ بخوێنمـەوە.

ئـەو کاتـەش کـە کۆمەڵێـك قوتابـی داوایـان لێکـرد کتێبێکیـان بـۆ هەڵبژێـرێ لەبـارەی تەصەووفـەوە بـۆ ئـەوەی لـەلای ئـەو بیخوێنـن، ڕیسـالەی قوشـەیری بـۆ هەڵبـژاردن، بیـرم دێ زیاتـر لـە جارێـك ئـەم کتێبـەی بـە هەنـدێ لـە قوتابیـان دەگوتـەوە، منیـش لـە زۆربـەی دەرسـەکان ئامـادە دەبـووم.

**پەیوەندی تەصەووف بە تەریقەتەکان:**

ئـــەو پێگەیـــەی باوکـــم بـــۆ تەصەووفـــی دانابـــوو بەمەرجـــی نەگرتبـــوو کـــە ئیلـــلا دەبـــێ ئـــەو کەســـە پابەنـــدی یەکێـــك لـــە تەریقەتەکانـی تەصـەووف بـێ، ئـەو پێویسـت بـوون و پێگـە بەرزەی تەصـەووف لـەلای باوکـم مانـای ئـەوە نەبـوو کـە تەریقەتەکانیـش هەمـان پێگـەو پێویسـت بوونیـان هەیـە، بەڵکـو ئـەو وای دەبینـی تەصـەووف و پابەنـد بـوون بـە تەریقـەت دوو شـتی جیـان.

کەواتـە: تەصەووفـی هەقیقـی ئـەو تەصەووفەیـە لـە قورئـان و سـوننەت وەرگیرابـێ، لەبـەر ئـەوەی هەوڵـدان بـۆ گەیشـتن بـە بەروبوومـی (ئیـمان بەخـوا) لەدڵـدا، ئـەو واجبەیـە قورئـان وێنـای

کــردووەو نەخشـــەی بـــۆ کێشـــاوە، ســـوننەتیش جەختـــی لەســـەر کردۆتـــەوە.

بـــەڵام هەرچـــی تەریقەتەکانـــە زۆرێـــك لـــە شـــێخەکان خۆیـــان نەخشـــەکەیان کێشـــاوە وەك ڕێگایەکـــی پەروەردەیـــی تەماشـــا دەکـــرێ بـــۆ گەیشـــتن بەهەمـــان مەبەســـتی ســـەرەوە، بۆیـــە ئـــەو تەریقەتانـــە نـــە لەڕابـــردوو نـــە لـــە ئێســـتادا خاڵـــی نەبوونـــە لـــە داهێنـــان و بیدعـــە.

لەسۆنگەی ئـــەوەوە باوکـــم زۆر پێداگیـــری لەســـەر تەصەووفێکـــی پـــاك و خاوێـــن دەکـــرد، بۆیـــە زۆر ســـوور بـــوو لەســـەر پابەنـــد بـــوون بـــە دەقەکانـــی قورئـــان و ســـوننەت، زۆر توندیـــش بـــوو لەســـەر بیدعـــەو وریایـــی زۆری دەدا لـــەو بـــارەوە، بۆیـــە بـــەردەوام ئـــەوەی بەپێویســـت دەزانـــی جیـــاوازی بکـــرێ لەنێـــوان تەصەووفـــی هەقیقـــی کـــە ئیـــمان بەبـــێ ئـــەو جـــۆرە تەصەووفـــە زینـــدوو نامێنـــێ، لەگـــەڵ تەریقەتەکانـــی تەصـــەووف کـــە زۆرجـــار دەبنـــە چاڵـــی کۆبونـــەوەی زۆرێـــك لـــە بیدعـــەکان.

هەروەهـــا دەیگـــوت: {تەریقەتەکانـــی تەصـــەوف بەگشـــتی خاڵـــی نیـــن لـــە بیدعـــە، بـــەڵام هەرچـــی تەریقەتـــی نەقشـــبەندیە کەمتریـــن بیدعـــەی تێدایـــە}، زۆرێـــك لە خەڵكـــی لەنـــاوەوەو دەرەوەی ســـووریا ڕوویـــان لـــە باوکم دەکـــرد بەئومێـــدی ئەوەی یەکـــێ لـــەو تەریقەتانەی تەصەوفیـــان پـــێ بـــدات و ئەوانیـــش خۆیانـــی پێـــوە پابەنـــد بکـــەن، لەسۆنگەی ئـــەوەوە کـــە باوکـــم زۆر حـــەزی بـــە تەصـــەووف دەکـــردو زۆر بەتونـــدی پابەنـــد بـــوو بـــە بنچینـــەو ئادابەکانیـــەوە بۆیـــە داوایـــان لێدەکـــرد، هـــەر لەبـــەر ئەمـــەش گومانیـــان نەبـــوو لـــەوەی باوکـــم

وەڵامـی ئـەو داوایـەی ئـەوان دەداتـەوەو تەریقەتێکیـان پـێ دەدا، بـەڵام تووشـی سەرسـوڕمان دەبـوون کاتـێ لـەو بـارەوە داوای لێبوردنـی لـێ دەکـردن، ئەگـەر زۆر پێداگیریشـیان بکردایـە پێـی دەگوتـن: [مـن شایسـتەی ئـەو کارە نییـم]، ئامـۆژگاری دەکـردن لەبـری ئـەوەی داوای دەکـەن زۆر زیکـری خـودا بکـەن، لەوانەشـە بەرچاوڕوونـی پێدابـن لەسـەر چەنـد ویردێـك بـۆ ئـەوەی لەسـەری بـەردەوام بـن، هـەروەك چۆن ئامـۆژگاری دەکـردن بـەوەی خۆیـان دوور بگـرن لـە قەدەغـە کـراوەکان، بەتایبـەت لەمەسـەلەی پـارەو خـواردن، هـەروەك ئامۆژگاریشـی دەکـردن دەسـت بـە قورئـان و سـوننەتەوە بگـرن و جێگیـر بـن لەسـەر پابەنـد بـوون پێـوەی.

زۆر جـار هەنـدێ لـە شـێخ و ئوسـتادەکانی تەریقەتـەکان لەهەمـوو لایەکـەوە سـەردانیان دەکـرد، قسـەو گفتوگۆیـان لەگـەڵ دەکـرد لەبـارەی جـۆر و ئادابـی تەریقەتـەکان، ئەویـش زۆر بـەڕوون و ڕاشـکاوی پێـی دەگوتـن: [تەصـەووف لای زۆرێـك لـە شـێخەکانی تەریقـەت بۆتـە پیشـە، بۆنـی ئامانجەکانـی گەیشـتن بـە ماڵـی دونیـای لـێ بـەرز دەبێتـەوە].

هەروەهـا پێـی دەگوتـن: [ئێـوە موریدەکانتـان بـەرەو جەوهـەرو ناوەڕۆکـی تەصەووفـی هەقیقـی ئاڕاسـتە ناکـەن، بەڵکـو پابەندیـان دەکـەن بـە پێدانـی هەنـدێ زیکـر، ئەویـش ڕۆژانـە ئەوەنـدە زیکـرە دەکات کـە بـۆی دانـراوە، پاشـان دەگەڕێتـەوە سـەر سەرکێشـی و ئـارەزووە دونیاییەکانـی بـەو شـێوەیەی خـۆی حـەزی پـێ دەکات، کەواتـە: دەردەکـەی چارەسـەر نابـێ، دڵـی هـەر بەنەخۆشـیە

زۆرەكانیـەوە دەمێنێتـەوە، بێ ئـەوەی هیـچ گۆڕانكارییەكی بەسـەردا بـێ[1]، ئەمـەش پێچەوانـەی ئـەو شـتەیە كـە تەصـەووف دەیـەوێ}.

بـەم شـێوەیە باوكـم زۆر پابەنـد بـوو بـە تەصـەووف و وردەكاریەكانـی، زۆر كارلێكـی لەگـەڵ تەصـەووف كردبـوو، بـەڵام لەهەمـان كاتـدا زۆر ڕقـی لـەو بیدعانـە دەبـۆوە كـە لەڕێگـەی تەصەووفـەوە دزەیـان دەكـرد، ئـەو بیدعانـەی بەنـاوی تەصـەووف و لەژێـر چەتـری تەصـەووف قـوڵ بوونەتـەوە بەنێـو ژیانـی زۆرێـك لــە شـێخەكان و موریدەكانیــان، پێشــتریش لەكاتــی باســكردنی هۆكارەكانــی كـۆچ كردنــی باوكــم بــەرەو شــام ئــەوەم باســكرد كــە یەكــێ لەهــۆكارەكان ئــەو كارەی هەنــدێ لــە شــێخەكانی تەریقــەت بــوو كـە ڕایاندەسپاردن بـەوەی كۆڵكـە داری پێویسـت بـۆ شـێخەكانیان كـۆ بكەنـەوە بـۆ خۆگـەرم كردنەوەیـان لـەوەرزی زسـتان، وەك گوتـم: باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ كۆڵكـە داری بـە پـارەی خـۆی دەكـڕی و بـۆ شـێخی ڕەوان دەكـرد، بـێ ئـەوەی بهێڵـێ شـێخ ئـەو شـتە بزانـێ، تەصـەووف لـە ژیانـی باوكمـدا هەوڵ و ماندوبـوون بـوو، نـەك چەنـد قسـەو زاراوەیـەك هـەر بیڵـێ و بیڵێتـەوە، بەتەنیـاو دوور لـە خەڵكـی دەمایـەوەو دەروونـی خـۆی ڕادەهێنـا لەسـەر نغـرۆ بـوون لـە بینینـی خـواو هەسـت كـردن بـە چاودێـری خـوا بەسـەریەوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە خـۆی بـەدوور

---

(١) مەبەسـتی لـە نەخۆشـیەكانی دڵ وەك: خۆبەگـەورە زانیـن و حەسـودی و بەخـۆ سەرسـام بـوون و مەغـروری و خۆشویسـتنی دونیایـە، هەروەهـا حیقـدو ڕق و كینـە.

دەگرت لە تێكەڵاو بوون لەگەڵ خەڵكی، مەگەر لەسنووری مامەڵەیەكی شەرعیانە، بەردەوام بەم شێوەیە تێدەكۆشا لەگەڵ نەفسی خۆی، بۆ ئەوەی دڵی پاك بێتەوە لە ژەنگ و ژاری ئارەزووەكان و نەخۆشیە شاراوەكان كە دەبنە هۆكاری دوور كەوتنەوەی خەڵكی لە خوای پەروەردگار.

زۆر بێزاریش دەبوو لەو كەسانەی تەصەووف دەكەنە چەند قسەیەكی كەڵەكە بووی فەلسەفەی كەلامی، كەسانێك قسە دەكەن لەبارەی وەجدو، قەبظ و، بەست و، فەناو، بەقاو، حاڵ[1]، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە هەقیقەتی ئەو وشانە دوورو بێئاگان، من زۆر جار ئەو خەڵكانەی بەم شێوەیەن بەو كەسە دەچوێنم كە وەسفی عەرەق بۆ خەڵك دەكات كە چەندە بەتامەو چۆن دەتخاتە مەست بوون، كەچی خۆشی تامی نەكردووە.

ئێستا پێم وایێ مەودای بەپیرۆز زانینی تەصەووف و توند دەست پێوە گرتن و تەفاعول لەگەڵ كردنیم لەلایەن باوكمەوە شی كردەوە، نەك هەر قسەی لەبارەوە كردبێ و دانی پێدا نابێ بەڵكو لەگەڵیدا ژیاوە، لەمە بەدوا پێویستە هەڵوێستەكانی ڕون بكەمەوە لەبارەی هەندێ لەو شتانەی كە گفتوگۆو موناقەشەی زۆر هەڵدەگرن، یاخود هەڵوێستەكانی ڕوون بكەمەوە لەبارەی ئەو بیدعەو داهێنراوانەی كە بۆیەی تەصەووفیان لێ دراوەو هیچ پەیوەندیەكیان بە تەصەووفەوە نییە.

---

(١) ئەمانە چەند زاراوەیەكن لە زانستی تەزكیەو تەصەووف ئاماژەیان پێ كراوە، لەڕاستیدا هەموو مسوڵمانێكی تامەزرۆو دڵ پڕ تاسە پێویستە خۆیانی لێ بەهرەمەند بكات (وەرگێڕ).

**ڕابیتە و ئەصڵەكەی:**

مانای ڕابیتە كە زۆرێك لە شێخەكانی تەریقەتی نەقشبەندی دانی پێدا دەنێن و جەختی لەسەر دەكەنەوە بریتیە لەوەی: مورید لەسەرەتای ڕووكردنە خوا شێخەكەی خۆی وێنا دەكات، ئەو وێنا كردنەی شێخەكەی دەكاتە دەستپێكی زیكرو یادی خوای پەروەردگار، شێخەكان موریدەكانیان وەسیەت دەكەن بەو كارەو تێیان دەگەیەنن كە ئەمە یەكێكە لە پێویستیەكان و هەر دەبێ بەو شێوەیە بێ، هۆكاری پێویست بوونەكەشی بە بۆچوونی وان ئەوەیە: مورید ناتوانێ ئیلهام لەزیكر كردنی خوا وەرگرێ ئەگەر لەسەرەتاوە شێخەكەی خۆی وێنا نەكات، واتە: شێخەكەی ئەو توانایەی پێ دەبەخشێت بۆ ئەوەی بتوانێ بەزیكرو چاودێری خۆ كردن بچێتە خزمەتی خوا.

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ زۆر بەتوندی نكوڵی لەو ڕابیتەیە دەكرد كە باسمان كرد، زۆر بەتوندی نكوڵی لەو شێخانە دەكرد كە بانگەشەی ئەو كارەیان دەكرد، ئەو موریدانەش كە مومارەسەی ئەو كارەیان دەكرد.

جارێكیان لە یەكێ لە دەرسە گشتیەكانی خۆمدا وای پێویست كرد باس لەو جۆرە ڕابیتەیە بكەم، ڕوونم كردەوە ئەو جۆرە سلووك و ئاڕاستە كردنە درووست نیە، ئاماژەم بەوە كرد تەصەووف بەرییە لەو بیدعەیەی بەبەریدا كراوە.

ئـەو قسـەیەم گەڕابوویـەوە بـۆ شـێخێكی تەریقەتـی نەقشـبەندی لـە جەزیـرە، ئەویـش سـەردانی باوكمـی كـرد بـۆ ئـەوەی سـكاڵام لـێ بـكات لـەلای ئـەو، لـە سۆنگەی ئـەوەی باوكـم زۆر بەتونـدی دەسـتی بـە تەصەووفـەوە گرتبـوو بەرگـری لـێ دەكـرد، وا گومانـی بـرد باوكـم بـەو قسـانەی مـن ڕازی نابـێ كـە گوتوومـە ڕابیتـە بیدعەیـەو درووسـت نییـە، شـێخەكە لـەلای باوكـم دادەنیشـێ بـۆی دەگێڕێتـەوە مـن چیـم گوتـووەو چـۆن نكوڵیـم لـە ڕابیتـە كـردووە، خۆشـم لـەوێ ئامـادە بـووم كـە سـكاڵاكەی لێكـردم، بـەڵام عادەتـی خـۆم وابـوو لـە مەجلیسـی باوكمـدا قسـەم نەدەكـردو بێدەنـگ دەبـووم مەگـەر خـۆی داوای بكردایـە قسـان بكـەم یاخـود زۆر پێویسـتی بكردایـە قسـان بكـەم.

دوای ئـەوەی شـێخەكە لـە قسـەكانی بوویـەوە باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ پێـی گـوت: ئـەوەی سـەعید گوتوویەتـی ڕاسـتە!

پاشـان پێـی گـوت: مسـوڵمان كاتـێ دادەنیشـێ بـۆ ئـەوەی زیكـری خـوا بـكات پێویسـت نـاكات پێغەمبـەری خـواش ﷺ لەبـەر چـاوی خـۆی وێنـا بـكات چ جـای شـێخەكەی؟

پاشـان قسـەكانی لەبـارەی ئەصـڵ و بنچینـەی مەسـەلەی ڕابیتـە درێـژە پێـداو گوتـی: {ڕابیتـە لەسـەردەمی شـێخانی پێشـووی تەریقەتـی نەقشـبەندی شـتێك نەبـوو غەیـری خۆشەویسـتی موریـد بـۆ شـێخەكەی، ئەمـەش شـتێكی ڕاسـت و درووسـتەو كـەس ناتوانـێ نكوڵـی لـەوە بـكات كـە دەبـێ موریـد شـێخەكەی خـۆی خـۆش بـوێ، چونكـە پەیوەنـدی نێـوان شـێخ و موریـد پەیوەنـدی

پـەروەردەو سـلووك گرتنـە بـەرە، موریدیـش ناتوانـێ گوێڕایـەڵ و ملكەچـی ئـەو پـەروەردە كردنـە بـێ لەلایـەن شـێخەكەیەوە ئەگـەر خۆشـی نـەوێ و متمانـەی پـێ نەبـێ، بـەڵام ئـەو جـۆرە خۆشەویسـتیەش پێویسـتە تەنهـا بـۆ ئـەو جـۆرە شـێخە بـێ كـە عیلـم و سـلوكی بەیەكـەوە گرێـداوە، شـێخێك بـێ كـە ئیسـتیقامەو بەردەوامـی هەبـێ لەسـەر بەرچـاو ڕوونـی و ئـەو ڕەوشـت و ئاكارانـەی ئیسـلام پەسـندیان دەكات، هەروەهـا دەبـێ كەسـێكی نموونەیـی بـێ لـە دونیـا بەكەمگـری و خـۆ دوورگرتـن لـە قەدەغـە كـراوەكان و تەقـواو خـۆ پارێـزی}.

پاشـان باوكـم بـە شـێخەكەی گـوت بـۆ زیاتـر ئاشـنا بـوون و شـارەزابوون لـەو قسـانەی كـردم بگەڕێـوە بـۆ مەكتوباتەكانـی ئیمامـی ڕەببانـی ئەحمـەدی سـەرهەندی[١].

---

(١) ئـەو شـوێنەی كتێبەكـە كـە باوكـم بەشـێخەكەی گـوت بیخوێنێتـەوە مەكتوبـی ژمـارە سـەدو نـۆ بـوو، كـە بریتییـە لـە: بابەتـی سـوور بـوون لەسـەر زیكـر كردنـی بـەردەوام، لەگـەڵ چۆنیەتـی زیكـر كـردن، ج١، ص١٦١، چاپـی ئیسـتەنبوڵ، دەڵێـم: بـەڵام (سـادەی ئالـی خەزنـەوی) لـە ناوچـەی جەزیـرە سـوورن لەسـەر ئـەوەی كـە ڕابیتـەی نەقشـبەنی تەنهـا بـەو مانایـەی یەكەمـی كـە باسـمان كـرد ڕاسـت و درووسـتە، كـە بریتییـە لـە وێنـا كردنـی شـێخ لەلایـەن موریـدەوە لەكاتـی زیكـر كـردن، بـۆ ئـەم ڕایەشـیان پشـت بـە قسـەكانی شـێخ: مەولانـا خالیـدی نەقشـبەندی و شـێخ ئەمیـن ئەلكـوردی دەبەسـتن، خـوای پـەروەردگار پشـت و پەنـای هەمـوو لایـەك بـێ و بمانخاتـە سـەر ئـەو ڕێگایـەی كـە ڕاسـت و درووسـتە، بمانپارێـزێ لـە هەڵخلیسـكان لـە قسـەو لـە كردەوەكانمـان، پەنامـان بـدات لـە دەمارگیـری بـۆ نەفـس و ئارەزوومـان.

دەڵێـم: ئـەو داهێـنراوو بیدعـە مەترسـیدارە بـۆ مەسـەلەی ڕابیتـە هەنـدێ لـەو شـێخانەی تەریقـەت دایانهێنـا کـە بـەم دواییـە پەیـدا بـوون، بـۆ ئـەوەی کـەوا لـەڕووی بەپیـرۆز زانیـن و بەگەورەزانینیان سـوودی لـێ ببینـن.

لـە تۆمارێکـی دەنگیـدا چەنـد قسـەیەکی ئـەو شـێخەم بیسـت کـە هاتبـووە لای بابـم و لەسـەر مەسـەلەی ڕابیتـە سـکاڵای لـێ کردبـووم، تۆمـارە دەنگییەکـە دەرسـێکی گشـتی ئـەو شـێخە بـوو، لە دەرسـەکەدا بەخەڵکـی دەگـوت: (خۆشویسـتنی شـێخ لەسـەرووی خۆشویسـتنی خواوەیــە)، پاشــان پێــی دەگوتــن: (لەوانەیــە هەندێکتـان ئـەو قسـەیەتان زۆر پـێ قـوڕس بـێ و پێتـان نامـۆ بـێ، بزانــن هـۆکاری ئـەوەی کـە دەڵێـم: خۆشویسـتنی شـێخ لەپێشـی خۆشویسـتنی خوایـە ئەوەیـە: خـودا ئەوەنـدە گـەورەو بـەرزو بڵنـدە دڵــی موریــد ناتوانــێ ڕاســتەوخۆ بەرگــەی ئــەو خۆشەویســتیە بگـرێ، بـێ ئـەوەی ڕێگایەکـی لـەم شـێوەیە بگرێتـە بـەر، ڕێگاکەش ئەوەیــە شـێخی خـۆش بـوێ، ئەگــەر شـێخی خۆشویسـت ئــەو خۆشویسـتنەی پەلکێشــی دەکات بـۆ خۆشویسـتنی خـوا، لێـرەوە مانـای ئـەو قسـەیەمان ڕوون دەبێتـەوە کـە دەڵێیـن: خۆشویسـتنی شـێخ پێـش خۆشویسـتنی خوایـە!!)[١].

---

(١) ئەوە دەقی قسەی شێخەکەیە:

(هەتــا لــە کتێبەکانــی تەریقەتیــش ئــەو عیبارەتــە هەیــە، بــەڵام پێویســتە ئینسـان پەلـە نـەکات، بەڵکـو تێبـگات، عیبارەتەکـە دەڵێ: خۆشویسـتنی شـێخ لەپێـش خۆشویسـتنی خواوەیـە، پەلـە مەکـەن تـا قسـەکە شـی دەکەینـەوە،

هیچ گومانی تێدا نیە ئەو قسەیە قسەیەكی زۆر دوورە لە ڕاستی، قسەیەكە خراپی و خوارو خێچیەكەی ڕازێنراوەتەوە بە باتڵ و پووچی، هەموو ئینسانێك لەخواڕسكیدا خۆشویستنی خوای تێدا سرووشتێنراوە، بەڵام تا ئێستا كەس نەیگوتووە: خۆشویستنی شێخی تەریقەت لە ناخی هەموو ئینسانێكدا سروشتنێراوە، سیفاتە جێگیرو نەگۆڕەكانی خوای بێوێنە لە

---

مانای ئەوەی لەپێش خۆشویستنی خوایە ئەوەنیە كە پێویستتر بێ، یان گەورەتر بێ، یان باشتر بێ لە خۆشویستنی خوا، نەخێر، دەڵێین: لەپێش خۆشویستنی خوایە واتە: مورید سەرەتا ناتوانێ بگاتە خۆشویستنی خوا لەبەر ئەوەی دوورە لە خوا، خوای پەروەردگاری جیهانیان پەروەردگارێكی گەورەو مەزنە، بەندەش بێهێزو بێدەسەڵاتە، هیچ بۆنەیەك و خاڵێكی هاوبەش نییە لەنێوانیان، بەڵام بەپێچەوانەوە بۆنەو تەناسوب و هاوبەشی هەیە لەنێوان شێخ و مورید، لەبەر ئەوەی هەردووكیان وەچەی ئادەمن، لەبەر ئەوەیە دەڵێین: خۆشویستنی شێخ لەپێشترە، واتە: مورید دەتوانێ پەیوەست بێت بە شێخ، خۆشویستنەكەش لەبەر خودی شێخەكەی نییە، نەخێر ئەوەی پێویستە خۆشویستنی خوایە، بەڵام پەیوەست دەبێ بە خۆشویستنی شێخەكەی بۆ ئەوەی فێری خۆشویستن بێ، ئەگەر فێری خۆشویستن نەبێ قورسە ڕاستەوخۆ بگاتە خۆشویستنی خوا، دوای ئەوەی كە پەیوەست دەبێ بە شێخەكەی و خۆشویستنی ئەو بەدەست دێنێ، ئەو خۆشویستنەی شێخەكەی خۆشویستنێكی مەجازیە، دوای ئەوەی شێخەكە لەنێوانیان -واتە لەنێوان خواو مورید- هەڵدەستێ بەتەنیا خۆشویستنی خوا دەمێنێتەوە).

منیش دەڵێم: ئەم قسەیەی ئەو شێخە بەراوورد بكەن لەگەڵ فەرمایشتی خوای پەروەردگار بۆ ئیمانداران كە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴿١٦٥﴾ ﴾ البقرة، زۆر جوان هەست بەوە دەكەی ئەو شتەی ئەو دەیڵێ تەواو پێچەوانەیە.

عەزەمەت و گەورەیی و مەزنی و تواناو دەسەڵات و فراوانی ڕەحمەتی، هەموویان ئەوەمان پێدەڵێن: ئینسان دەتوانێ بەڕێگایەکی ڕاستەوخۆ پەرستراوو درووستکراوی خۆی خۆش بوێ، واتە: ئەو سیفەتانە ئینسان لەخوا نزیك دەخەنەوە نەك دووری بخەنەوەو دەستەپاچەی بکەن، ئەگەر مورید شێخەکەی خۆی خۆشویست لەبەر خۆشویستنی خوا خۆشی دەوێ، نەك بە پێچەوانەوە وەك ئەوەی ئەو شێخە دەیڵێ.

خەڵکی دەچوونە مەجلیسی ئەبو یەزیدی بەستامی (قدس الله روحه) خۆشەویستی زۆری خۆیان بۆ دەردەبڕی، ئەمیش ڕازو نیازی لەگەڵ پەروەردگاری دەکردو دەیگوت: پەروەردگارا! تۆ چاك دەزانی ئەوانە هاتوونەتە لای تۆ، بەڵام منییان لای تۆ بینیوە لێمی قەبوڵ بکە.

ئەوە قسەی ڕاست و تەواوە، کە لەقوڵایی بەندایەتی و خۆبەکەمزانینێکی ڕاستگۆیانە سەرچاوەی گرتووە، نەك ئەوەی تر کە شێخەکە دەیڵێ، ئەگەر ئینسانێك هەرگیز خوای نەناسیبێ و خۆشی نەویستبێ مەحاڵە بتوانێ ئەو شێخەی خۆش بوێ کە نواندن لەبەرامبەر خەڵك دەکات، وای پێشان دەدا کە خوای خۆش دەوێ، مەگەر لەبەر دەستکەوتێك و سوودێکی دونیایی و شەخسی خۆشی بوێ.

**ئادابەکانی زیکر کردن و هەڵوێستی باوکم لە خۆلارکردنەوە لەکاتی زیکر کردندا:**

باوکم لەهیچ شتێکی دیکە بەوێنەی زیکر کردنی خوای پەروەردگار خشوع و ئەدەب و سەربادانی لێ نەبینراوە، فەرمانی بەمە دەکردو بانگەوازی بۆ دەکرد، باوکم هەمان ڕاوبۆچوونی جمهوری زانایانی هەبوو لەوەدا کە خۆبادان لەکاتی زیکر کردنی خوا درووست نیە، زۆربەی کات ئەو خۆبادانە پێی دەگوترێ سەما، لەمەشدا بەڵگەی بە قسەکانی عیززی کوڕی عەبدوسسەلام لە کتێبی (قواعد الأحكام)و قسەی (ئیبن حەجەری هەیتەمی لە بارەی واز هێنان لە هات و هاوار لەکاتی زیکر کردن) دەهێنایەوە، لەگەڵ قسەی زانایانی دیکەش لەو بارەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێزی لە بۆچوون و هەڵێنجانی زانایانی دیکەش دەگرت، بۆیە نکوڵی ئەو کارەی نەدەکرد، ئەگەر لە مەجلیسەکانی زیکر ئەو کارە بکرابوایە ئەم لەگەڵیاندا بەژداری نەدەکرد.

جارێکیان لە دانیشتنێکدا لەگەڵی بووم، دانیشتنەکە کۆمەڵێك لە ئەهلی عیلمی تێدابوو، هەروەها خەڵکێکی زۆریش لەوێ بوون، گوێیان لە هەندێ لە سروود بێژان گرتبوو، چەند دەقیقەیەکی پێچوو هەموویان هەڵسانەوە سەر پێ و دەستیان کرد بە زیکر کردن بەشێوەیەکی ڕێك و پێك و ڕیکخراو

بەیەكەوە سەریان بەرز دەكردەوەو نزمیان دەكردەوە ئەو جۆرە ڕێكخستنە پێی دەگوترێ: (الحضرة)[1].

باوكم لەگەڵ ئەواندا هەڵنەستا، بەڵكو تەنیا لەشوێنی خۆی مایەوەو لەگەڵ ئەواندا زیكری خوای پەروەردگاری دەكرد، هەر كەسێك تەماشای بكردایە پارچەیەك لە ئەدەب و خشوع و هەست كردن بەحزوری خوای تێدا دەبینی، هەرچەندە دواتر هەندێ كەس كە لە دانیشتنەكە ئامادە بوون دەیانگوت: كە باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ دوای ئەوە هەڵساوەتەوەو حاڵێك گرتوویەتی نەیتوانیوە لەسەر ئەو هێمنی و ئارامیەی بەردەوام بێ، بەڵام من ئێستا هیچ شتێكی لەو شێوەیەم بەخایاڵدا نایە، بۆیە نە نكوڵی لێ دەكەم بڵێم وانیە، نە دانیشی پێدا دەنێنم بڵێم وایە.

كارەكە هەرچۆنێك بێ، ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەوەیە لەكاتی زیكر كردندا هەڵنەدەستاوە بۆ سەما كردن و لەخۆهەڵدان لەگەڵ ئەوانەی دەورو بەری، واتە: نە خۆی ئەو كارە دەكرد نە دانیشی پێدا دەهێنا، بەڵام ئەگەر حاڵ گرتبێتی و لەو چوارچێوەیەی دوور خستبێتەوە ئەوە شتێكی ترە.

ڕەحمەتی خوای لێبێ لەسەرەتای حەفتاكاندا چووە عەمان، موحەممەد تۆفیقی كوڕیشم یاوەری بوو، گوتی: {لە مزگەوتی حوسەین نوێژی بەیانیمان ئەنجامدا، وا ڕێككەوت لە مزگەوتەكە مەجلیسێكی زیكر هەبوو، ئەویش (باوكیشم)

---

(١) دانیشتنەكە لە ماڵی خوا لێی خۆشبێ سەیید مونتەصیری كەتتانی بوو.

لەگەڵیانـدا بـەژداری کـرد، دوای کەمێـك هەموویـان هەڵسـانەوە بـۆ (الحـضرة) بـەڵام ئـەم لەشـوێنی خـۆی مایـەوە بـەو پـەڕی ئـەدەب و خشـوعەوە لەگەڵیانـدا زیکـری خـوای گـەورەی دەکـرد، دوای کەمێـك هەڵسـایەوەو دەسـتەکانی خسـتە سـەریەك وەك شـێوەی ئەو کەسـەی لەنوێژدایـە نیشـانەکانی حـاڵ لێهاتنـی تێـدا دەردەکـەوت، حـاڵ لێهاتنەکەشـی وای لێکـرد لـە هەمـوو ئەوانـەی دەورو بـەری خـۆی بێئـاگا بـێ، کاتێـك خەڵکەکـە دانیشـتن و (الحضرة)کەیـان کۆتایـی هـات باپیـرەم لەسـەر ئـەو حاڵـەی کـە بـۆی درووسـت بووبـو وەك خـۆی و هـەر بەپێـوە (بەوەسـتاویی) مایـەوە، ئەمـەش بـووە جێـی سـەرنجی خەڵکەکـە، ئـەو دیمەنـەی باوکـم کـە بەتەنیـا مابـۆوە وای لـە زۆربەیـان کـرد بکەونـە نێـو شـەپۆلێك لـە تـرس و خشـوع، تـرس و خشـوعێك لـە زیکـرو یـادی خـواوە هەڵقوڵابـێ، ئـەو دیمەنـەی باپیـرم بـەدەم زیکـر کردنـەوە کاریگـەری تـەواوی لەسـەر ئـەو خەڵکـەو ئـەو شـوێنە درووسـت کردبـوو).

پوختـەی قسـان لـەو بـارەوە ئەوەیـە کـە: باوکـم ڕەحمەتـی خوای لێبـێ نکوڵـی لـە بەپێـوە وەسـتان نەدەکـرد لەکاتـی زیکـر کردنـدا، هەروەهـا نکوڵـی لـەوەش نەدەکـرد کـە هەنـدێ جـار سروودو ئـاواز یـاوەری زیکـر کـردن بـێ، بەڵکـو نکوڵـی لـە خۆبـادان و سـەما کـردن و لەخۆهەڵدانێـك دەکـرد درووسـتکراو (تصنـع) بـێ، واتـە: کەسـەکە بـە مەبەسـت و بەویسـتی خـۆی ئـەو کارە بـکات، نـەك لەبـەر کاریگـەری زیکـر کردنەکـە ئـاگای لەخـۆی نەمێنـێ و حاڵەتێکـی لـەو شـێوەیەی بەسـەردا بـێ.

**زانست و تەصەووف:**

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ هیچ نرخ و بەهایەكی بۆ ئەو تەصەووفە دانەدەنا كە بناغەو بنچینەكەی لەسەر زانستێكی ساغ و سەلیم نەبووایە بە: (كتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ)، هەروەها بۆچوونی وابوو تەواو كارلێك كردن لەگەڵ بەروبوومەكانی ئیهان كە هەقیقەت و كاكڵەی تەصەووفە نایەتە دی بەبێ ناسینی خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ، وە بەبێ شارەزا بوون لەو شەریعەت و ئەحكامانەی كە خوای پەروەردگار بەندەكانی خۆی پێ دەدوێنێ.

هەر كاتێك منی بینیبوایە كە زۆر لا دەكەمەوە بەلای كتێبەكانی تەصەووف و تەزكیە، ڕەخنەی لێ دەگرتم و سەرزەنشتی دەكردم، وەریدەگێڕام بەلای لێكۆڵینەوە لە فیقە و زانستی حەڵاڵ و حەرام، بە پێچەوانەوەش هەر كاتێك سەیری بكردایە كە زۆر ڕۆچوومە بەنێو لێكۆڵینەوە لە فیقە و تەفسیرو فەرموودەو سیرەو زانستی كەلام، بەهەمان شێوە بەڕەخنە گرتن و سەرزەنشت كردنەوە دەیگێڕامەوە بۆ چەند كتێبێكی دیاری كراوی زانستی سلووك و تەصەووف و بەرەو خواچوون.

ئەمەش مانای ئەوەیە كە دەیویست ئاگادارم بكاتەوە لەوەی زانست وەسیلەو هۆكارێكە هەر دەبێ پشتی پێ ببەسترێ و نابێ دەستی لێ بەربدرێ، تەحقیق بوونی تەصەووفیش كە بریتیە لە بەرو بوومی ئیهان مەبەست و ئامانجەكەیە، بەلام

ئینسـان ناتوانـێ بەدەسـتی بێنـێ و بەتـەواوی پێبـگا مەگـەر لەسـەر ڕێـگای زانسـت و بەرچـاو ڕوونـی.

چەندەهـا جـار ئـەو بەسـەرهات و چیرۆكانـەی بـۆ گێڕاومەتـەوە كـە بـاس لـە چارەنووسـی ئـەو كەسـانە دەكـەن بەبـێ بوونـی زانسـتێكی ئەوتـۆ بـە شـەریعەت و حوكمەكانـی حـەڵاڵ و حـەرام ڕێـگای بـەرەو خـوا چوونیـان گرتۆتـە بـەر، لـە كۆتاییـدا سـەریان لـە گومڕاییەكـی لەناوبـەر دەركـردووەو نەیانتوانیـوە خۆیانـی لـێ ڕزگار بكـەن.

لەوبـارەوە زۆر ئـەو بەسـەرهاتەی بـۆ بـاس دەكـردم كـە لـە شـێخ عەبدولقـادری گەیلانیـەوە گێڕدراوەتـەوە، پوختەكـەی ئەوەیـە: ڕۆژێكیـان لـە میحرابەكەی خۆی دادەنیشـێ و زیكـری خوای گەورە دەكات، گوێـی لـە دەنگێـك دەبـێ و پێـی دەڵـێ: ئـەی عەبدولقـادر! مـوژدەت لێبـێ، تـۆ تەكلیفـی شـەرعیت لەسـەر لاكەوت، كاتێ شـێخ ڕادەمێنـێ، بیـر لـە خاوەنـی دەنگەكـە دەكاتـەوە، بیـر لـەوە دەكاتەوە ئایـا چەنـدە دەگونجـێ خـوای پـەروەردگار تەكلیفـە شـەرعیەكانی خـۆی لەسـەر بەندەیـەك هەڵبگـرێ كـە هێشـتا نەمـردووەو لەدونیادایـە، ئـەو پرسـیارانە دەخاتـە ژێـر تیشـكی قورئـان و فەرمـوودە، شـتێكی دیـارو ئاشكراشـە شـێخ عەبدولقـادر زانایەكـی پایـە بـەرزو فەقیهێكـی شـارەزا بـووە، شـێخ هـاوار دەكات و دەڵـێ: (داڕزێـی، تـۆ دەناسـم ئـەی نەفـرەت لێكـراو)، دەڵـێ: دەنگەكـە دووبـارە گەڕایـەوەو گوتـی: ئەگـەر زانیـاری و شـارەزاییت نەبووایـە بـە شـەریعەت ئـەوا گومـڕام دەكـردی، ئـەم كارەم لەگـەڵ چەنـد

شـێخێكی تـر كـردووە كـە شـارەزا نەبوونـە بـە شـەریعەتی خـوا، لەنـاوم بـردوون و فڕێـم داونەتـە كۆتـا خاڵـی چاڵـی گومڕایـی.

باوكـم زۆر گرنگـی بـە سـەنەدی ئـەو چیرۆكـەو پلـەی ڕاسـت و درووسـتیەكەی نـەدەدا، بەڵكـو پێداگیـری لەسـەر تێگەیشـتن لـەو مانـاو مەبەسـتە دەكـردەوە كـە بەسـەرهاتەكە دەیگەیەنـێ، بەپێویسـتی دەزانـی كـە پەنـدو وانـەی لـێ وەربگیـرێ، شـارەزا نەبـوون بـە شـەریعەت مسـوڵمان دەخاتـە بـارودۆخ و ژینگەیەكـی وا كـە شـەیتان بـە ئاسـانی بتوانـێ لەخشـتەی ببـا، بـەڵام زانسـتی ڕاسـت و درووسـت و سـاغ بـە حوكمەكانـی شـەریعەت وەك قەڵایـەك وایـە بـۆ مسـوڵمان دەتوانـێ خـۆی تێـدا بپارێـزێ لـەوەی شـەیتان بیگاتـێ و لەخشـتەی ببـات.

دەبـێ خوێنـەر مۆڵەتـم بـدات بـۆ یەكـەم جـار لەوەتـەی دەسـتم بەنووسـینەوەی ئـەو كتێبە كـردووە لەبـارەی یـادەوەری و ژیاننامەی باوكـم تەعبیـر لـە هەسـت و شـعوری خـۆم بكـەم و كەمێـك دور بكەومـەوە لـەو مەنهەجـەی كـە تـا ئێسـتا پیـادەم كـردووە لـە نوسـینی ئـەو كتێبـە كـە بریتی بـووە لـە گواسـتنەوەی واقیعـی ژیانی باوكـم وەك خـۆی بـێ ئـەوەی هیـچ جـۆرە هەسـت و شـعورێكی خۆمـی تێـدا تێكـەڵ بكـەم لەبەرامبـەر ڕووداوەكان، بـەڵام لێـرەدا بەپێویسـتی دەزانـم كەمێـك لـەو (بابەتـی – مەوزوعـی) بوونـە دوور بكەومـەوەو تەعبیـر لەهەسـت و شـعوری خـۆم بكـەم بـەوەی كـە زۆر سەرسـام بـووم بـە باوكـم لەبـارەی ئـەو هاوسـەنگییە دەگمـەن و نایابـەی پیـادەی دەكـرد لەنێـوان گرنگیدانـی زۆری بـە زانسـتی

شەرعیی لەپێش هەموویانەوە حوكمەكانی حەڵاڵ و حەرام كە لەكتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ وەردەگیرێ، لەگەڵ ئەو گرنگیدانە زۆرەی بە خۆ ڕازاندنەوە بە تەصەووف كە بریتیە لە گەشە كردنی بەروبوومی ئیمان لەدڵ و دەروونـدا، لە بەگەورە دانانی خواو لێترسانی و خۆشویستنی و لێ ڕازی بوونی و متمانە پێ بوونی و پشت پێ بەستنی، نەمبینی باوكم لە ژیانیدا لایەكیان بەپێش ئەوەی تریان بخات و گرنگی زیاتری پێ بدا، بەڵكو هەریەك لە تەصەووف و زانست لەلای باوكم تەواوكەری یەكتر بوون و هەریەكەیان یارمەتی دەر بوون بۆ ئەوەی تریان.

### هەڵیت و پەڵیت (شەتەحات)ی هەندێ لە صۆفیەكان:

ئەم بابەتە یەكێكە لەو مەسەلانەی لێ دەرچوون و یەكلا بوونەوەی شتێكی قورسە، شەتەحاتی صۆفێتی وای كردووە زۆرێك لە مسوڵمانان ببنە دوو گرووپ لەبارەی هەڵوێستیان بەرامبەر بە تەصەووف، بووەتە هۆكاری ئەوەی گروپێك لە خەڵكی هەموو تەصەووف بەشتێكی پڕو پووچ و زەندەقەو دوور كەوتنەوە لە ڕێساو یاساكانی قوڕئان تەماشا بكەن، لە بەرامبەردا وای لە هەندێكی دیكەش كردووە بەشێوازێكی ڕواڵەتی لە بابەتەكە بگەن، ئەو عیبارەتە پڕ لە وەهم و پووچانە قەبوڵ بكەن لەسۆنگەی متمانە بوونیان بە بێژەرەكەی، یاخود ئەو كەسەی قسەكەی دەخرێتە پاڵ.

هەردوو گروپەكەش لەو بڕیارەیاندا لەهەق لایانداوەو كەوتوونەتە نێو ستەمێكی گەورە.

هەرچی گروپی یەكەمە دەستدرێژیان كردۆتە سەر تەصەووف، لەهەق لایانداوە بەو حوكمە ستەمكاریەی كە لەبارەی تەصەووفەوە داویانە، گرووپی دووەمیش كەوتوونەتە نێو ستەم كردن لە شەریعەت و دین، ئەو گوناهەی كە ئەو وشەو عیبارەتانە دەیگەیەنن بەهیچی نازانن، ئەو گرووپەی دووەم تەنها وشەو عیبارەتەكان دەڵێنەوە بێ ئەوەی هیچی لێ تێبگەن، تەنها لەبەر ئەوەی متمانەیان بە خاوەنی ئەو وشەی عیبارەتە هەیە قەبوڵی دەكەن و پێیان وایە تەواو وەك ئەوەیە كە گوتراوە، وەك ئەوەی یەكێك خواردنێك بخاتە گەرووی، قوتی بدات بێ ئەوەی هیچ تام و چێژێكی لێ ببینێ.

ئایا هەڵوێستی باوكم لەبارەی ئەو بابەتەوە چی بوو، بۆچوونی ئەو لەگەڵ كامە لەو دوو گروپەی سەرەوە بوو؟

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ زۆر بەتوندی بۆچوونی هەردوو گروپەكەی ڕەت دەكردەوە، بەو مەنهەجەی ئەو هەیبوو نوێنەرایەتی ئەو كۆمەڵەیەی دەكرد كە میانجی و مام ناوەند بوون، واتە: بەهەردوو لایەكەدا ستەم لەخۆیان دوور دەخەنەوە.

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ بەر لە هەر شتێك نكوڵی لەو دەستەواژانە دەكرد كە ماناكانیان گونجاو نین، پێی وابوو لەگەڵ پێوەرەكانی قورئان و سوننەت و ئەو بنەماو بنچینانەی كە پێویستە ئینسان باوەڕی پێیان هەبێ لە عەقیدەی ئیسلامییدا

ناگونجێـن، بەڵكـو گوتنـەوەو خوێندنـەوەی ئـەو دەسـتەواژانەی بـە حـەرام و قەدەغـە كـراو دەزانـی.

هەرگیــز دانــی بــەو شــەتەحاتانە نەدەهێنــا كــە لــە كتێبــی (الفتوحـات المكيـة)ی ئیـبن عەرەبیـدا هاتـوون و ماناكانیـان لـە ڕواڵەتـدا پێچەوانـەی بنەمـاو بنچینەكانـی عەقیـدەی ئیسـلامیيە، لــەو سۆنگەیەشــەوە خوێندنەوەشــی بــە درووســت نەدەزانــی، چ جــای ئــەوەی بــاوەڕت پێــی هەبــێ و تەبەننــی بكــەی.

دووەم شـت لـەو بـارەوە ئەسـتۆپاكی وێژەرەكەیەتـی، كاتـێ كـە دەزانــرێ ئیســتیقامەی هەبــووە لەســەر هــەق و، ڕێــگای تەقــواو خۆپارێــزی گرتۆتــە بــەر، دەســتی بەسوننەتیشــەوە گرتــووە، ئەمــە لایەنێكـی زانراوو حاشـا هەڵنەگـرە، لەبەرامبـەردا لەبارەی ڕاسـت و درووسـتی ئـەو شـتانەوە كـە دەخرێتـە پاڵیـان شـتێكی زانـراوو جێی دڵنیایـی نییـە، هەتتـا ئەگـەر ئـەو عیبارەتانـە لـە كتێبەكانیشـیاندا هەبـن، یانیـش لەوانەیـە مەبەسـت ئـەو مانـا پووچـە نەبـێ كـە ڕواڵەتەكـەی دەیگەیەنـێ، بەڵكـو مەبەسـت و مانایەكـی تـری هەبـێ لای بێژەرەكـەی، هەروەهـا دەبـێ كاتـی گوتنـی قسـەكەش ڕەچـاو بكـرێ، لەوانەیـە بێژەرەكـەی ماوەیـەك ئـەو عیبارەتـەی تەبەننـی كردبـێ لەبـەر هـەر هۆیـەك لـە هۆیـەكان، نـەك تـا كۆتایـی تەمـەن ئـەو قسـانەی كردبـێ، ئەگـەر ئـەو ئەگەرانـە دابنێین ئـەوا بەگوێرەی ئـەو ئەگەرانـە پۆشـاكی كوفـر ناخەینـە بـەر ئـەو عیبارەتانـەو لـەو حوكمـە دەكـەوێ كـە بگوتـرێ ئەمـە كوفـرەو تـەواو! ئەمـە ئـەو مانـا ئوصوڵیەیـە زانایـان لەسـەری كۆكـن، دەڵـێ: {إذا وقع الإحتـمال

سقط الإستدلال} ئەگەر (ئەگەر) هاتە گۆڕێ بەڵگە پێهێنانەوە لەکار دەکەوێ.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەر کەسێ بیەوێ دەتوانێ بەر لەو شەتەحاتانەی کتێبی فتوحاتی مەککی و دوای کتێبەکەش شتانێکی تەواو پێچەوانەی ئەو شەتەحاتانە ببیستێ و ببینێ، واتە: بەر لە نوسینی ئەو کتێبەو دوای نوسینیشی تەماشا دەکەیت کۆمەڵێك شتی گوتوون قسەکان تەواو کۆکن لەگەڵ ئەو قسانەی پێشینەی ئەو ئۆممەتە لەسەری کۆك بوون، واتە: بەگوێرەی قورئان و سوننەتن و دژایەتیەکیان لەگەڵ ئەو دووانەدا نییە.

بەڵام باوکم ئەو بۆچوونەی هەبوو کە پێش ئەو، ئیبن حەجەری هەیتەمی هەیبوو، لە فەتوا نوێکانیدا ئاماژەی پێ کردووەو گوتوویەتی: {خوێندنەوەی کتێبی فتوحات درووست نیە، لەگەڵ ئەو کتێبانەش کە هاووێنەی ئەون وەك (فصوص الحکم)} ئەم فەتوایەش لەسۆنگەی تۆمەت خستنە پاڵ دانەری کتێبەکە نەبوو، بەڵکو بۆ داخستنی دەرگای ئەو تەشویش و فیتنەیە بوو کە شەتەحاتە کوفریاتەکانیی دەیگەیەنن.

ڕۆژێکیان پێشنیارم بۆی کرد کتێبی فتوحات بکرێ، ڕەتی کردەوە بیکرێ، چەند بەشێك لەو کتێبە دزەی کردە لای باوکم بەهۆی کڕینی کۆمەڵێك کتێب بەیەکەوە کە مەزاد کرابوو، تەماشای بەشێك لە کتێبەکەی کرد پاشان لە گۆشەیەکی دووری کتێبخانەکەی دایناو نەگەڕایەوە سەری.

هەنـدێ جـار دەیبیسـت لەنێـو زانایانـی شـام هـەن دادەنیشـن و ئـەو کتێبـە دەخوێننـەوە لەکاتێکـدا زۆرێـك لـە خەڵکـی ئاسـایی و کـەم عیلمیـش بـەژداری ئـەو دانیشـتنانە دەکـەن، بەمـە تـوڕە دەبوو، خەمـی لـەو جـۆرە کارانـە دەخـوارد، دەیگـوت: ئـەوە کارێکـی باش نییـە، بـەڵام هیـچ وشـەیەکی نەشـیاوی بـەکار نەدەهێنـا، غەیـری ئـەوە کـە پێـی خـۆش نەبـوو وە نکوڵـی لـێ دەکـرد[1].

ئەمـە لەگـەڵ ئـەوەی باوکم ڕەحمەتـی خوای لێبـێ بەڕێزەوە سـەیری شـێخ ئیـبن عەرەبـی دەکـرد، ئەگـەر باسـی بکردایـە تەنهـا بەسـیفەتە گەورەکانـی باسـی دەکـرد، لەهیـچ دانیشـتنێکدا ڕێگەی نەدەدا کەسێك قسـەی نەشـیاوی لەبـارەوە بـکات و لـە پێگـەو مەکانەتـی بـدات.

بەهەمـــان شـــێوە بـــۆ ئەوانـــەی تریـــش کـــە هەنـــدێ لـــەو شـــەتەحاتانەیان لـێ نەقـل دەکـرێ وەك ئەبـو یەزیـدی بەسـتامی،

---

(١) دەڵێـم: هەمـوو ئەوانـەی ژیانـی ئیـبن عەرەبیـان نووسـیوەتەوە کۆکـن لەسـەر ئـەوەی: شـتانێك دزەیـان کردۆتـە نێـو کتێبـی فتوحاتـی مەککـی و غەیـری ئـەو کتێبـەش، باتنییـەکان ئـەوەی ویسـتبێتیان دزەیـان پـێ کردۆتـە نێـو ئـەو کتێبانـە، ئـەم زانایانـەی خـوارەوە جەختیـان لەسـەر ئـەو دزە پێکردنـە کردۆتـەوە:

ئیـبن و لموقـری لـە (نفـح الطیـب)، ئیـبن و لمەعـاد لـە (شـذرات الذهـب)، شـەعرانی لـە (الیواقیـت والجواهـر)، حاجـی خلیفـە لـە (کشـف الظنـون)، ئەمـە لـە گرنگترینـی ئـەو هۆکارانەیـە پێویسـت دەکات پشـت لـە کتێبـی فتوحـات و هاووێنەکانـی بکـرێ، ڕەحمەتـی خـواش لـەو کەسـەی کـە گوتوویەتـی: (خـذ مـا صفـا ودع مـا کـدر) پاڵفتـەو پاکەکـە وەربگـرە، واز لـە بۆگەنەکـە بهێنـە، سـەیری کتێبـی (السـلفیە)ی دانـەر بکـە لا ٢٠٤.

لێی نەقل دەکرێ گوایە گوتوویەتی: (لەژێر جوببەکەمدا غەیری خوا شتێکی دیکە نیە)، گوتوویەتی: (سبحاني ما أجل شأني) پاکی بۆ خۆم چ پێگەیەکی بەرزم هەیە، هەروەها وەك (ئیبن و لفارض)، لەهەندێ لەو شتانەی کە لەزمانی ئەوەوە گوازراونەتەوە، باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ زۆر ڕێزی لێ دەنان و بەچاوێکی گەورە سەیری دەکردن، بەڵام وازی لە شەتەحاتەکانیان دەهێناو بەلای ئەو قسانەی تریانەوە دەچوو کە هیچ تۆزو غوبارێکیان لەسەر نیە، بەبەڵگە دەیهێنانەوە.

ئەگەر یەکێك بهاتایە لای و بە پێداگیری کردنەوە هەندێ لەو شەتەحاتانەی لەلا باس بکردایەو پرسیاری لەبارەی ماناکەیان بکردایەو بیویستایە بزانێ کە هەڵوێستی باوکم چییە لەو بارەوە، باوکم وەڵامی دەدایەوە بەوەی کە: {شێخ لەو کاتەدا ئەو قسەیەی کردووە کەوتۆتە حاڵی فەنا بوونەوەو، خۆی وون کردووەو نوقمی تەنیا بینینی خوا بووە، بۆیە زمانیشی لەو کاتەدا کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو فەنا بوون و ون بوونە، کەوتۆتە حاڵەتی بێئاگایی و عەقڵ و ئیدراکی لەلای خۆی نەماوە، لەبەر ئەوە هەر یەك لەو پیاو چاکانەی ئەو شەتەحاتانەیان لێ ڕوویداوە دوای ئەوەی هاتونەتەوە هۆش خۆیان و حاڵەکەیان لەسەر نەماوە پێچەوانەی ئەوەیان گوتووەو خۆیان بەری کردوو لەو شەتەحاتانە}[1].

---

(١) ئیبن و تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێ لەبارەی تەئویل و لێکدانەوە بۆ قسەکانی ئەبو یەزیدی بەستامی کە زۆر بە پیرۆزو بەڕێزی دەگرێ

بەڵام حەڵلاج ئەوەی من بیزانم ڕاجیایی لەنێوان زانایان هەیە لەبارەیەوە، باوکیشم زیاتر لەوەی باسم کرد شتێکی دیکەی لەبارەیەوە نەدەگوت، لای دەکردەوە بەلای گومانی باش پێ بردنی.

بەکورتی: باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ ڕێزی زۆری بۆ ئەو زانایانە هەبوو، بە پێشەوای هەژمار دەکردن لە ڕێنیشاندان و چاکسازی کردنی دەروونەکان، ماوە، ماوە وریای دەکردمەوە لەوەی قسە لەبارەیانەوە نەکەم و گومانی خراپیان پێ نەبەم، هەروەها لەو کتێبە بچووکەدا وەك پێشتر باسم کرد کە بەنرخترینی ئامۆژگاریەکانی خۆی تێدا بۆمن نوسیبۆوە ئەو کاتەی کە من بچووك بووم و ئەویش تازە لەنەخۆشیەکی قورسدا لەمردن ڕزگاری بووبوو، تیایدا ئامۆژگاری کردبووم بەهیچ شێوەیەك گومانی خراپ بەو زانا دیارانەی تەصەووف نەبەم، هەروەها بەهیچ شێوەیەك زمانم بە خراپە بەرامبەریان نەگەڕێ، گۆشتی ئەوان ژەهراویە، لەوانەیە ئەوان لە گەورە دۆستانی خوابن ( بەگوێرەی لێکدانەوەی ئەو)، دەی ئەگەر ئەوان لە دۆستانی خوابن ئەو کەسەی گومانی خراپیان پێ دەباو عەیب و ناتەواوییان دەخاتە پاڵ، ئەوا خۆی دەخاتە نێو هەڕەشەکانی ئەو فەرمودە قودسیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەخوای پەروەردگارەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێ: [هەر کەسێك

---

قسەیەکی نزیك لەمە دەکات، بڕوانە (مجموع الفتاوی): ٣٣٧/١٠، بڕوانە بەرتوکەکەی من (السلفیة) ص ٢٠٤ و دواتری.

دوژمنــداری دۆســتێکی مــن بــکات ئــەوا بڕیــاری شــەڕی داوە لەگــەڵ مــن].

ئــەو شــتەش کــە دەرت دێنــێ لــە ئیشــکالی ئــەو شــەتەحاتانە ئەوەیــە: بیــر لــەو ئەگەرانــە بکەیتــەوە کــە باســمان کــرد، لــەڕووی عەقڵیــەوە دەشــێ هــەر یەکێــك لــەو ئەگەرانــە ڕاســت بــن، بــەم کارە لــە گــرێ دەروونیەکانــت ڕزگارت دەبــێ، بــێ ئــەوەی پێویســت بــەوە بــکات بەکافردانــان لەدەروونتــدا درووســت بــێ پەنــا بەخــوا، دوای ئــەوە لەســەرتە لــەو شــەتەحاتانە دوور بکەویتــەوەو لەســەریان نەوەســتی، دڵنیاشــبیت لــەوەی لــەڕووی ڕواڵەتــەوە، واتــە: ئــەوەی ڕواڵەتــی ئــەو قســانە دەیگەیەنــن کوفــرە، بــێ ئــەوەی پێویســت بــکات بێژەرەکانیــان بەکافــر دابنێــی کــە بــە چاکــی و تەقــوا نــاسراون، لەلایەکــی دیکەشــەوە ئێمــە نازانیــن چــۆن و لەســەر چ حاڵێــك گەڕاونەتــەوە بــۆ لای خــوا.

## یەکێتی بوون (وەحدەتولوجود)و، یەکێتی بینین (وەحدەتولشوهود)[1][2]

هەرچی یەکێتی بوونە بە واتا فەلسەفیەکەی، باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ لەهەردوو ڕووی (بێژە) و (باوەڕ)ەوە پێی وابوو شتێکی پووچ و باتڵەو بیرو بۆچوونێکی کوفرییە، بەڵام هەرچی یەکێتی بینینە، کە بریتییە لە بینینی سیفاتەکانی خالیق لە

---

(١) وەحدەتولوجودو وەحدەتولشوهود دوو دەستەواژەی زانستەکانی تەصەوف و فەلسەفەو کەلامن، ئەوەندەی من بینیبێتم لە کتێبە کوردیەکاندا بۆ یەکەمیان یەکێتی بوون و، بۆ دووەمیشیان یەکێتی بینین بەکارهاتوون، بەندە دان بەوەدا دەنێم کە شارەزاییەکی ئەوتۆم نییە لە وشەکاری و زمانەوانی، بەڵام زۆر ئاسودە نیم بۆ دەستەواژە کوردیەکان و پێم وایە پڕ بە پێستی دەستەواژە عەرەبیەکە نین، ڕەنگە دەستەواژەی گونجاوترو مانا جوانتر هەبن ئەگەر شارەزایانی ئەو بوارە لێکۆڵینەوەی لە بارەوە بکەن، ئەمە بۆچوونی خۆمەو لەوانەشە هەڵەبم (وەرگێڕ).

(٢) ئەم بابەتە بابەتێکی وردو هەستیارە، باسەکە پەیوەستە بە زانستی فەلسەفەو کەلام، لەبەر ئەوە خوێنەر ئەگەر پێشتر لەسەر ئەم بابەتە زانیاری نەبووبێ لەوانەیە تێگەیشتن لێی هەندێ قورس بێ، بەندە وەکو وەرگێڕ زۆر هەوڵم داوە بابەتەکە بە ئاسانی دابڕێژم بەڵام جاری وا هەیە زۆر هەوڵدان بۆ سادە کردنەوەی بابەت و مەسەلەیەك باتاییەت ئەگەر بابەتەکە وەرگێڕدراوبێ، زیان بە واتای بابەتەکەو مەبەستی نووسەر دەگەیەنێ، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە پێم وایە بۆ ئەم بابەت و مەسەلە فەلسەفیی و کەلامیانە فەرهەنگی کوردی لەو بارەوە زۆر دەوڵەمەند نییە، لەبەر ئەوە لەوانەیە خوێنەر لە خوێندنەوەی ئەم بابەتە تۆزێ ماندووبێ.

دروستکراوەکانیدا، جەختـی لەسـەر دەکـردەوە کە ئەمـەی دووەمیان یەکێکـە لـە گرنگتریـن ئەنجامـەکان و بـەرو بوومەکانـی ئیـمان.

بیروبـاوەڕو عەقیـدەی یەکێتـی بـوون بەمانـا فەلسـەفیەکەی وەك چـۆن لـە زۆربەی وانەکانـی و گفتوگۆکانـی ڕوونی کردۆتـەوە بریتییە لـەوەی: بوونـی دروسـتکەر (خالیـق) و درووسـتکراو (مەخلـوق) یـەك بوونـە، لەسـۆنگەی ئەمـەوە لەهـەر کـوێ خالیـق هەبـێ، دەبـێ مەخلوقیــش هەبـێ، وەك بەشـێك لەبوونــی خالیــق، کەواتــە بــەو مانایـە: ئەگـەر دانمـان بەمـە نەهێنـاو وامـان نەگـوت، ئـەوا بوونـی خالیـق بەتەنیـا بوونێکـی ناتـەواوە، چونکـە ئـەو شـتەی بوونەکـەی پەکـی لەسـەر غەیـری خـۆی کەوتبـێ ئـەوا بەبـێ بوونـی ئـەو غەیـرە، بوونـی ئەویـش کامـڵ نابـێ، واتـە: ئەگـەر غەیـری خـۆی بوونـی نەبـوو ئەمیـش بوونەکـەی دەبێتـە بوونێکـی ناتـەواو، ئـەم بیـرو بـاوەڕەش دەبێتـە هـۆی ئـەوەی بڵێیـن: درووسـتکراوەکانیش سـیفەتی (قیدەم)یـان هەیـە، واتـە: ئەوانیـش لەگـەڵ خـوادا لـە سـیفەتی قەدیـم بوونیـان (ئەزەلـی بونیـان) هاوبەشـن، لـەو حاڵەتەدا دەبـێ بڵێیـن بوونـی خـواو بوونـی درووسـتکراوەکانی لەیـەك کاتـدا بـووە، بەهەمـان شـێوە ئـەو بیـرو بـاوەڕە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی دان بـە حلـول (ئاوێتـە) بوونیشـدا بێنیـن.

هیـچ جیاوازیـەك نییـە لەنێـوان پووچـی و باتڵـی ئـەو عەقیدەیـەو کوفـر بوونـی، چ ئەگـەر هـات و بـەو شـێوازە تەعبیـری لـێ بکـرێ و دابڕێـژرێ، یاخــود بەشـێوازی نەزەریـەی فەیـز تەعبیـری لـێ بکـرێ، واتــە: هــەردوو داڕشــتنەکە یاخــود هــەردوو تەعبیرەکــە

هەر پووچ و كوفرین، نەزەریەی فەیزیش بریتییە لەوەی كەوا پێویستە بوونی خوا بڕژێتە سەر ئەو شتانەی دوای زاتی خۆی دێن، واتە: بوونەكەی بڕژێتە هەموو شتێكی دیكەی غەیری خۆی (هەموو گەردوون و بوونەوەر).

عەقیدەی حلول واتە ئاوێتە بوونی زاتی ئیلاهی لەنێو دروستكراوەكانیدا یەكێكە لە پێویستیەكانی عەقیدەی یەكێتی بوون (وەحدەت و لوجود) بەو مانا وردو دەقیقەی كە باسمان كرد.

بەڵام عەقیدەی ڕاست و تەواو ئەوەیە: بزانین بوونی زاتی هەق: بونێكی زاتیی سەربەخۆیە، ئەو بوونەش هەر بوونی خوایە بەتەنیا، پاشان خوای پەروەردگار بەو ڕێ و شوێنەی كە تەنیا خۆی ویستوێتی، بە دەسەڵاتی خۆی بەو پەڕی داهێنانەوە بەدیهێنراوانی خۆی بەدیهێناون، هەریەكەیانی لەو كات و ساتەدا دروست كردووە كە خۆی بۆی دیاری كردووە، بەتەنیا هەر بوونی خوا بوونێكی ئەزەلی و قەدیمە هیچ شتێك و هیچ كەسێك لە سیفەتی (ئەزەلی بوون-هەربووی بوون) لەگەڵ خوادا هاوبەش نییە، خوای پەروەردگار لە ئەزەلەوە هەر خۆی هەبووەو شتێكی دیكە بوونی نەبووە، بەم شێوەیە ماوەتەوە تا ئەو كاتەی خۆی ویستوویەتی، پاشان تواناو قودرەتی خوا پەیوەست بووە بە دروستكردنی هەموو ئەو شتانەی كە بڕیاریدا دروستیان بكات، ئەو كاتە ئەو دروستكراوانە هاتوونەتە نێو بازنەی ئەو شتەی كە پێی دەگوترێ بوون[1].

---

[1] پێناسەیەكی ئەوتۆ نییە بتوانرێ پێناسەی بوون (وجود)ی پێ

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ بوونی زاتی و هەقیقی بەتەنیا هەر بوونی خوایەو بەس، هەرچی بوونی غەیری خوایە (بەدیهێنراوان) بەبوونی خواوە بوونیان تەواو بووەو هاتوونەتە بوون، هەر ئەوەش بۆتە هۆکاری ئەوەی زانایان لەبارەی بوونی هەموو شتێکی دیکەی غەیری خوا بڵێن: بونێکی (تەبەعییە) واتە: بەهۆی شتێکی دیکەوەیە، بوونی بەدیهێنراوان پەیوەستە بە بوونی شتێکی دیکە، هەندێ جار بەبوونێکی (سێبەر)ی تەعبریان لێ کردووە، (سێبەر هەرچەندە لەڕواڵەتدا سەربەخۆیە) بەڵام لەهەمان کاتدا بەنەمانی بنچینەو ئەصڵەکەی، خودی سێبەرەکەش لەناو دەچێ و نامێنێ، چونکە سێبەرەکە بریتییە لە شوێنەوارو ئەنجامی ئەصڵەکەی[1].

لەوانەیە نزیکترین نموونە بۆ ڕوونکردنەوەی قسەکەمان بریتی بێ لەو پیاوەی کە بەدەستەکانی خۆی منداڵەکەی لەسەر پێیان ڕاگرتووە، ڕاستە لەڕواڵەتدا هەردووکیان وەستاون بەڵام لەهەمان کاتدا وەستانی منداڵەکە بەهیچ شێوازێك

---

بکرێ، بەڵام وردترین پێناسەی وەسفیی بۆ (وجود) بوون ئەوەیە کەوا بریتییە لە (کینونە)ی شتێك لە سنووری زەمان و مەکاندا، بەڵان ئەم پێناسەیە تەنها لەسەر بوونی درووستکراوەکان دەچەسپێ، نەك لەسەر بوونی خوای پەروەردگار، چونکە بوونی خوا پێشی زەمان و مەکانە.

(١) لەوانەیە ئەگەر بە بوونی تەبەعی تەعبیری لێ بکرێ سەلامەتترو باشتر بێ لە بوونی سێبەریی، لەبەر ئەوەی سێبەر بەناچاری بەشوێن ئەصڵەکەیدا دەگەڕێ شوینکەوتنێکی ناچارییە لەهەموو کاتێکدا، لێرە وەهمی نەزەریەی پووچی فەیز (ڕژانەوە) دێتە ئاراوە، ئەمە دەڵێین لەگەڵ تەسلیم بوونمان بەوەی کە وێکچوون لەیەك ڕووەوە نەك لە هەموو ڕووەکان.

وەسـتانی خـۆی نییـە بەڵکـو بەهـۆی هێـزی شـاراوەی باوکییـەوە لەسـەر پـێ وەسـتاوە، بەهەمـان شـێوە قـەدی دارێـك بەهـۆی ڕەگەکەیـەوە وەسـتاوە، بێگومـان قـەد جیایـە لـە ڕەگ، بـەڵام بوونـی قـەد لـە ڕەگـەوە درێـژ بۆتـەوە.

بوونـی ئینسـان و بەدیهێنراوانـی دیکـە هەمـوو چرکـە سـاتێك پەیوەسـتە بـە بوونـی بەردەوامـی خـوا، هـەر کەسـێك بڕوانێتـە سـەرچاوەی درووسـتکراوەکان و بـەردەوام لێیـان ڕابمێنـێ، لەهەسـتەکانیدا ئـەوە جێگیـر دەبـێ بەدیهێنـراوان (وێنەیەکـی سێبەریی)ن، شتانێکن پەیوەستن بەغەیـری خۆیـان، وێنەدانـەوەی شـتێکی دیکـەن، ئەگـەر بـەم شـێوەیە ڕوانیـی ئـەو کاتـە هەمـوو شـتێکی دیکـەی غەیـری خـوای پـەروەردگاری لـەلا دەبێتـە تارمایی و وەهـم، دوور نییـە لـەو بـارو دۆخـەدا ئەگـەر تەسـلیمی ئـەو حاڵـە بـێ و ڕێگـە بەزمانیشـی بـدات تەعبیـر لـەو هەسـت و شـعورو حاڵـە بـکات کـە بـۆی درووسـت بـووە پێـی بگوتـرێ: ئـەم پیـاوە بـاوەڕی بـە یەکێتـی بـوون هەیـە، بـەڵام بەزوویـی دەگەڕێتـەوە سـەر ئـەرزی واقیـع و (درووسـتکەر) و (درووسـتکراو) و (دروسـتکردن)ی بـۆ جێگیـر دەبـێ.

بێگومـان مـن لـە سـۆنگەی ئـەوەی باسـم کـرد ئـەو دەقانـەم نەهێنـاوە کـە باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ زۆر جـار لەبـارەی ئـەو هەقیقەتـە تەعبیـری لـێ دەکـرد، بـەڵام دەتوانـم بڵێـم: مـن بـەو پـەڕی وردیـەوە تەعبیـرم لـە واتـاو مانـای قسـەکانی ئـەو کـردووە، کـە زۆر جـار لـە دەرسـەکانیداو لـە بۆنەکانـدا لـەو

بارەوە گوتوویەتی، یاخود لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ کەسێکدا کە پرسیاری لەو مەسەلەیە لێ کردووە گوتوویەتی، دەتوانم بڵێم: من بەتەواوی لە هەقیقەتی ئەو بابەتە نەدەگەیشتم و نەمدەتوانی قسەی لەبارەوە بکەم دوای ئەوە نەبێ کە لەو بارەوە زۆر گوێم لە قسەو ڕوونکردنەوەکانی گرت، دووبارەو سێ بارە باسی دەکردەوە بەهۆی ئەو کەسانەی کە لەو بارەوە ئیشکالیان هەبوو داوای ڕوونکردنەوەیان لێ دەکردو پرسیاریان لێ دەکرد.

لە سۆنگەی ئەو ڕوونکردنەوانەی باوکم جەختی لەسەر دەکردەوەو دووبارەی دەکردەوە، لەبارەی پەیوەندی نێوان بوونی خواو درووستکراوەکانی، شێخەکانی ئەهلی تەصەووف و ئەو پێشەوایانەی شاهێدی خێرو ئیستیقامەی بۆ دەدان بەریی دەکر لەمەسەلەی یەکێتی بوون، بەو مانا فەلسەفیەی پێشتر باسمان کرد.

دەیگوت: هەڵەکە لە خراپ حاڵی بوونی ئەو کەسانەیە کە گوێیان لەو دەق و وشانە دەبێ، یاخود دەیانخوێننەوە، بەتایبەت ئەو پێشەوایانەی ئیمامی قوشەیری لە ڕیسالەکەیدا باسی ژیاننامەکەی کردوون و ستایشی کردوون، پێشتریش گوتم کە باوکم خۆشەویستیەکی زۆری بۆ ئەو کتێبە هەبوو زۆر پشتی پێ دەبەست و بۆی دەگەڕایەوە.

بۆ بەڕائەتی ئەو پێشەوایانەش لە مەسەلەی یەکێتی بوون چەندین بەڵگەی دەهێنایەوە لەو قسەو دەقانەی کە خودی

خۆیان كردوویانەو تۆمار كراون، بۆچوونی وابوو: ئەو دەقانەی ئەوان كە دەلالەتەكانیان ڕوونن، بای ئەوەندە هەن وەڵامی ئەو دەستەواژانەی پێ بدرێتەوەو تەئویل بكرێن كە لەشوێنی دیكە بەناڕوونی هاتوون.

لەو دەقانەی شێخ موحیەددین ئیبن عەرەبی بەریی دەكات لە عەقیدەی حلول و یەكێتی بوون ئەو قسانەیەتی كە لەكۆتایی قەصیدەی (ئەلتائیە) هاتوون:

وجدت وجودا لم أجد ثانيا لـه وشاهدت ذاك الحق في كل صنعة

وطالب غير الله في الأرض كلها كطالب ماء من سراب بقيعـــة[1]

ڕوون و ئاشكرایە قسە لەسەر بوونێكی زاتی دەكات، كە بریتییە لە یەك بوون بە فیعلیی، ئەویش بوونی خوای بەرزو مەزنە، ئەوەشی كە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی گوتمان دێری دووەمی شیعرەكەیە، لەدێری دووەمدا هۆشیاری دەدا لەبارەی داوا كردن لە غەیری خواو متمانە بوون بەغەیری خوا، جەخت لەسەر پشت بەستن تەنها بەخوا دەكاتەوە، دەڵێ: هەر شتێكی دیكەی غەیری خوا وەهم و سەڕابە، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە

---

(١) ئەو بوون (وجود)ەی من دۆزیمەوە (یەك بوونەو) دووەمم نەدۆزیەوە، هەر ئەو (حەق- كە مەبەستی خوایەو تاكە وجودی هەقیقیە) تاكە وجودەو لەهەموو صونعێكدا ئەوم بینی، هەر كەسێكیش بەدوای غەیری خوادا بگەڕێ لەهەموو زەویدا، وەك ئەو كەسەیە لە دەشتێكی چۆڵی وشك و گەرمە سێردا بەدوای ئاودا دەگەڕێ، كەچی ئەوەی دەستی دەكەوێ تەنها سەرابە نەك ئاو.

کە (لەبید)ی شاعیر دەیڵێ و پێغەمبەری خواش ﷺ ستایشی دەکات و دەفەرمووێ: {ڕاسترین قسە کە گوترابێ ئەو قسەیەی لەبیدە کە دەڵێ: (ألا كل شيء ما خلا الله باطل) ئاگاداربە هەموو شتێکی دیکەی جگە لەخوا پووچ و باتیڵە}.

لەو قسانەی دیکەش کە ئین و لفاریز بەریی دەکات لە عەقیدەی حلوول و یەکێتی بوون ئەو دێڕانەیە کە لە (ئەلتائیەی کوبرا) هێناویەتی:

وكيفَ، وباسْمِ الحقّ ظلّ تخلقي ... تكونُ أراجيفُ الضّلالِ مُخيفَتي

وها دِحْيَةٌ، وافى الأمينَ نبيَّنا ... بِصورَتهِ، في بَدْءِ وحْيِ النّبوءةِ

أجبريلُ قُل لي كانَ دحيةَ إذ بدا ... لِمُهدي الهُدى، في هَيئةٍ بَشَريّة

وفي علمِهِ من حاضريهِ مزيّةٌ ... بماهيّةِ المرئيِّ من غيرِ مريةِ

يرى مَلَكاً يُوحي إليهِ وغيرُهُ ... يَرى رَجُلاً يُدْعى لَديهِ بِصُحْبَة

ولي، مِن أتَم الرُّؤيتينِ، إشارَةٌ ... تُنزِّهُ عن رأي الحلولِ عقيدتي

وفي الذِّكرِ ذكرُ اللبس ليس بمنكرٍ ... ولم أعْدُ عن حُكمَي كِتابٍ وسُنَّة[1]

---

(١) کارێکی قورسە بتوانرێ ئەم جۆرە شیعرانەی لەبواری تەصەوف و زانستی کەلام هاتوون دەقاو دەق بکرێنە کوردی، لەبەر ئەوەی ئەو زاراوانەی لە زانستی تەصەووف بەکاردێن ماناو مەدلولی تایبەتیان هەیەو ناتوانرێ تەنها بەڕواڵەت لێك بدرێنەوە، بۆیە بەندە وەك وەرگێڕو بەیارمەتی چەند مامۆستایەکی شارەزا، هەوڵم داوە بەشێوەی شیکردنەوە شیعرەکە ڕوون بکەمەوە نەك بەشێوەی وەرگێڕان:

دەڵێ: من هەرچی ڕەوشتێك و ئەخلاقێکم بووبێ بەردەوام بەناوی (حەق- اللە) بووە، (واتە: بەناوی اللە من هەڵس و کەوت و مامەڵەم کردووە)، مادام وایە چۆن دەبێ و چۆن دەکرێ هەواڵی من لەڕیزی گومڕایان

زۆر بەڕوونــی دەبینیــن کــە ئیبن و لفاریــز چــۆن خــۆی بەریــی دەکات لــە حلــول و یەکێتــی بــوون، بــەڵام ســەرەڕای ئــەو خــۆ بەریی کردنــەش دڵنیایــە لــەوەی ئــەو تۆمەتــەی هــەر دەخرێتــە پــاڵ، پێــی خــۆش بــێ یــان پێــی ناخــۆش بــێ!

---

بــێ؟ (لێــرە مەبەســتی ئەوەیــە چــۆن دەبــێ تۆمەتبــار بکرێــم بــە عەقیــدەی حلــوول، واتــە: لێــرە ئەوانــەی تۆمەتبــارم دەکــەن بــەوەی کــە گومــڕا بوومــە لێیــان تێــك چــووە)، ئەوەتــا دوحیــە، (لەلایــەك دوحیەیــەو لەلایــەن ئەمیــن -جبریلــە- هاتۆتــە لای پێغەمبەرمــان ﷺ، جبریــل بەشــێوەی دوحیــە هــات بــۆ لای پێغەمبەرمــان ﷺ، لەســەرەتای هاتنــی وەحــی، دەی کەواتــە پێــم بڵــێ: ئایــا ئــەوە جبریــل بــوو یــان دوحیــە بــوو کاتــێ بــۆ لای پێشــەوای ڕێنموییــکاران هــات لەســەر شــێوەی بەشــەر، بــەڵام پێغەمبــەری خــوا ﷺ جیــا لەوانــەی لــەوێ حــازرو ئامــادە بــوون زانیــاری لەبــارەی ئەمــەوە هەبــوو، ئــاگای لــەو تایبەتمەندییــە هەبــوو، پێغەمبــەری خوا ﷺ بێگومــان و دوودڵی زانیــاری هەبوو بــە ماهیــەت و جەوهــەری ئــەو ڕواڵەتــەی دەیبینــێ، ڕواڵەتەکــە دوحیــە بــوو، بــەڵام ماهیــەت و جەوهەرەکــە جوبریــل بوو ســەلامی خــوای لێبێ، (مەبەســتی ئیــبن و لفاریــز ئەوەیــە ئەوانــەی لــەوێ ئامادەبــوون لێیــان تێکــەڵ بووبــو، بــەڵام پێغەمبــەری خــوا ﷺ چــاك دەیزانــی ئەمــە کێیــە) ئــەو دەیزانــی ئەمــە فریشــتەیەو وەحــی بــۆ هێنــاوە، بــەڵام غەیــری پێغەمبــەری خــوا ﷺ پیاوێکیــان دەبینــی کــە دوحیــە بــوو، کــە هاوەڵــی خــۆی بــوو، (ئنجــا ئیــبن و لفاریــز دەڵــێ:) منیــش لــەو دوو بینینــە بینینــی دوحیــەو بینینــی جوبریــل ئاماژەیەکــم وەرگرتــووە، تێشــدەگەم مانــای چییــە، ئــەو ئامــاژەو تێگەیشــتنەی مــن، لــەو قەســیدەیەدا بەپاکــم دەگــرێ لــەوەی تۆمەتبــار بکرێــم لــە عەقیــدەی حلــوول، وە لــە زیکرمــدا زیکــری ئــەوەی کــە ئێــوە لێتــان تێکــەڵ بــووە، مــن دەزانــم چــی دەڵێــم، ئێــوە دەڵێــن ئەمــە ورتــە ورتــەو چــی دەڵــێ، بــەڵام مــن دەزانــم چییــە، شــتێکی مونکــەرو خــراپ نییــە هێنابــم، وە زێدەڕۆییشــم نەکــردوە بەســەر حوکمــی قوڕئــان و ســوننەت، واتــە: لێــم لا نــەداوەو بەگوێــرەی ئــەو دووانــە جوڵاومەتــەوە.

پوختەكـەی ئەوەیـە ئەگـەر سـەیری بوونـی خـوا بكەیـن، یاخـود ئـەوەی پێـی دەڵێـن: (بوونـی زاتیـی)، دەبینیـن هـەر (یـەك) بـوون هەیـە لـەم گەردوونـەو دووەمـی نیـە، یەكخواناسـی و تەوحیدیـش بـە تێگەیشـتنی ئـەو هەقیقەتـە نەبـێ نایەتـە دی، ئەگـەر هەنـدێ لـە پێشـەوایانی تەصـەووف تەعبیریـان لـە یەكێتـی بـوون كردبـێ مەبەسـتیان ئـەوە بـووە.

ئەگـەر بـەو ئیعتیبـارەش باسـی بـوون بكەیـن كـە بەچـاوی سـەرمان دەیبینیـن و دێتـە بەرچاومـان بەهـەردوو جۆرەكەیـەوە، زاتـی و تەبەعـی، یاخـود بنچینەیـی و سـێبەریی، ئـەو كات بـوون (وجـود) جـۆراو جـۆرەو یـەك بـوون نیـە[1].

ئەگـەر بتـەوێ بەچـاوی (لەبیـد)ی شـاعیر بڕوانـی هیـچ چارێكـت نیـە گـەردوون هەمـوو بـە پـوچ و باتـڵ دەبینـی، پێغەمبـەری خـواش ﷺ ئەمـەی بـە ڕوانینێكـی پێكـراوو تـەواو دانـاوە، بـەم شـێوە ڕوانینەیـە كـە صۆفیانـی ڕاسـتگۆ لەگەردوونـی دەورو بـەری خۆیـان ڕوانیـوە.

---

(١) جارێكـی تـر خوێنـەر حەواڵـەی مەكتوباتـی شـێخ ئەحمـەد فاروقـی سـەرهەندی دەكـەم، باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ زۆر دەگەڕایـەوە سـەری و زانیـاری لـێ وەردەگـرت، دەتوانـم بڵێـم لـەو كتێبانـەی كـە باوكـم زۆر گرنگـی پـێ دەدا لـەدوای ڕیسـالەی قوشـەیری دووەمیـن كتێـب بـێ، سـەیری مەكتوبـی ژمـارە چـل و چـوار بكـە، لـەوێ بەدرێـژی وەڵامـی ئەوانـەی داوەتـەوە كـە لەبـارەی یەكێتـی بـوون پرسـیاریان لـێ كـردووە، باسـی هەڵوێسـتی شـەریعەت دەكات لـەو بـارەوە ج٢ ص٧٢.

ئەگـەر بشـتەوێ بەچاوەكانـی ئـەو كەسـە بڕوانـی كـە مامەڵـە لەگـەڵ دونیـادا دەكات و لای بـەلادا دەكاتـەوەو متمانـەی پـێ هەیـە، ئـەوكات هیـچ چارێكـت نیـە بـوون (وجـود) بـە (۲) دوو بـوون (وجـود) دەبینـی، لـەو حاڵەتەشـدا زۆربـەی جـار بـوون (وجـود)ە مەجـازی و فانیەكـە دەبێتـە بەربەسـت لەبـەردەم بینینـی بـوون (وجـود)ە باقـی و لەنێـو نەچووەكـە.

هەرچـی یەكێتـی بینیـن (تەنهـا خـوا بینیـن)ە (جیایـە لـە یەكێتـی بـوون)، یەكێتـی بینیـن بریتییـە لـەو دەرەنجامـەی كـە لـەو باسـەی سـەرەوە پێـی گەیشـتین، دوای ئـەوەی مەسـەلەی (یەكێتـی بـوون) مـان پاڵفتـە كـردو شـەن و كەومـان كـرد، ئـەو بۆچوونە فەلسـەفیەی هەنـدێ لــە فەیلەسـوفەكان هەیانبـوو گوایـە بوونـی هەمـوو گـەردوون یەكسـانە بـە بوونـی خـوای بـەرزو مـەزن، ئەمـەش بریتییـە لـە فەلسـەفەی خەرقائـ، كـە هەنـدێ لـە فەیلەسـووفانی كـۆن بانگەوازیـان بـۆ كـردووە، پاشـان دووبـارە لەسـەردەمی نوێـدا پێشـەوایانی مەزهەبـی وجـودی لـە ڕۆژئـاوا بانگەوازیـان بـۆ كـرد لەپێـش هەموویانـەوە باوكـی ڕۆحـی مەزهەبەكـە (سـیرن كیركجـورد)، (۱۸۱۳-۱۸۵۵).

ئـەم جـۆرە بۆچوونـە فەلسـەفیەی سـەرەوە هەرگیـز لای هیـچ یەكێـك لـە پێشـەوایانەی تەصـەووف بایەخـی نەبـووە، ئەوەشـی كـە دەخرێتـە پـاڵ صۆفیـەكان بـەوەی كـە دانیـان بـە یەكێتـی بوونـدا هێنـاوە، باوكـم دەیگێڕایـەوە سـەر ئـەوەی كـە پێویسـتە یەكێتـی بینینیـان بخرێتـە پـاڵ نـەك یەكێتـی بـوون.

بەڵكو باوكم پێی وابوو ئەو موسوڵمانەی ئیسلامەتیەكەی بەرز نەبۆتەوە بۆ پلەی یەكێتی بینین، لەو كەسانە هەژمار ناكرێ پێی بگوترێ: مومارەسەی هەقیقەتی یەكخوا پەرستی كردووە.

پوختەی ئەوەی باوكم گوتوویەتی دەربارەی یەكێتی بینین بریتییە لە: حاڵێك دەگاتە هەست و شعوری ئینسان نەك بڕیارێك بێت لە عەقڵەوە دەرچووبێ، هەرچەندە لەڕووی عەقڵیشەوە یەقینی تەواوی هەیە كە گەردوون شتێكی بەدیهێنراوو، دروستكراوە، نوێیە، واتە: ئەزەلی و قەدیم نییە، بەڵام ئەو كەسە لەو حاڵەدا واتە: لە (یەكێتی بینین)دا هیچ شتێكی ئەم گەردوونە نابینێ غەیری ڕەنگدانەوەی سیفاتەكانی خالیق كە لە ناوە جوانەكانیەوە سەرچاوە دەگرن، ئەو جۆرە كەسە لەو حاڵەدا لەبارەی زۆری بەدیهێنراوەكان كە دڵنیایە لەبوونیان هیچ شتێك نابینێ جگە لەو خالیقەی كە هەست و شعوری ئەوی داپۆشیوە.

باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ جەختی لەسەر ئەوە دەكردەوە ملكەچ بوونی تەواو بۆ ئەو ئایەتانەی كە خوای پەروەردگار فەرمان دەكات بە بیر كردنەوە لە دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندایە، نایەتە دی، مەگەر بەوە نەبێ كە ئینسان بەردەوام بێ لەسەر زیكرو یادی خوای گەورە، تا بەهۆی زیكر كردنەوە ئاوێنەی سەر بەدیهێنراوەكانی بۆ پاك دەبێتەوە، بەردەوام خەریكی پاككردنەوەیان بێ، ئەو بەربەستە

چــڕو پــڕەی بەرچــاوی دڵــی ئینســـانی گرتــووە وای لێکــردووە بوونـی خـواو دەسـەڵات و کاریگەریەکـەی نەبینـێ، بەهـۆی زیکـر کردنـەوە دەبێتـە ئاوێنەیەکـی پاکـژی وا هیـچ شـتێکی دیکـەی تێـدا دەرناکـەوێ و ڕەنـگ ناداتـەوە جگـە لـە یەکتایـی خـوای بەدیهێنەر، ئـەوە مانـای ئـەو قسـەیەی ئەوانـە کـە دەڵێـن: ئیمانـی مسـوڵمان کامـڵ نابـێ تـا یەکتایـی خوا (وەحـدەت) لەنێـو (کـەسرەت)ا نەبینێ (واتـە: لەنێـو زۆری و بێشـوماری دروسـتکراوەکان تەنهـا یـەك شـت ببینـێ ئەویـش خوایـە)، یەکتایـی مەبەسـت خوایـە سـبحانە و تعـالی، (کـەسرەت) مەبەسـت بەدیهێنراوەکانیەتـی، واتـە: ئیمانـی کامـڵ نابـێ تاوەکـو لەنێـو بەدیهێنراوەکانـدا یەکتایـی خـوا نەبینـێ، هەرچەنـدە زیاتـر زیکـرو یـادی خـوا بـکات زۆری و زەوەنـدی گـەردوون بەبەرچاویـەوە دەچێتـەوە نـاو یـەك و بچـووك دەبێتـەوە، تـاوای لێـدێ بەتـەواوی لەبەرچـاوی لادەچـێ، هیـچ شـتێك لـە دیاردەکانـی صونعـی خـوای گـەورە نابینـێ جگـە لـە سـیفاتەکانی، سـەرەڕای ئـەوەی لـەڕووی عەقڵیـەوە دڵنیایـە لـەوەی گـەردوون بوونـی هەیـە، مامەڵەشـی لەگەڵـدا دەکات، بـەڵام بێئـەوەی ببینـێ.

ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ چەندەهـا جـار بەدەسـتەواژەو دەربڕینـی یەکـێ لـە زانـا ڕەببانیـەکان تەعبیـری لـەو حاڵەتـە دەکـرد کـە دەڵێ: {هیـچ شـتێکم نەبینیـوە مەگـەر لەپێشـی و لەپشـتی و لەگەڵیـدا خـوام بینیـوە}[1].

---

(١) بەداخـەوە نـاوی ئـەو زانـا ڕەببانیـەم لەیـاد نەمـاوە کـە خاوەنـی ئـەم ڕسـتە ناوازەیـە.

دەڵێـم: بەئەنـدازەی ئـەو خۆشەویسـتیەی بـاڵ دەکێشـێ بەسـەر دڵ، یەکێتـی بینیـن یاخـود بەتەنهـا خـوا بینیـن باڵ دەکێشـێ بەسـەر هەسـت و شـعورو چـاو، جـا ئـەو خۆشویسـتنە هـی هـەر کێبـێ و لەهـەر کوێبـێ، یەکێتـی بینیـن جـۆراو جـۆرە بەگوێـرەی جـۆراو جـۆری مەحبـوب، کەواتـە: ئـەو شـتە بەسـەر بینینـی ئینسـاندا زاڵ دەبـێ کەبەسـەر دڵیـدا زاڵ بـووە.

ئــەو کەسـەی دڵـی پـڕ بـووە لـە خۆشەویسـتی کچێـك وەك مەجنونـی کـوڕی عامـر، بـۆ هـەر کـوێ بچـێ و لەهەرکوێبـێ هـەر ڕەنـگ و ڕوخسـاری لەیـلا دەبینـێ، حـەز بـەلای کەس نـاکات جگە لـەو کەسـەی باسـی لەیـلای بـۆ دەکات، ئیـدی یاسـاو دەسـتوری خۆشەویسـتی هـەر ئەوەیـە:

أمر على الديــار ديــار ليلى　　　أقبل ذا الجــدار وذا الجدارا
وما حب الديار شغفن قلبي　　　ولكن حب من سكن الديارا

بـەلای ئـەو گەڕەکـەدا تێپەڕیـم کـە ماڵـی لەیـلای لێیـە، ڕووم دەکـردە ئەمـلاو ئـەولای دیـواری خانووەکانـی گەڕەکەکـە، ئـەوە خۆشەویسـتی خانووەکانـی گەڕەکەکـەی لەیـلا نییـە دڵـی داگیـر کـردووم، بەڵکـو خۆشەویسـتی ئـەو کەسـەیە کـە لەخانووەکەدایـە.

ئــەو ئافرەتـەی دڵـی ڕۆیشـتووە لەتـاو شـەوق و حەنیـن بـۆ منداڵـە ونبووەکـەی کـە بەبـەر چاویـەوە نەمـاوە، پۆشـاکەکانی منداڵەکـەی بەسـنگی خۆیـەوە دەنـێ و بۆنیـان دەکات و ماچیـان دەکات، هیـچ شـتێکی دیکـە لـە پۆشـاکەکانی منداڵەکـەی نابینـێ، جگـە لـە وێنـەی خـودی منداڵەکـەی، ئەگـەر پەیـام و نامەیەکـی

لەلایەن كوڕە ونبووەكەیەوە بۆ بێ هەمان مامەڵە لەگەڵ نامەكە دەكات كە لەگەڵ پۆشاكەكانی دەیكا، پەڕو مەرەكەب و نووسینەكە نابینێ بەڵكو ئەو شتانە بۆ ئەو وەك ئاوێنەیەكن كوڕەكەی خۆی تێدا دەبینێ.

ئەگەر دڵ ڕوویكردە خۆشویستنی خوای پەروەردگار -كە بەدڵنیاییەوە پەروەردگار لەهەموو شتێكی دیكە لە پێشترو شایستەترە خۆشەویستییەكی لە ئەندازە بەدەر خۆش بویسترێ- ئنجا ئەگەر دڵ بەتەواوی ڕۆچووە نێو ئەو خۆشەویستیەی خوا، ئەوا خاوەنی ئەو دڵە بەهۆی خۆشەویستی و شەوقی بۆخوا دەكەوێتە نێو هەست و شعوری بینینی خوا، كاتێ گوڵێك دەبینێ و بۆنی خۆشی گوڵەكە دەكات دەیخاتە نێو خەیاڵی بینینی صەنعەتە جوانەكانی خواو داهێنانەكانی، كاتێكیش لە نیوە شەودا ئەستێرە گەشاوەكانی ئاسمان دەبنیێ كە چۆن ئاسمانیان ڕازاندۆتەوە، بەشەوق و ڕووناكی ئەستێرەكان دەچێتە نێو ڕامان و ورد بوونەوە لە گەورەیی و حیكمەت و جێدەستی بەدیهێنەر، كاتێ تەماشای خواردنەكانی سەر سفرەكەی دەكات، یاخود ئەو ئاوە سازگارە دەبینێ لەدەورو بەری، بەڵكو كاتێ سەیری خۆی دەكات لە ئاوێنە بۆ ئەوەی شكڵ و شێوەو لەش ساغی و هێزو توانای جەستەی خۆی بۆ دەركەوێ، ئەم شتانە هەمووی تووشی سەرسوڕمانی دەكەن و وای لێ دەكەن بەو پەڕی ئەدەبەوە بەدیار خواوە هەڵوەستە بكات، هەڵوەستەیەكی پڕ لە شەوق و خۆشەویستی، وای لێ دەكەن بەم هەستەوە لەگەڵ خوادا بژیێ، چۆن و بەچ شێوازێك ئەو هەموو شتانەی سەرەوەی بەوپەڕی حیكمەت و جوانیی و ڕەحمەتی فروانی خۆی بەدیهێناوە!.

ئایـا دەگونجـێ ئینسـانێك، جـا هـەر كەسـێك بـێ لەسـەر خۆشەویسـتی سەرزەنشـت بكـرێ، خۆشەویسـتیەك ئـاوا لـە خاوەنەكـەی بـكات كـە باسـمان كـرد؟

ئەگـەر وەڵامەكەمـان بـەو شـێوەیە بـێ كـە لۆژیـك لێمانـی دەخـوازێ دەبـێ بڵێیـن نەخێـر، لەبـری ئـەوەی ڕەخنـەی لـێ بگیـرێ دەبـێ بەپیـرۆز دابـنرێ، بەتایبەت ئەگـەر ئەو خۆشەویستیە ئاڕاسـتەی بـكات بـۆ سـەرچاوەو ئەصـڵ، بیباتـە لای سـەرچاوەكە نـەك لـە ڕێچكـەو لقەكانـی جـێ بمێنـێ، ئێسـتا دەڵێیـن: ئایـا ئیـبن و لفاریـز لـەو بـارەوە چ شـتێكی زیـادەی كـردووە، یاخـود چ شـتێكی گۆڕیـوە، تـا شایسـتەی ئەوەبـێ لەلایـەن هەنـدێ خەڵكـەوە بـەو توندییـە سەرزەنشـت بكـرێ؟ بـە دڵنیاییـەوە تەنیـا ئـەو حاڵـەی بەسـەر هاتـووە كـە باسـمان كـرد، كاتـێ تەعبیـر لـەو هەسـت و شـعورە بـەرزەی خـۆی دەكات و دەڵـێ:

| | |
|---|---|
| تراهُ إنْ غابَ عنّي كلُّ جـــارحةٍ | في كلِّ مَعنىً لطيفٍ، رائقٍ، بهِجِ |
| في نغمةِ العودِ والنّايِ الرَّخيمِ إذا | تألّقا بينَ ألحـــانٍ منَ الهـــزجِ |
| وفي مَسارِحِ غِزلانِ الخَمائِلِ، فـي | بردِ الأصائلِ والإصـباحِ في البلجِ |
| وفي مَساقِطِ أنداءِ الغَمامِ، عـلى | بِساطِ نَوْرٍ، من الأزهـارِ مُنْتَسِجِ |
| وفي مَساحِبِ أذيالِ النّسـيمِ، إذا | أهْدى إليّ، سُحيراً، أطيبَ الأرَجِ |
| وفي الْتِثاميَ ثَغْرَ الكاسِ، مُرْتَشِفاً | رِيقَ المُدامَة، في مُســتَنْزَهٍ فَرِجِ |
| لم أدرِ ما غُربَةُ الأوطانِ، وهو معي | وخاطِري، أينَ كنّا، غيرُ مُنْزَعِجِ[1] |

---

(١) واتـە: ئەگـەر بەشـێوەی بەرجەسـتەو (ملمـوس) لێـم ون بێـت و نەیبینـم،

لێرەوە لەوانەیە هەنـدێ کـەس سەرزەنشـتی ئیـبن و لفاریز بکات و ڕەخنــەی لــێ بگــرێ لەسـۆنگەی ئــەوەی گوایــە لــەو درێژانــەدا باسـی یەکێتـی بوونـی کـردووە بەمانـا فەلسـەفیە باتڵەکـەی کە پێشـتر باسـیان کـرد، بـەڵام پێـم وایـە ئەگـەر ئـەو کەسـانە وردو دەقیـق و شـارەزا بـن لـە زمانـی عەرەبـی هەرگیـز ناکەونـە هەڵەیەکـی وا ئـەو ڕەخنەیـە لـە ئیـبن و لفاریـز بگـرن، پوختەی قسـەکانی ئیـبن و لفاریز

---

ئـەوا لەنێـو هەمـوو مانـاو واتایەکـی جـوان و ناسـك و ڕوون و دڵخۆشـکەری (گـەردوون) دەیبینـم، لـە نەغمـەی عـودو نـای -شمشـاڵ-دا کـە بە هێواشـی و نەرمـی دێتــە دەر، کاتــێ ئولفــەت بەیــەك دەگـرن و لــەو چــوار چێوەیــەدا ئاوازێکــی خــۆش دێتــە دەر، (مــن لــەوێ مەحبووبــی خــۆم دەدۆزمــەوە)، هەروەهــا لــە چەندەهــا شــانۆدا (ئــەو دەبینـم وەك:) لــەوەڕگای ئاسـکەکان کــە بــەدەم گۆمــە ئــاوە دەورو بــەر ســەوزەکاندا دەلــەوەڕن (ئــەو دەبینــم)، هەروەهــا لەکاتــە فێنکەکانــی دەمــەو بەیانــی و خۆرئاوابوونــدا (ئــەو دەبینـم)، ئـەو دیمەنانــە هەمــووی تیشــك و ڕووناکــی و شــوێن دەسـتی ئــەون، هەروەهــا لــە دڵۆپــە شــەونمەکانی هەنــاوی هەورەکانــەوە ئەیبینــم، هەروەهــا ئــەو دڵۆپــە شــەونمانەی دەمــەو بەیانــی بەســەر پــەڕەی گوڵەکانــدا دڵــۆپ ئــەدەن وەك بیســات (ڕایەخێکــی) لەنــوور چــنراو (ئــەوم پێشــان دەدەن)، هەروەهــا لەشـوێنی هەوەرەکانــدا (ئــەو دەبینــم) کــە دەوڵەمەنــدە بــە شـنەبای پــڕ لەدڵـۆپ، لەکاتـی سـەحەردا جوانتریـن (گریـان -بـاران)م پێشـکەش ئـەکا، لـەو هەمـوو شـوێنانەدا (دەیبینمـەوە)و دەمـی پەرداخەکـە دەخەمـە سـەر لێوم و لیـك و خولاصـەی شـەڕاب بەبەردەوامـی و بەدڵفراوانـی و گوشـادییەوە دەخۆمـەوەو (سـەرخۆش دەبـم بـە جەمـاڵ و شـوێنەواری درووسـتکراوانی خـوا)، (لـەم حاڵـەدا) نەمزانیـوە غەریبـی و دوورە وڵاتـی چییـە (ئیـبن و لفاریـز پانـزە سـاڵ ئەندەلوسـی جـێ هێشـتووە کـە شـوێنی ڕەسـەنی خۆیەتی، لـە مەککـەی پیـرۆز نیشـتەجێ بـووە)، دەڵـێ: نازانـم دوورە وڵاتـی و غەریبـی چییـە، ئـەو لەگەڵمـەو لەنێـو دڵ و ڕازەکانمدایـە، بۆیـە ئێمـە لەهـەر شـوێنێك بیـن هەسـت بـە دڵەڕاوکـێ و بێـزاری ناکەیـن.

لـەو دێڕانـەی سـەرەوە ئەوەیـە هەمـوو شـتەکان لەلایـەن خـواوە دەردەچـن، نـەك خوابـن، شـتەکان دەکاتـە ئاوێنـەی نـاوو سـیفاتە موبارەکەکانـی خـوای بـەرزو مـەزن[1]، ئەمـەش بـۆ هەرکەسـێك کـە کەوتبێتـە بـەر شـەوق و تاسـەی خـوای پـەروەردگار هەروایـە، هۆگـری درووسـتکراوەکان نابـێ و لایـان بـەلادا ناکاتـەوە، تەنهـا لـەو ڕووەوە نەبـێ کـە شـوێنی دەرکەوتنی سـیفاتەکانی و ناوونیشـانی یەکتایـی خـوای پـەروەردگارن.

دووبـارە دێمـەوەو دەڵێـم: لـەو بـاوەڕەدام شـتێکی ئاسـان نەبـێ خوێنـەر ئاشـنا بکـەم بـەو وشـەو دەسـتەواژانەی کـە باوکـم پەنـای بـۆ دەبـردن لـە ڕوونکردنـەوەی بارودۆخـی عاریفـان لەمەسـەلەی یەکێتـی بینینـدا، باوکـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ ئـەو حاڵەتـەی زۆر بەتـام و چێـژەوە بـۆ ئـەو کەسـانە شـی دەکـردەوە کـە لـەدەورو بەری بـوون، دەخزایـە نێـو بابەتەکـەو زۆر درێـژەی بـە قسـەکانی دەدا، هەنـدێ جـار لەنـاو قسـەکاندا ئـەو حاڵـە بەسـەر خۆیـدا دەهـات کـە باسـی دەکـرد، هەنـدێ جاریـش وای لێدەهـات لەبازنـەی خـۆی دەردەچـوو هاوارێکـی لـێ بـەرز دەبوویـەوە هەمـووان لەگـەڵ هاوارەکەیـدا ترسـیان لـێ دەنیشـت، هەرچەنـدە شـەرحی بکردایـەو درێـژەی پـێ بدابووایـە دەگەڕایـەوەو دەیگـوت: تەنهـا ئـەو کەسـە لـەو قسـەیە دەگات کـە دڵـی سـووتابێ بـە تاسـەو تامەزرۆیـی بـۆ خـواو، خۆشویسـتنی و، بەگـەورە گرتنـی، بـەڵام ئـەو کەسـەی کـە بەدیهێـنراوان بوونەتـە پەردەیـەك بەسـەر چاویـداو بەدیهێنـەر نابینـێ

---

(١) سەیری مەکتوباتی ئیمام ڕەببانی بکە: ٧٢/٢.

هەمـــوو خۆشەویســتیەكی هــەر بــۆ خۆشــیەكانی دونیایــەو لــەو پێناوەشــدا خــۆی ســەرقاڵ كــردوە بــۆ بەدەســت هێنانــی غەریــزەو ئارەزووەكانــی، ئــەو جــۆرە كەســە نــەك هــەر تامــی ئەمــە نــاكات، بەڵكــو زەحمەتــە لێشــی تێبــگات، چۆن كەسـێك شـیرینی ئـەو یەكێتی بینینــە دەچێــژێ لــە كاتێكــدا هیــچ بۆشــاییەك لەدڵیــدا نەماوەتــەوە بــۆ خۆشەویســتی و بەگــەورە گرتنــی خــواو، شــەوق و تاســە كــردن بــۆی، پێگــەی ئــەو كەســە لــە باشــترین حاڵەتیــدا هــەر ئەوەندەیــە كــە چەنــد وشــەو دێرێــك لــە (دیــن)دا ئەزبــەر بــكات و تــەواو، پاشــان قەناعــەت بەخــۆی بێنــێ بــەوەی كــە دەتوانــێ بەگوتنــەوەو دووبــارە كردنــەوەی ئــەو ڕستەو وشــانە كارلێــك لەگــەڵ دینــدا بكات و دینــداری خــۆی بــكات، وە هــەر لەســەر بنچینــەو بناغــەی ئــەو چەنــد وشــەو ڕستەیەش كــە تەنیــا فێــری بــووەو نەیچەشــتووە مامەڵە لەگــەڵ ئەوانــی دیكــە بــكات.

لەوانەیــە لــە گرنگتریــن قســەكانی باوكــم ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ دوای كۆتایــی هێنــان بــە ڕوونكردنــەوەی واتــای یەكێتــی بینیــن ئەوەبووبــێ كــە: ئەگــەر ئینســان كەوتــە نێــو ئــەو جــۆرە حاڵــەوە، واتە یەكێتــی بینینــی بــۆ درووســت بــوو حاڵێكــی بەســەردا هــات هۆشــی بەســەر درووســتكراوەكان نەمــا، ناتوانــێ خــۆی ســەرقاڵ بــكات بەدونیــاو مامەڵــە لەگــەڵ دونیــادا بــكات، ئەوەیــە لــە تەصەووفــدا پێــی دەڵێــن: فەنــا بــوون، ئــەو قۆناغــەش واتــە قۆناغــی فەنــا یەكێكــە لــە قۆناغەكانــی ڕێــگا بڕینــی كەســی بــەرەو خــوا چــوو (ســالیك)، دوای ئــەو فەنــا بوونــە باشــتر وایــە بەڵكــو پێویســتە ســالیك ئــەو حاڵــەش تێپەڕێنــێ، تەســلیمی نەبــێ و بەدیاریــەوە نەوەســتێ، ئەگــەر

توانـی ئـەو حاڵـی فەنـا بوونـەش ببـڕێ ئـەوا بەدڵنیاییـەوە دووبـارە دەگەڕێتـەوە هـۆش خـۆی و ئـەو بێهۆشـی و مەسـت بوونـەی نامێنێ، مامەڵـە لەگـەڵ دونیـادا دەكاتـەوەو خێـرو چاكـەو بەرژەوەنـدی و پشـك و بەشـی خـۆی تێـدا بەكاردێنـێ، وەك خەڵكانـی تـر، هـاوڕێ لەگـەڵ بینینـی وەحدانیـەت و یەكتایـی خـوا، لەگـەڵ ئـەوە بـەردەوام بەدیهێـنراوان وەك ئاوێنەیـەك دەبینـێ كـە سـیفاتەكانی خوایـان تێـدا دەردەكـەون، ئـەوەی دواتریـان پێـی دەگوتـرێ: بەقائـــی دوای فەنـا، یاخـود خـۆ ڕێكخسـتن لەگـەڵ هـەردوو حاڵـەت، نموونـەی بـەرزی خاوەنانـی ئـەم حاڵەتـی بەقائـەش بریتیـن لـە پێغەمبەرانـی خـواو هاوەڵانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی هـاوەڵان لەپلـەی شـهودو نزیـك بـوون لەخـوا لەیەكـتر جیـا بـوون[1]، واتـە: هەموویـان لەیـەك ئاسـتدا نەبـوون.

---

(١) هەنـدێ لـە خەڵكـی ئـەم جیاوازیـی پلـەو پێگەیـەی هـاوەڵان كـە هیـچ ڕاجیاییەكـی لەسـەر نییـە، لـێ تێكـەڵ دەبـێ لەگـەڵ ئـەو بەگـەورە گرتـن و ڕێـز بـۆ دانانـەی كـە پێویسـتە هەمـوو مسـوڵمانێك هەیبـێ بەرامبـەر هەمـوو هاوەڵانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـێ جیاوازیـی، ئـەو پلـە جیـاواز بوونـەی نێوان هـاوەڵان وای لـە هەنـدێ كـەس كـردووە ئـەو هەقـە بەخۆیـان بـدەن زمـان درێـژی بكـەن بەرامبـەر هـاوەڵان، بـە ڕەخنـە لـێ گرتـن و قسـەی ناشـیرین گوتـن بەوانەیـان كـە پێگـەو پلەیـان لەوانـەی دیكە كەمـترە، ئەمـەش وەهمێكی گەورەیـە، چونكـە واجـب بوونـی ڕێـز گرتـن لـە هاوەڵانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەبـەر ئـەوە نیـە هەموویـان پلـە بەرزەكانـی كەمـاڵ و تەواوێتیـان بەدەسـت هێنابـێ، بەڵكـو لەبـەر ئەوەیـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئامـۆژگاری هەموانـی كـردووەو فەرموویەتـی: {اللـه، اللـه لـە هاوەڵانـم، مەیانكەنـە شـوێن غـەرەزی خۆتـان لـەدوای مـن} ئەگـەر ئەمـە یەكـەم هـۆكاری واجـب بوونـی ئـەدەب نوانـدن بـێ لەگەڵیـان، ئـەوا سـنوور بەزاندنـی ئـەو واجبـە بـەر لـە هەمـوو شـتێك بێڕێـزی كردنێكـی ڕاسـتەوخۆیە بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ.

**لە كۆتاييدا... هەڵوێستی باوكم بەرامبەر بە بیدعە بەشێوەیەكی گشتی:**

هەر كەسێك لە باوكم نزیك بووبێ و باوكمی ناسیبێ هەستی بەوە كردووە كە چەندە توند بوو بەرامبەر بیدعە، ئەو هەڵوێستەشی لەسەر بناغەو بنچینەی خۆماندوو كردن و هەوڵدانی زۆری پێشووتر بوو، كە بریتیی بوو لە: گرنگی دانی زۆری بە تێگەیشتنی ورد لە مانای بیدعە، هەروەها گەیشتن بەو جیاوازییە زۆرەی لەنێوان بیدعەی قەدەغە كراوو مەصاڵیحی مورسەلەی ڕێگە پێدراو هەیە، هەوڵی زۆری بەخەرج دا لەپێناو گەیشتن بە جیاوازیی نێوان بیدعە كە گومڕایی نەبێ هیچی تر نییە، لەگەڵ داهێنانی سوننەتی حەسەنە كە سەرچاوەی پاداشت و خێرو چاكەیە، هەردوو داهێنانەكەش جێگیرو سابتن بە بڕیارێك لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ[1].

لەو بارەوە باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ دوای تەحقیق و لێكۆڵینەوەیەكی زۆر گەیشتە ئەوەی بڕیارێكی زانستی بدات،

---

(١) ئەوەی یەكەمیان لەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خواوە ﷺ وەرگیراوە كە پێشەوا موسلیم لە جابر خوا لێی ڕازی بێ ڕیوایەتی كردووە، فەرموویەتی: [خراپترینی كارەكان داهێنراوەكانن، هەموو داهێنراوێكیش گومڕاییە]، ئەوەی دووەمیشیان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایە ﷺ كە موسلیم لە جەریری كوڕی عەبدوڵلا ڕیوایەتی كردووە، فەرموویەتی: [هەر كەسێك لە ئیسلام سوننەتێكی چاكە دابهێنێ پاداشتی داهێنانەكەو پاداشتی ئەوەشی بۆ دەنوسرێ كە لەدوای خۆی كاری پێ دەكرێ، بێ ئەوەی لە پاداشتی هیچ یەكێكیان كەم بێتەوە].

لەبارەی خۆ دوور گرتن لە بیدعەو وریایی و حەزەر وەرگرتن، جا چ ئەو بیدعەیە لەڕێی تەصەووف و شێخەکانی تەریقەتەوە دزەی کردبێ، چ بە پاڵنەری نەزانین و چاولێکەری کوێرانە لەنێوان خەڵکیدا بەگشتی بڵاو بووبێتەوە.

جارێکیان بەبۆنەی ئەو نەخۆشیەوە کە دواتر بووە هۆی وەفاتی چوویە زیارەتی سەیید موحەممەد ئەلهاشمیەوە، یەکێ بوو لە شێخەکانی تەریقەتی شازلی، بەپیاوێکی چاك و خاکی ناوی دەرکردبوو، لەو کاتەدا یەکێ لە موریدانی دێتە لای شێخ، بەو شێوەیەی کە ئینسان سوجدە دەبا خۆی خوار دەکاتەوە، دەستی شێخ ماچ دەکات و لەسەر نێوچەوانی خۆی دادەنێ، باوکم بەهێواشی لە شانی موریدەکە دەداو پێی دەڵێ: {سەرت بەرز بکەوە سوجدە بردن لەسەر دەست درووست نیە، شێخ خودا ببیەخشێ بەهۆی ئەوەی نەخۆشە ئاگای لەتۆ نییە، ئەگەر ئاگای لێبێ قەدەغەت دەکا لەو کارە} لەو کاتە شێخ چاوەکانی دەکاتەوە، بە باوکم دەڵێ: {خوا پاداشتت بداتەوە کە بەرچاو ڕۆشنیان پێدەدەی لەپێناو پابەند بوون بە ڕێگاو ڕێبازی شەریعەتی پاك و خاوێن}.

موحەممەد تۆفیقی کوڕم گێڕایەوە ڕۆژێکیان یەکێ لە شێخەکانی تەریقەت خەڵکی جەزیرە بوو هاتە لای باوکم، لەو ژوورە بچووکەیدا کەتیایدا پێشوازی لە میوانان دەکرد، سەلامی لە باوکم کرد پاشان دەستی خستە سەر دەستەکانی و بەپێوە بەدیار باوکم وەستا، باوکم پێی گوت: دانیشە، شێخەکە

خۆی تاخیر کردو هەر بەپێوە وەستا، باوکم هاواری بەڕوودا کردو پێی گوت: پێت دەڵێم دانیشە! ئایا دەتەوێ بەو شێوازە مامەڵەم لەگەڵدا بکەی کە موریدەکانتان مامەڵەی پێ لەگەڵ ئێوە دەکەن؟!

هەروەها باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ زۆر ڕقی لەو عادەتە بڵاوە بوو کە هەندێ لە وتاربێژانی مزگەوت هەیانە، ئەویش ئەوەیە کە ڕۆژانی هەینی وتارەکانیان زۆر درێژ دەکەنەوەو نوێژەکانیان زۆر کورت دەکەن، لەبری ئەوەی بەپێچەوانەوە ڕەفتار بکەن، چونکە پێچەوانەکەی سوننەتەو موتتەفیقە لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ[1].

لە یەکەم وتاری هەینییدا لە مزگەوتەکەی خۆی مزگەوتی ڕیفاعی کاتێ بانگبێژەکان ویستیان بەر لە وتاری هەینی صەمەدییە بخوێنن کە عادەتیان پێوە گرتبوو، دەیانخوێندو پاشان صەڵەواتیان لێ دەداو سروودیان دەگوت، باوکم قەدەغەی کردن لەم کارە، هەموو نوێژ خوێنانی ئاگادار کردەوە ئەم کارە داهێنانە، پێچەوانەی ئەو ڕێبازەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری بووە، تا ئەمڕۆش سوپاس بۆخوا لە مزگەوتی ڕیفاعی بەم شێوەیەیە.

---

(١) لە صەحیحدا هاتووە کە ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕکعاتی یەکەم سوڕەتی (الجمعة)ی دەخوێندو، لەڕکعاتی دووەمیش سوڕەتی (المنافقون)ی دەخوێندەوە.

## هەڵوێستی باوكم لەبارەی
## یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری خوا ﷺ (مەولوود)

ئـەو لـە دانیشـتنەكانی یـادی لەدایـك بوونـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئامـادە دەبـوو، بەمەرجـێ خراپەیـەك یـان بیدعەیەكـی كرداریـی یـان گوفتاریـی تێـدا نەكرابوایـە، ئەگـەر -دوور بوایـە لـە شـتی ناپەسـندو بیدعـە- بـە مەجلیسـی زیكـری هەژمـار دەكـرد، كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەو جـۆرە مەجلیسـانەی بـە مەنـدوب دانـاوە، باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ مەجلیسـەكانی یـادی لەدایـك بوونـی پێغەمبـەری ﷺ بـەوە دادەنـا كـە دەچنـە چـوار چێـوەی ئـەو فەرمایشـتە كـە دەفەرمـووێ: {هـەر كۆمەڵـە خەڵكێك دابنیشـن و زیكرو یـادی خوای پـەروەردگار بكـەن، ئـەوا فریشـتەكان دەوریـان دەگـرن و ڕەحمـەت و بەزەیـی خـوای پـەروەردگارو سـەكینەتیان بەسـەردا دەبـارێ، خـوای پەروەردگاریـش لـەلای فریشـتەكان باسـیان دەكات}، فەرمایشـتەكە بەڵگەیـە لەسـەر گەورەیـی كۆبوونـەوەو دانیشـتن لەسـەر زیكـرو یـادی خـوای پـەروەردگار، بێگومـان كۆبوونـەوەش لەسـەر صەڵاوات دان لـە پێغەمبـەری خـواو ﷺ سـتایش كردنـی و پێـدا هەڵگوتنـی لـە باشـترین جۆرەكانـی زیكـرو یـادی خـوای پـەروەردگارە.

بـەڵام ئەگـەر دانیشـتنەكە شـتێكی ناپەسـندو خراپـی تێكـەڵ بوو، بـۆ وێنـە: وەك تێكـەڵ بوونـی پیـاوان و ئافرەتـان، یاخـود گوتنـی

چەنـد گۆرانــی و سروودو شـیعرێك پێچەوانــەی ڕێبــازو سـوننەتی پێغەمبــەری خــوا ﷺ، ئـەو کاتــە حوکمەکـەی دەگـۆڕێ، بــەلای زیــان و خراپــەدا دەچــێ نــەك بەرژەوەنـدی و چاکــە، بەگوێــرەی ئـەو بنچینـە شــەرعیەی کـە دەڵــێ: {درء المفاسـد مقـدم عـلى جلـب المصالـح}[1]، دوور خســتنەوەی زیانــەکان لەپێشــترە لــە بەدەســت هێنانــی بەرژەوەندییــەکان.

لەبــارەی بەپێـوە وەسـتان لەکاتـی باسـکردنی لەدایـك بوونەکـەی ﷺ، ئــەوەی لەیــادم بــێ لەســاڵانی ســەرەتای نیشــتەجێ بوونمــان لــە

---

(١) دەڵێــم: ئەگــەر ڕیــش ســپیانی بانگەشــەکارانی وەهابــی ئــەم جــۆرە تەفصیـل و ڕوونکردنەوەیـە بـدەن لـە مەسـەلەی حوکمـی مەولـود ئـەوا ئێمـەش پاڵپشـتیان دەکەیـن، بـەڵام ئـەوەی جێگـەی سەرسـوڕمانە ئەوەیـە ئـەوانِ نکوڵی لـە کۆبوونـەوە لەسـەر خوێندنـەوەی سـیرەو ژیاننامـەی پێغەمبـەری خـواو ﷺ صەڵـەوات دان و سـتایش کردنـی دەکـەن، هەرچەنـدە دانیشـتنەکە خاڵیـش بـێ لـە خراپـەکاری و شـتی ناپەسـند، ئـەوەی جێـی سەرسـوڕمانە ئەوەیـە ئـەوان یـادی چەنـد سـاڵ تێپەڕیـن بەسـەر لەدایـك بـوون یاخـود وەفـات کردنـی موحەممـەدی کـوڕی عەبدولوەهـاب دەکەنـەوە لـەو یادەشـدا لێکۆڵینـەوە لـە ژیاننامەکـەی دەکـەن لەڕێگـەی بەسـتنی چەندەهـا کـۆڕو سـیمیناری جـۆراو جـۆرو خـەرج کردنـی پارەیەکـی زۆر، بەبیدعەیەکـی قەدەغـە کـراوی نازانـن، بـەڵام ئەگـەر هەمـان ئـەو بۆنـەو یـادە بگـۆڕێ بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە ژیاننامـەی پێغەمبـەری خـواو ﷺ سـتایش کردنـی و صەڵـەوات دان لەسـەری، ئـەو کات ڕاسـتەوخۆ هەمـان کار دەگـۆڕێ بـۆ بیدعەیەکـی قەدەغـە کـراو، لەهەمـوو لایەکـەوە هێرشـی دەکرێتـە سـەر، باشـە لەبەرچـی بیدعـە دەبێتە کارێکـی ڕێگە پێـدراوو شـەرعی کاتێـك لەبەرژەوەنـدی موحەممـەدی کـوڕی عەبدولوەهـاب بـێ، بـەڵام بـە بیدعـەو حەرامیـی دەمێنێتـەوە کاتـێ لەبەرژەوەنـدی سـەروەرمان پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـێ؟!

دیمەشق لەگەڵ خەڵکەکە بەژداری نەدەکرد لە هەڵسانە سەر پێ، بۆچوونی وابوو ئەمە بیدعەو زیادکراوێکە چۆتە نێو ئەو مەجلیسە زیکرەی کە گوێ گرتنە لە سیرەو ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەمەشدا لەوانەیە پشتی بەو فەتوایەی ئیبن حەجەری هەیتەمی بەستابێ لە (فەتاوا حەدیسیە)کەیدا کە دەڵێ: (خودی هەڵسانە سەر پێ بیدعەیە)، بەڵام دواتر هەڵێنجانی لەو بابەتەدا گۆڕا، لەگەڵ خەڵکیدا بەژداری هەڵسانە سەر پێی دەکرد، ئەوەی بزانم پەشیمان بوونی لە بۆچوونەکەی یەکەم لەبەر ئەوەبوو کە تێبینی ئەوەی کرد مەبەست لە هەڵسانە سەرپێ بەگەورە گرتنی پێغەمبەری خوایە ﷺ، بەگەورە گرتنی پێغەمبەری خواش ﷺ شتێکی ڕێگە پێدراوە، بگرە داواکراوو پێویستیشە، ئەو شتانەش کە خەڵکی وەك ئالەتی بەگەورە گرتن بەکاری دەهێنن بریتیین لە دوو شت: یەکەمیان: بەزمان بەگەورە بگیرێ، دووەمیان: ئەو شتەی کە خەڵك وەکو عورف و عادەت بەکاری دەهێنن بۆ بەگەورە گرتن، ئەگەر ئەو عادەت و عورفە لەگەڵ دەقێکی شەرعی و حوکمێکی شەرعی جێگیر، تێك نەگیرێ.

باوکم زۆر حەزی بەو ئاوازو سروودانە دەکرد کە لەبارەی ستایشی خوای پەروەردگار، یاخود ستایشی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگوتران بەشێوازێکی شەرعی ڕێگە پێدراو، زۆر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە ئەوانەی ئاوازەکە دەچڕن، ئەوانەش کە گوێ دەگرن لە حاڵێکی پڕ لە ئەدەب و هێمنیدا بن لەگەڵ خوای پەروەردگارو پێغەمبەری خوا ﷺ، نەك وەك ئەوانەی هات و هاوار دەکەن و لەحن و ئاوازی بەهات و هاوارو ناشایستەو بێزارکەر دەچڕن.

هەندێ جار ئەگەر جووڵەو حەرەكاتی ناشایستەی وەك یەكتر ئاگادار كردنەوە بە فیكە یاخود چەپڵە، یاخود هەر جوڵەیەكی تری لەم شێوەیەی بینیبوایە زۆر بەتوندی نكوڵی لێ دەكرد، هەندێ جار لەوانەبوو زۆر توڕەش بوایە، لەبەر ئەوەی مەجلیسەكە مەجلیسی زیكرو ستایشی خوای پەروەردگارو صەڵەوات دانە لە پێغەمبەرەكەی ﷺ، فیكەو چەپڵەو ئەو جوڵە ناشایستانەش جمهوری زانایان نكوڵیان لێ كردووە، نابێ و ناگونجێ دانیشتنێكی وا موبارەك و پیرۆز تێكەڵ بە شتێك بكرێ كە پێچەوانەی شەرعە، یاخود ناگونجێ لەگەڵ ئادابەكانی شەرعی خوای پەروەردگار.

بیرم دێ جارێكیان ئامادەی بۆنەیەكی گەورە بوو لەگەڵ هەندێ لە زانایانی دیكەی دیمەشق لە یەكێ لە مزگەوتەكان، كاتێك زاناكان هاتنە نێو مزگەوت، باوكی منیشیان لەگەڵدا بوو، كۆمەڵێكی زۆر لە خەڵكەكە بەلای چەپ و ڕاستی دەرگاكە ڕیز بوون بۆ پێشوازی كردن لێیان، دەستیان كرد بە دەنگ بەرز كردنەوەو فیكەو چەپڵە لێدان، باوكم زۆر لێیان توڕە بوو، ڕووی تێكردن و قەدەغەی كارەكەی لێ كردن، نەك هەر ئەوەندەو بەس بەڵكو نكوڵی لەو زانایانەش كرد كە لەگەڵیدا بوون لەسەر ئەوەی خۆیان بێدەنگ كردووە لەم كارە گوناح و خراپە.

پوختەی قسان ئەوەیە باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ دەستی بە گرنگترین دوولاكەی كەماڵاتی دین گرتبوو، كەم كەس هەیە لەم سەردەمەی خۆماندا وەك باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ

هـەردوو لایەنەکـەی تێـدا کۆبووبێتـەوە، ئـەو دوولایەنـەش بریتیـن لـە: بەتونـدی دەسـت گرتـن بـە تەصەووفـی پـاك و ئادابەکانـی، هەروەهـا بەتونـدی دوور کەوتنـەوە لـەو بیدعـەو خراپەکاریانـەی کـە خەڵـك ئولفەتـی پـێ گرتـوون و تێیانـدا بـڵاوە.

## پەیوەندی باوكم بە زانایانی دیمەشق، كەنارگرتنی، پاشان چالاكیەكانی، دواتر دووبارە كەنار گرتنی

ئەوەی باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ لەو بارەوە بۆی باس كردووم ئەوەیە كە یەكترناسینیان لەگەڵ یەكەم زانای دیمەشق - جگە لەو زانا كوردانەی كە پێشتر ناوم هێنان و پەیوەندیان لەگەڵ باوكم هەبوو- بریتیی بوو لە شێخ ئەبو لخەیر ئەلمەیدانی ڕەحمەتی خوای لێبێ، ئەم یەكتر ناسین و پەیوەندیەش بەچەند مانگێكی كەم دوای گەیشتنی بە دیمەشق درووست بوو.

بەسەرهاتی یەكتر ناسینەكەیان بەم شێوەیە بوو:

شێخ ئەبولخەیر لەلایەن چەند پیاوێكی گەرەكی ئەكراد بانگهێشت دەكرێ بۆ دانیشتنێك لە باخی (مەزرەعە)ی یەكێك لە پیاوانی گەڕەكەكە، دیارە یەكێ لە ئامادەبووان پرسیاری لەبارەی حوكمێكی شەرعی لێ دەكات لەمەزهەبی شافیعی، شێخ (ئەبولخەیر)یش حەنەفی مەزهەب بوو، دوو دڵ دەبێ لە وەڵامەكەو، وەڵامێكی دڵنیاكەری پێنابێ، ئەوانیش باسی زانایەكی كوردی شافعی مەزهەبی بۆ دەكەن و پێی دەڵێن: كە بەم دواییانە هیجرەتی كردووەو هاتۆتە دیمەشق، شێخ ئەبولخەیریش ئارەزووی خۆی پێشان دەدا لەوەی ئەو زانایە ببینێ و بیناسێ.

باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ گوتـی: {هـەر ئـەو كاتـە، ئـەو كەسـەی باسـی منـی بـۆ شـێخ ئەبولخەیـر كردبـوو هاتـە لام و باسـی ئـەوەی بـۆ كـردم كـە زانایەكـی بەڕێـز هەیـە نـاوی شـێخ ئەبولخەیـری مەیدانیـە، زۆر حـەز دەكات بتبینـێ و بتناسـێ، باخەكـەش نزیـك بـوو، منیـش لەگەڵـی چـووم، شـێخ ئەبولخەیـرم ناسـی و بەدرێژایـی ڕۆژەكـە لـەوێ لەگـەڵ خەڵكەكـە دانیشـتم، ئەو مەسـەلەیەی كـە ئـەوان پێشـتر قسـەیان لەسـەر كردبـوو دووبـارە باسـیان كـردەوەو ڕوویـان لەمـن كرد بـۆ ئـەوەی وەڵامەكـەی بزانن، منیـش بۆچوونـی گـەورە پیاوانـی مەزهەبـی پێشـەوا شـافیعیم لـەو بـارەوە بـۆ هێنانـەوە}[١].

دوای ئەبولخەیـر، باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ ئامـادە دەبـوو لـە دەرسـەكانی عەللامـە شـێخ بەدرەددیـن ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ، لـە (دار الحدیـث) و شـوێنی دیكـەش، چـووە (دار الحدیـث)و ئەوانـی ناسـی، لەهەنـدێ لـە دەرسـەكانی ئەو شـوێنە ئامـادە دەبـوو، وە زۆر سەرسـامیش بـوو بـە تایبەتمەندیـە دەگمەنەكانـی شـێخی ناوبـراوو.

نازانـم داخـوە شـێخ (ئەمیـن سـوێد) و (شـێخ مەحمـود عەتتـار) و (شـێخ عەبدولحەكیـم ئەفغانـی) ناسـیون یـان نـا، زیاتـر گومانـم بـۆ ئـەوە دەچـێ ئەوانـی نەبینیبـێ و نەیناسـیبن، بیریشـم نایـە شـتێكی لەبـارەی پەیوەنـدی خـۆی و ناوبـراوان بـۆ بـاس كردبـم.

---

(١) باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ باسـی ئـەو مەسـەلە فیقهیـەی بـۆ كـردم كـە بـووە هـۆی گرێدانـی پەیوەنـدی خۆشەویسـتی نێـوان ئـەوو، شـێخ ئەبولخەیـر ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ، بـەڵام ئێسـتا لـە بیـرم نەمـاوەو نایەتـەوە یـادم مەسـەلەكە چ بـوو.

پێدەچێ هۆكاری ئەم یەكتر نەناسینەش ئەوەبووبێ باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ لە (١٠) ساڵی یەكەمی گەیشتنمان بە دیمەشق زیاتر مەیلی بەلای كەنارگرتویی و دووره پەرێزیدا دەچوو، ڕووی بەلای وانە گوتنەوە بوو بە قوتابیانی گەڕەكی ئەكراد، لەگەڵ ئەو گەشتانەی كە دەیكردن بەمەبەستی پەیدا كردنی بژێوی، تێكەڵاوبوونی زیاتر كورتهەڵاتبوو لەو هاوڕێیانەی كە ئولفەتی پێوە گرتبوون و دەچووە لایان، واتە: لەگەڵ ئەو زانا كوردانەی كە یەك گەڕەگ كۆی كردبوونەوە.

لەوانەیە گرنگترین هۆكاری لا كردنەوەی باوكم و سەرنجدانی بەلای هەندێ لە زانایانی دیمەشق ئەوەبووبێ كە هەندێ لە قوتابیە عەرەبەكانی گەڕەكە جیاجیاكانی دیمەشق دەهاتنە لای باوكم بۆ ئەوەی دەرسیان پێ بڵێ، زۆربەی ئەو قوتابیانەش قوتابی پەیمانگاكان بوون، قوتابی ئەو شێخ و مامۆستایانە بوون كە دیارو ناسراوو بەناوبانگ بوون، كاتێكیش دەهاتنە لای باوكم باسی شێخ و مامۆستاكانی خۆیان لەلای باوكم دەكرد.

ڕەحمەتی خوای لێبێ بۆی باس كردم هەندێ لەو قوتابیانەی كە زۆر جوان و ڕێك و پێك لە دەرسەكان ئامادە دەبوون لەپڕێكدا لێی دابڕان، پاشان دوای ماوەیەك دێنەوە لای و داوای لێبوردنی لێ دەكەن پێی ڕادەگەیەنن كە دوای ئەوەی مامۆستاكانیان زانیویانە لەدەرەوە دەرسانێك دەخوێنن جیا لە دەرسەكانی پەیمانگا، لەسەر ئەوە سزایەكی زۆر توندیان داون، پەیمانیشیان لێ وەرگرتوون جارێكی تر لا نەكەنەوە بەلای ئەو شوێنەدا كە دەرسی لێ دەخوێنن!

لەو کەسانەی کە باوکم لەپڕێکداو لەکاتێکی زوو ناسینی شێخ ئیبراهیم ئەلغەلایینی بوو ڕەحمەتی خوای لێبێ، شێخ ئیبراهیم لە (قەتنا) دادەنیشت و موفتی ئەو شوێنە بوو، باوکم زوو زوو سەردانی دەکرد، هەندێ جار شێخ داوای لە باوکم دەکرد لەلای بمێنێتەوە ئەویش جاری وا هەبوو شەوێك یان دوو شەو لەلای دەمایەوە، باوکم زۆر سەرسام بوو بە زیکرو وەرع و پەرستشی زۆری ناوبراو، خۆشەویستیەکی زۆر لەنێوانیاندا هەبوو، کۆتا چاوپێکەوتنی نێوانیان سەردانی شێخی ناوبراو بوو بەچەند ڕۆژێکی کەم بەر لە وەفاتی (واتە: وەفاتی شێخ ئیبراهیم خۆی ڕەحمەتی خوای لێبێ) بۆلای باوکم.

وابزانم دوای ئەو تەرتیبەی سەرەوە ئنجا شێخ و مامۆستامان حەسەن حەبەنکەلمەیدانی دەناسێ، یەکترناسینەکەش بە ڕێکەوت درووست دەبێ لە کتێبخانەی ئەحمەد عەبید، هەردووکیان زوو زوو سەردانی ئەو کتێبخانەیان دەکرد وەك پێشتریش ئاماژەم پێکرد، پاشان ئەو هاوڕێیەتیەی نێوانیان زیاتر دەبێ زیاتر یەکتر دەناسن و نێوانیان گەرم و گوڕتر دەبێ بەتایبەت دوای ئەوەی باوکم من لە پەیمانگا شەرعیەکەی ئەو دادەنێ، کە دواتر ناوی بوو بە پەیمانگەی تەوجیهی ئیسلامیی.

**لا كردنەوە بەلای كەنار گرتن و دوورە پەرێزیدا:**

ئەو پەیوەندیانەی نێوان باوكم و ئەو زانا بەڕێزانەی لەسەرەوە باسم كرد تەنها یەكتر ناسینێكی ئاسایی بوو، تەنیا لەو چوار چێوەیە بوو كە جار جارە یەكتریان دەبینی و بەیەكتر دەگەیشتن، بێ ئەوەی پەیوەندیەكانیان زیاد بكات و بەرەو پێش بچێ، بۆ نموونە: نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی لەچوار چێوەی چالاكیەكی كۆمەڵایەتی یان ئاینی یارمەتی یەكتر بدەن و هاریكاری یەكتر بكەن.

لەبەر ئەوەی باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ هەر لەو كاتەوەی هاتینە دیمەشق و لەوێ جێگیر بووین مەیل و ئارەزووی بەلای كەنارگرتن و دوورە پەرێزی دەچوو، دوور لە چالاكی و چوونە نێو بابەتە كۆمەڵایەتیەكان، یاخود كارو بارە ئاینییە گشتیەكان.

بیرم دێ ئەو كاتەی چالاكیەكانی ڕابیتەی زانایانی ئاینی زۆر بوون بەتایبەت لە ساڵانی (١٩٥٠) و (١٩٥١)و دواتریش، من وەك فێرخوازێكی بچووك موتابەعەی ئاهەنگەكان و میهرەجانەكانیانم دەكرد هەفتانە لە مزگەوتەكان سازیان دەكرد، بێ ئەوەی جارێك لەجاران باوكم بەژداری تێدا بكات، بەڵكو هیچ پلەیەكی ئەندام بوونیشی نەبوو لەو ڕابیتەیە.

من زۆر بەخوێن گەرمیەوە گوێم بۆ قسەو وتارەكانیان دەگرت، زۆر دڵم پێخۆش دەبوو، هەندێ جاریش باسی قسەو وتارەكانی ئەو میهرەجانانەم بۆ باوكم دەگێڕایەوە، بەڵام ئەم

خـۆی لەنێـو قسـەكانی منـدا نەدەبینیـەوە، لەسـۆنگەی ئـەوەدا كـە دوورو نزیـك پەیوەندیەكـی بـەوەوە نەبـوو، هیـچ قسەیەكیشـی نەبـوو لەسـەر ئـەو قسـانەی دەمكـردن، باسـەكەم بـۆ تـەواو دەكـرد بـێ ئـەوەی هیـچ كۆمێنتێكـی هەبـێ لەسـەر قسـەكانم.

باوكـم لەسـەر ئـەو دووره پەرێزیـەی خـۆی مایـەوە بژاردەیـەك لـە زانایانـی ناسـی بێئـەوەی لەگەڵیـان تێكـەڵ بـێ، چالاكیەكانـی كـورت هەڵهێنابـوو لـە دەرس گوتنـەوە بـە هەنـدێ قوتابـی كـە دەهاتنـە لای، لەگـەڵ هەنـدێ گەشـت و گـەڕان بەمەبەسـتی بەدەسـت هێنانـی ڕزق و ڕۆزی، پاشـان هەمـوو توانـاو چالاكـی و تاقەتـی خـۆی لـە خوێندنـەوەو ئەنجامدانـی عیبادەتـی جیـا جیـا خـەرج دەكـرد بـەو شـێوەیەی كـە لـە بەشـەكانی ڕابـردوو باسـم كـردو لێـی دووام.

لەسـەرەتای دامەزراندنـم بـە مودەڕیـس لەشـاری (حیمـص) لەمـاوەی مانەوەمـدا لـەم شـارە لەسـاڵی (١٩٥٨) تـا سـاڵی (١٩٦٠) لـەو ماوەیـەدا باوكـم بەشـێكی زۆر لـە زانایانـی حیمصـی ناسـی، خۆشـی دەویسـتن و ستایشـی دەكـردن لەسـەر ئەو سـیفاتە باشـانەی هەینابـوو، هـەر جارێـك باسـی بكردنایـە ئەو سـیفاتە باشانەشـی باس دەكـردن، زوو زوو دەهاتـە ئـەو شـارە بـۆ زیارەتـی (خالیـدی كـوڕی وەلیـد) و (عومـەری كـوڕی عەبدولعەزیـز)، وە زیارەتـی زانایانـی ئـەو شـارە، هەروەهـا بـۆ گەیاندنـی پەیوەنـدی و سـیلەی ڕەحـم، ئـەو هەقیقەتـەی كـە هیـچ گومانێـك هەڵناگـرێ ئەوەیـە: باوكـم دڵ پەیوەسـت بـوون و سـینە فراوانـی لـەو شـارەدا بـەدی دەكـرد.

دوای ئـەوەی وەك (موعیـد) لـە كۆلێـژی شـەریعە دامـەزرام لـە كۆتایـی سـاڵانی (١٩٦٠)، باوكـم زۆر گوێـی لـە هەواڵـی ئـەو مامۆسـتاو سەرپەرشـتیارانە دەگـرت كـە كۆلێژەكەیـان بەڕێـوە دەبـرد، لـە پێشـەوەی هەموویـان (د. موسـتەفا سـوباعی، موحەممـەد موبـارەك، د. ئەمیـن ئەلـمصری)، بـێ ئـەوەی هیـچ كامێكیـان ببینـێ جگـە لـە دكتـۆر ئەمیـن ئەلـمـصری كـە زۆر دەهاتـە لای باوكـم و زۆر باوكمـی خـۆش دەویسـت لەسـۆنگەی سـۆفی بوونـی و لێكۆڵینـەوەی لـە تەصـەووف.

ئـەو كاتـە دكتـۆر موسـتەفا سـوباعی تووشـی شـەلەلێكی جوزئـی ببـو لـە لاشـەیدا، ئەمـەش ببـووە بەربەسـت لەبـەردەم زۆربـەی چالاكیەكانـی، بـەڵام هەلێكـی باشـی بـۆ ڕەخسـاندبوو كـە پێشـتر هەلـی وای بـۆ نەڕەخسـابوو، سـوودی لـە نەخۆشـیەكەی بینیبـوو لـەوەدا كـە زیاتـر گەشـە بـە هەسـت و شـعوری ڕۆحانـی خـۆی بـكات و قـووڵ بێتـەوە لـەو پەیوەندییـە پەنهـان و ویژدانییـەی كـە پەیوەسـتی دەكات بەخـواوە، باوكـم دەیزانـی دكتـۆر موسـتەفا سـوباعی نەخۆشـەو تووشـی شـەلەل بووە ئـارەزووی خۆی پێشـاندا كـە دەیـەوێ سـەردانی بـكات، لەكاتێكـدا پێشـتر نەیبینیبـوو.

مـن لەگەڵـی بـووم لـەو زیارەتەیـدا كـە بـۆ یەكـەم جـار یەكتریان بینـی، موسـتەفا سـوباعی ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ نەیتوانـی ئـەو دڵخۆشـبوونە زۆرەی خـۆی بشـارێتەوە بـەو زیـارەت و یەكـتر بینینە، دوای ئـەوەی باوكـم دوعـای ئـەوەی بـۆ كـرد خـوای پـەروەردگار شـیفای بـدات سـوباعی بـە باوكمـی گـوت: مـن بەشـایەتت دەگـرم

ئەگەر ئەو چاك بوونەوەم ببێتە هۆی نەمان و لەناوچوونی ئەو حاڵە ئیمانییەی کە تێیدام لەگەڵ پەروەردگارم و بەهۆی نەخۆش کەوتنمەوە بۆم درووست بووە، ئەوا من هیچ پێویستم بە شیفاو چاك بوونەوە نییە، ئەو قسەیەی سوباعی زۆر کاری لە باوکم کرد، پێی گوت: داوا لەخوا دەکەم هەم شیفات بدات و هەم ئەو حاڵەتە ئیمانییەت لەسەر بمێنێ کە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوی.

کەواتە: ئەوەی باسم کرد سنووری ئەو پەیوەندیانە بوو کە باوکم لەگەڵ زانایانی شام و خەڵکەکەی هەیبوو، لەو قۆناغەدا ئەو پەیوەندیە تاکە کەسیانەی کە لەگەڵ ئەواندا هەیبوو سنوردار بوو نەپەڕیبۆوە بۆ هیچ جۆرە چالاکیەکی ئاینی و کۆمەڵایەتی و هەماهەنگیی، ئەمە جگە لەو فاکتەرو هۆکارە شاراوانەی کە هەبوون.

ئەم بارودۆخەی باوکم بەم شێوەیە مایەوە تا سەرەتای شەستەکان، لەسەرەتای شەستەکانەوە ئەم پەیوەندیانە لە ژیانی باوکمدا جۆرێکی تازەیان بەخۆوە بینی لە سیستەمی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیەکانی لەگەڵ زانایان و هەم لەگەڵ خەڵك.

**سەرەتای بەژداری کردنی لە هەندێ چاڵاکی ئایینی:**

سـەرەتای بـەژداری کردنـی لـە هەنـدێ لـە چاڵاکیـەکان ئـەو کاتــە دەســتی پێکــرد کــە شــێخ حەســەن حەبەنکــە لەمەیدانــی خــۆی هەڵبــژارد بــۆ فەتوادانــی گشــتی لــە هەمــوو وڵاتــی ســوریا، لــەو ســۆنگەیەوە زانایانــی دیمەشــق هەڵســان بــە چاڵاکیــە ئینتیخابیەکانیـان، باوکـم ئـەو قەناعەتـەی بـۆ درووسـت بـوو کـە گەیشــتن بــە بڕیارێــك لــەو کارەدا کــە خــوای پــەروەردگار پێــی ڕازی بـێ و پاشــان کارکــردن لەپێنــاو جێبەجــێ کردنــی بڕیارەکـە بەرپرسـیارێتیەکی ئاینیـە ڕاسـتەوخۆ دەکەوێتـە ئەسـتۆی زانـا ڕیـش سـپیەکان، کــە ئەویــش یەکێکــە لــەوان و ئــەو بەرپرســیارێتیەی دەکەوێتـە سـەر شـان، لەبـەر ئـەوە پێـی وابـوو هیـچ ڕێگایەکـی تـری لەپێـش نییـە جگـە لـە کارکـردن لـەو چـوار چێوەیـەدا کـە مەسـەلەی هەڵبژاردنـە.

باوکـم بۆچوونـی وابـوو وەزیفـەی وەرگرتنـی فەتوادانـی گشـتی لەسـوریا وەسـتاوەتە سـەر ڕەچـاو کردنـی مەزهەبـی حەنەفـی، بۆیـە پێویسـتە ئـەو زانایـەی بـۆ ئـەم مەبەسـتە هەڵدەبژێـردرێ لـە شـارەزایانی ئـەو مەزهەبـە بـێ، لەبـەر ئـەم هـۆکارە پێشـنیاری یەکەمـی ئەوەبـوو شـێخ عەبدولوەهـاب حافـز هەڵبژێـردرێ، کـە مەشـهور بـوو بـە (الزيـت والدبـس)، شێخ عەبدولوەهـاب حەنەفی مەزهـەب بـوو، یەکێـك بـوو لـەو کەسـانەی کـە باوکـم زۆر خۆشـی دەویسـت و ڕێـزی لـێ دەنـا بەهـۆی ئـەو زوهـدو وەرع و چاکییـەی کـە ناوبـراو هەیبـوو.

بـەڵام شـێخ عەبدولوەهــاب زۆر بەزەقــی ئـەوەی ڕەت کــردەوە خـۆی هەڵبژێـرێ بۆ ئـەم پۆسـتە، دوای ئـەوەی شـێخ عەبدولوەهاب داواکاریەکـەی ڕەت کـردەوە، باوکـم پێــی وابــوو باشــترین بەدیـل شــێخ حەســەن حەبەنکەیــە، هەمــوو زاناکانــی دیکــەش هەمــان بۆچوونــی باوکمیــان هەبــوو، شــێخ حەســەن حەبەنکــە شــافعی مەزهــەب بــوو، بــەڵام بــای ئەوەنــدە لێکۆڵینــەوەو خوێندنــەوەی فراوانــی هەبــوو، زانیــاری و شــارەزاییەکی فیقهــی هێنــدە بەهێـزو فراوانــی هەبــوو وای لێکردبــوو شایســتەی هەڵســان بەجێبەجــێ کردنــی ئــەو کارە بــێ.

باوکـم لەسـەری بـوو لەگـەڵ زاناکانـی دیکـەی دیمەشـق بـۆ ڕاوێـژ کـردن پەیوەنـدی بـە زانایانـی پارێزگاکانـی دیکـە بکـەن، لەپێنـاو ئـەوەی بگەنـە بڕیارێکـی یـەکلا کـەرەوە کـە هەمـوان تێیـدا بـەژدار بـن.

لێـرە پێویسـت نـاکات باسـی ئـەو مشـت و مـڕو ڕاگۆڕینـەوەو پـرس و ڕاوێـژو ئەنجامانـە بکـەم، کـە دواتـر دەرکەوتـن لەسـەر ئـەو مەسـەلەیە، واتـە: نامـەوێ بچمـە نێـو باسـی ڕێ و شـوێنەکانی جێبەجـێ کردنـی ئـەو کارە.

مەبەسـتی مـن تەنیـا ئەوەیـە سـەرنجی خوێنـەر ڕابکێشـم کـە هەڵسـان بـەم بەرپرسـیارێتیە ئاینیـە سـەرەتای بـەژداری کردنـی باوکـم بـوو لـە هەنـدێ لـەو چالاکیـە ئاینـی و کۆمەڵایەتیانـەدا، لەگـەڵ براکانـی تـری لـە زانایـان.

ئـەم هەماهەنگییــە ئەگــەر هیــچ بەروبــووم و ئەنجامێکیشــی نەبـێ، هەڵســانە بـە واجبێکـی ئاینـی کـە پێویسـت بـوو زانایـان بـەژداری تێـدا بکـەن بـۆ ئـەوەی دوارۆژ عوزرێکیـان هەبـێ بەرامبـەر بەخـوا، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی بـووە هـۆکاری لەدایـك بوونـی کۆبوونەوەیەکـی هەفتانـەی پـڕ خێـرو بەرەکـەت، کۆمەڵێـك لـە زانـا دیارەکانـی دیمەشـق پێـك هاتـن لەسـەر ئـەوەی هەفتانـە چاوپێکەوتنێکـــی زانســـتیانەیان هەبـــێ، لـــەو چاوپێکەوتـــن و کۆبوونەوەیـەدا لێکۆڵینـەوە لـە کتێبێکـی فیقهـی کۆکـەرەوە بکـەن، لــە مەزهەبــی ئیــمام شــافعی، باوکیشــم یەکێــك بــوو لــە بــەژدار بـووان، لـە دیارتریـن ئـەو کەسـانەی کـە بەژداریـان لـەو دانیشـتنە هەفتانەیـە دەکـرد شـێخ حەسـەن حەبەنکـە بـوو، دەرسـەکان لەماڵی ئەوبـوو، دیارتریـن بـەژدار بووانـی تـر: شـێخ ئەحمـەد دەقـر، شـێخ عەبدولکەریـم ڕیفاعـی، شـێخ دکتـۆر ئەمیـن ئەلمصـڕی ڕەحمەتـی خــوای گــەورە لەهەموویــان بــێ و لـــە بەهەشـــتی فیردەوســـدا نیشـــتەجێیان بــکات.

شــتێکی ئەوتـۆ نازانـم لەسـەر ئـەوەی کـە ئایـا کۆبوونـەوەی ئـەو زانایانـە لەسـەر ئـەو دەرسـە زانسـتیە پـڕ لـە سـوودو قازانجـە چەنـدی خایانـدو مـاوەی چەنـد بـەردەوام بـوو، لەبـەر ئـەوەی ئەوکاتــە مــن لــە قاهیـرە بـــووم لەلایـەن زانکـۆی دیمەشـــقەوە نێردرابـووم بـۆ ئـەوەی شایسـتەی زانکۆیـی بەدەسـت بهێنـم، هەموو ئــەو شـــتانەی لــەو بــارەوە دەمزانیــن باوکــم هەواڵــی پێــدەدام، دوای ئـەوەش خوێندنـم تـەواو کـردو گەڕامـەوە دیمەشـق ئـەو چاوپێکەوتنــە هەفتانەیــەی ئــەوان لەکۆتاییەکەیــدا بــوو.

لـە دیارتریـن ئـەو هۆكارانـەی كـە بوونـە هـۆی كۆتایـی هێنـان بـەم یەكـتر بینینـە زانسـتیە هەفتانەیـە، چەند پشـێوی و مقـۆ مقۆیەك بـوو كـە لەپڕێكـدا وەك كارێكـی شۆڕشـگێڕی جـددی و دوور لـە عـادەت زەق كرایـەوە، پاشـان زۆری نەخایانـد ئـەم پشـێوی و مقـۆ مقۆیـە وشـك بـوو توایـەوە، بـووە هـۆكاری توانـەوەی ئـەو جەمعـە موبـارەك و بەسـوودەش كـە باسـم كـرد.

یەكـەم هەڵـس و كـەوت لـەو هەڵـس و كەوتـە بـێ سـەرو بـەرو غەوغایـە، كۆمەڵێـك ئاهەنـگ و كۆبوونـەوەی پـڕ لە پشـێوی و هات و هـاوار بـوو لـە مزگـەوتـی (مرابیـت) بەسـترا، دیـار نیـە كـێ ڕێكـی خسـت و كـێ بانگەشـەی بـۆ كـرد، پاشـان چەنـد چاوپێكەوتنێكـی پـڕ لـە هـات و هـاوارو غەوغـای دیكـەی بـەدوای خۆیـدا هێنـا لـە مزگـەوتـی ئەمـەوی، خەڵكانێكـی عـەوام و سـادەو سـاویلكە لـە گەنجـان بەپاڵنـەری فیتنـە بـازی و وروژاندنیـان بانـگ كرابـوون و بانگەشـیان بـۆ دەكـرد، بـێ ئـەوەی هیـچ یەكێـك لـەو دەسـتانە دیاربـن كـە كارەكـە هەڵدەسـوڕێنن، یاخـود ئـەو فیكـرەی كـە كارەكـەی ڕێـك خسـتووە.

هەمدیسـان دەیڵێـم: ئێـرە جێـی ئـەوە نییـە باسـی ئـەوە بكـەم كـە ئـەو میهرەجـان و خیتابـە شۆڕشـگێڕیە لـە (ڕیبـات) چـی بـەدوای خۆیـدا هێنـا، نایەمـە نێـو باسـی ئـەوەی كـە ئـەم هەڵـس و كەوتـە عاتفیـەی مزگـەوتـی ئەمـەوی چ بـەرو بومێكـی هەبـوو، بـەڵام مەبەسـتی مـن ئەوەیـە سـەرنجی خوێنـەر ڕابكێشـم كـە ئـەم پشـێوی و ئاژاوەیـە بـووە هـۆی نەمانـی ئـەو چاوپێكەوتنـە زانسـتیە هەفتانـە .

پڕ لە سوودو قازانجەی کە باسم کرد، هەروەك چۆن چەندین چالاکی و ماندوبونی تر نەمان و بوونە قوربانی ئەم جۆرە کارانە، بووە هۆی هەڵخەڵەتاندنی هەندێ لە زانایانیش کە لە سەردەمی ئەو ڕاپەڕینە تاڵەدا بوون و تێوەگلان، بێ ئەوەی هیچ سوودێکی هەبێ.

کەواتە: بەهۆی ئەو بارودۆخەی لەسەرەوە باسمان کرد ئەو جەمعە جوان و پڕ لە سوودە کۆتایی پێهات، ئەو جوهدو ماندوبوونەی بۆ ڕێکخستنی کارەکە کرابوو زایە بوو، وانە زانستیەکان کە بریتی بوون لە دیراسە کردنی کتێبی (المجموع)ی ئیمام نەوەوی دوای ماوەیەك بەردەوامی و نەش و نما کردن پچڕان، دکتۆر ئەمین ئەلمصری کە یەکێك بوو لە جەمسەرەکانی دەرسەکە بێ بوونی هیچ کارێکی تایبەت، یاخود هیچ پێویستیەك، دوای پرس و ڕا وەرگرتنێکی ڕواڵەتی و شکڵی بە ئەندامانی دەرسەکە، چووە وڵاتی سعودیا، وەك باسم کرد ڕاوێژ کردنەکە زیاتر لەوە نزیك بوو ئاگادار کردنەوەی برادەرکانی بێ بەوەی کە سەفەر دەکات، نەك ڕاو بۆچوون و ڕاوێژ پێ کردنیان.

باوکم یەکێ بوو لەوانەی کە ڕازی نەبوو بەو سەفەرەی شێخ ئەمین ئەلمصری، ئامۆژگاری کرد شوێنی نیشتەجێبوونەکەی کە وڵاتی شامە نەگۆڕێ، نەك هەر ئەوە بەڵکو شارەکەش کە دیمەشقە نەگۆڕێ بە وڵات و شارێکی تر، بەڵام هەروەك گوتم ئەو پرسی بۆ ئەوە پێ نەکردبوون تا بەگوێیان بکات، بەڵکو

تەنیا بۆ ئەوە باسی كردبوو كە ئاگاداریان بكاتەوە لەوەی دەیەوێ بڕوات بۆ سعودیە، دواتر زانیم ڕەحمەتی خوای لێبێ پەشیمان بۆتەوە لەو گەشتەی، خۆزگەی خواستبوو ئەو گەشتەی نەكردبایە، هەروەك خۆزگەی ئەوەی خواستبوو كە نەدەبوو لە هەندێ لەو پشێوی و غەوغا بێ سەرو بەرو بێ بناغانەی كە ڕوویاندا تێوەگڵابووایە، وەك دواتریش ئەو ڕاپەڕین و مقۆمقۆیە هیچ كاریگەریەكی ئەرێنی لێ نەكەوتەوە.

ڕاستە ئەو كۆبوونەوەو یەكتر بینینە نەما، بەڵام دێمەوە سەر ئەوەی پەیوەندی باوكم بە ئاهەنگ و چاوپێكەوتن و چالاكییە ئاینیەكانی دیكە هەر بەردەوام بوو، لەگەڵ كۆمەڵێك لە زانایانی تر لە بۆنە جیا جیاكاندا دەردەكەوت، بێ ئەوەی لەو كارانەدا هەماهەنگیەكی دیاری كراو هەبێ بۆ ڕاپەڕاندنیان.

**هەڵوێستی باوكم لە میحنەتەكەی شێخ حەسەن حەبەنكە:**

هیچ كەسێك نیە لەناو ئێمە هەواڵی ئەو میحنەتە نەزانێ كە تووشی شێخ و مامۆستامان حەسەن حەبنەكە بوو ڕەحمەتی خوای لێبێ، كەسێك نیە ئاگای لە پێشەكی ئەو میحنەتەو هۆكارە بەئەنقەست دروستكراوەكانی ئەو میحنەتە نەبووبێ.

بەهەرحاڵ ئەوە گرنگ نیە ڕووداوو هۆكارەكانی ئەو میحنەتە سەرژمێر بكەم لەم كتێبەدا، چونكە ئێمە لەباسی نووسینی بابەتێكی لەو شێوەیە نین، ئەوەی تایبەت بێ بە بابەتەكانی ئەو كتێبە لە سۆنگەی ئەو ڕووداوەوە كە گرنگە باسی بكەین

بريتييــە لــە ئەنــدازەی كاريگەريەكانــی ئــەو ميحنەتــە لەســەر باوكــم ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ، هەروەهــا ئــەو دەستپێشــخەريەی كــە نوانــدی لــە هەڵوێســت وەرگرتنــی لەبــارەی ئــەو ميحنەتــەوە.

ئــەوەی لەيــادم مابــێ هەواڵەكــەی بــۆ هــات لــەو كاتــەدا لــە شــوێنی نوێــژ كردنەكــەی خــۆی بــوو لــە مزگــەوت، خەريكــی خوێندنــەوەی وێـردو زيكرەكانــی بــوو لەنێــوان مەغريــب و عيشــا[1] يەكــەم تەئســيرات و كاريگــەری هەواڵەكــەش لەســەر باوكــم ئەوەبــوو لــە ڕكعاتــی ئاخيــری نوێــژی عيشــا دوعــای قنوتــی خوێند، قونوتێكــی تايبــەت كــە دوعــا كــردن بــوو بــۆ شــێخ و پەنــا بــردن و پاڕانــەوە لــە خــوا كــە لاچوونــی ئــەو ناخۆشــی و زەحمەتيــەی ســەر شــێخ بەمســوڵمانان ببەخشــێ، بێگومــان ئــەو قنوتــە نوێــژ خوێنانــی تووشــی شــۆك كــرد بــەوەی كــە تــا كاتــی دوعاكــە نەيانزانيبــوو شــتێكی وا ڕوويــداوە.

دوای نوێژەكــە بەپەلــە گەڕايــەوە ماڵــەوە، دەســتنوێژی نــوێ كــردەوەو پۆشــاكەكانی گــۆڕی، گۆچانەكــەی گرتــە دەســت، بەماڵــەوەی گــوت: دەچــێ بــۆ ماڵــی شــێخ حەســەن بــۆ چارەســەر كردنــی ئــەو كێشــەيە ناشــزانێ كــەی دەگەڕێتــەوە.

دوای ئــەوەی گەيشــتە ماڵەكەيــان وردەكاری هەواڵەكەيــان بــۆ بــاس كــرد، پاشــان لەگــەڵ هەريەكــە لــە نزيكانــی شــێخ حەبەنكــەو

---

(١) عادەتــی باوكــم وابــوو دوای نوێــژی مەغريــب شــوێنی نوێــژ كردنەكــەی خــۆی جــێ نەدەهێشــت تاوەكــو نوێــژی عيشــا لــەو نێوانەشــدا ئەگــەر زۆر پێويســتی نەكردايــە قســەی لەگــەڵ كــەس نەدەكــرد.

خـــاوو خێزانەكـــەی بابەتەكەيـــان تـــاوو تـــوێ كـــرد، بڕياريانـــدا بەنـاوی باوكمـەوە بـەدوای بژاردەيـەك لـە ئەهلـی عیلـم و پیـاو ماقـوڵان بنێـرن، بـۆ ئـەوەی بێـن بـۆ ماڵـی شـێخ حەبەنكـە بـۆ تاوتـوێ كردنـی كارەكـە، لـەو پێنـاوەدا هەوڵەكـە بەتـەواوی درا، بـەڵام هیـچ كەسـێك بـەدەم داواكاريەكـە نەهـات.

بەدرێژايـی شـەوەكە باوكـم ماڵـی شـێخ حەسـەن حەبنكـەی جێ نەهێشـت، تـا بەيانیـش چـاوی نەچـووە خـەو، درێژيـی شـەوەكەی بـە تـاوو تـوێ كردنـی بابەتەكـەو پەرسـتش و هانـا بـردن بۆخـواو نوێـژ كـردن بـردە سـەر.

بـۆ بەيانـی ڕاو بۆچوونـی باوكـم ئەوەبـوو خـۆی بچێتـە ماڵـی هەريەكێـك لـەو زانـا بەڕێزانـە بـۆ تـاوو تـوێ كردنـی مەسـەلەكە، بـەڵام بەهەمـان شـێوە ئـەم هەوڵـەی دووەميـش سـەری نەگـرت، نەبـۆ باوكـم و نـە بـۆ هیـچ يەكێـك لەوانـەی لەگەڵـی بـوون نەڕەخسـا بچنـە ئـەو ماڵانـەی دەيانـەوێ، ياخـود هیـچ يەكێـك لـەو كەسـانە ببینـن كـە بڕيـار وابـوو ببينـن، نيـوەڕۆی ڕۆژی دووەم باوكـم بەلاشـەيەكی مانـدوو ئەعصابێكـی تێـك شـكاوو دەرونێكـی كەنـار گرتـوو گەڕايـەوە ماڵـەوە.

دوای ئـەوە كارەكـە بـەو شـێوەيە ڕێچكـەی خـۆی وەرگـرت كـە بـۆی نـووسرا بـوو، حەواڵـەی لوتفـی خوايـەك كـرا كـە باشـترين پارێـزەرەو هـەر خـۆی بەبەزەيیترينـی بەبەزەييانـە، بـێ ئـەوەی شـتێك بـە خەياڵـی ئەوانـەدا بێـت كـە بـێ عـوزر بـێ هەڵوێسـت بـوون لـەو واجبـەی كـە خـوای بەبەزەيـی خسـتوويەتييە سـەر بەندە

مسولْمانەکانی، بێ ئەوەی بەخەیاڵیاندا بێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مسولْمان برای مسولْمانە ستەمی لێ ناکات و تەسلیمیشی ناکات}.

باوکم بە کۆمەڵێك هەوڵی سەرنەکەوتوو تاقەت پرووکێن گەڕایەوە ماڵەوە، وەك خۆی دەیگوت بە قورساییەك گەڕایەوە ماڵەوە پەندو وانەکانی تەواو نابێ، لەهەموو بۆنەیەکدا بابەتەکەی دەگێڕایەوەو بیری لێ دەکردەوە، لەوانەشە هەر ئەمە یەکەم هۆکاری گەڕانەوەی باوکم بێ بۆ دووبارە کەنار گرتویی و دووره پەرێزیی، هەر لەسەر ئەو دووره پەرێزیەی خۆشی مایەوە تا وەفاتی کرد.

## ڕەچاو كردنی وەحدەتی مسوڵمانان واجبێكی پیرۆزە

ئەمە ئەو عەقیدەیە بوو لەلای باوكم كە زۆر بەتوندی و بەهێزەوە بەرگری لێ دەكرد، گوێی بەخۆی نەدەدا تاخۆ لەسەر ئەو عەقیدەیە چی بەسەردێ و چۆنی بەسەردێ، ئەم عەقیدەیەی ئەویش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو كە وەحدەتی مسوڵمانان یەكەمین بەرو بوومی ئیسلامەتی و مسوڵمانێتیە لە دونیادا، لە گرنگترین ئەو نیعمەتانەشە كە خوای پەورەردگار منەتی پێ لەسەر بەندەكانی خۆی دەكات، هەروەها بە ئەندازەیەك ئامۆژگاری بەندەكانیی كردووە پارێزگاری لەو وەحدەتە بكەن لەهیچ شتێكی دیكەدا بەو ئەندازەیە جەختی لەسەر نەكردۆتەوە.

جەختی لەسەر ئەوە دەكردەوە كە ڕەچاو كردن و چاودێری كردنی وەحدەتی مسوڵمانان تەواو نابێ مەگەر بە گەشەپێدانی هەست و شعوری برایەتیی ئیسلامیی لەنێوانیان، ئەو چارەسەریەش كە وەحدەتی مسوڵمانانی پێ دێتە دی بریتییە لە جێبەجێ كردنی ئەو فەرمایشتەی خوای پەروەردگار كە دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ﴿١٠﴾ ﴾[1]

---

(١) لە ڕاستیدا هەر ئیماندارانن برای یەكن، كەواتە هەر كاتێك لەنێوان دوو

الحجرات، لەزۆربەی دەرسەكانیدا ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوای ﷺ دەهێنایەوە كە فەرموویەتی: {مسولمان برای مسولمانە ستەمی لێ ناكات و تەسلیمی ناكات، هەركەسێ پێداویستیەكانی براكەی جێبەجێ بكات، خواش پێویستیەكانی بۆ جێبەجێ دەكا، هەركەسێك زەحمەتیەك لەسەر مسولمان لاببا، خوای پەروەردگاریش زەحمەتیەك لە زەحمەتیەكانی ڕۆژی دوایی لەسەر لادەبا، هەر كەسێك عەیب و عاری مسولمانێك داپۆشێ، خوای پەروەردگار لەڕۆژی قیامەتدا عەیبەكانی دادەپۆشێ}، ئەو فەرموودەیەش كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {هەموو شتێكی مسولمان لەسەر مسولمان حەرامە، ناموسی، ماڵی، خوێنی، تەقوا لێرەیە، (ئاماژەی بۆ سنگی موبارەكی كرد)، ئەوەندە بەسسە بۆ مسولمان تووشی گوناح و تاوان بێت كە براكەی بشكێنێتەوە}، هەر كاتێك بەلای ئەو فەرموودانەو هاووێنەكانیدا بچووبایە زۆر دەچووە نێو باسەكەو، درێژەی پێ دەدا.

هەموو جارێك لەباسی ئەو فەرموودانەدا باسی داخ و حەسرەتی خۆی دەكرد بەهۆی نامۆبوون و كاڵ بوونیان لەنێو مسولمانان و دوور بونیان لە پابەند بوون بەماناو مەبەستەكانی ئەو فەرموودانە.

بەردەوام خاوو خێزان و منداڵ و نەوەكانی خۆی لەسەر ئەوە پەروەردە دەكرد كە پارێزگاری لە برایەتی ئیسلامیی

---

براتاندا ناكۆكی پەیدا بوو، ئێوە نێوانیان چاك بكەن و ئاشتیان بكەنەوە.

بکـەن و بەجوانتریـن شـێوە پارێـزگاری لـە ئامۆژگاریەکانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بکـەن لـەو بـارەوە، بەبۆچوونـی ئـەو باشـترین ڕێـگا بـۆ جێبەجـێ کردنـی ئـەو ئامۆژگاریانـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەبـارەی پارێـزگاری کـردن لـە برایەتیـی ئیسـلامیی بریتیـن لـەم خاڵانـەی خـوارەوە:

١)- ڕوو کردنە کاری بانگەوازی ئیسلامیی و، ڕێ ڕۆشنکردنەوەی خەڵکی بەرەو هەق، لەچوار چێوەی برایەتییەکی گشتی، بەرامبەر هەموو چین و توێژەکان و لەسەر هەموو ئاستەکان، نەك لەسەر ئاستی دابەشکاری ئەو بازنە بانگخوازیە بۆ چەند کۆمەڵ و دەستەو تاقمێکی ئیسلامیی جیا جیا.

٢)- دوور خستنەوەی هەست و شعوری تاقم تاقمێنەو قەومچێتی لەو برایەتییە گشتییە، بۆ ئەوەی نەبێتە مایەی پیس بوون و لێڵ کردنی نێوان خۆیان و هەروەها نەبێتە هۆی تەسك کردنەوەی ڕێگاکەیان.

پێویسـتە بـەدورو درێژتـر باسـی هەڵوێسـتەکانی باوکـم بکـەم بەرامبـەر ئـەو دوو نەخۆشـیە کوشـندەیەی سـەرەوە کـە دەبنـە مایـەی مەترسـیەکی گـەورە لەسـەر ئـەو برایەتییـە ئیسـلامییەی کـە کتێبـی خـوای پـەروەردگار جەختـی لەسـەر کردۆتەوەو ئامـۆژگاری مسـوڵمانانی کـردووە بـەوەی دەسـتی پێوە بگـرن و چاویان لەسـەری بـێ و گرنگـی پـێ بـدەن، کـەم و کـوڕی و کەلێنـی لـێ درووسـت نەکـەن.

**یەکەم: هەڵوێستی بەرانبەر ئەو ڕێگایانەی کە برایەتی ئیسلامیی تەسك دەکەنەوەو دەیگۆڕن بۆ چەند کۆمەڵێکی ئیسلامیی جیا جیا:**

باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ بۆچوونی وابوو هەر چالاکییەکی ئیسلامیی ئامانجی بریتی بێ لە هەڵبژاردن و بەپێشخستنی دەستەیەك لە مسوڵمانان لەنێو بازنە فراوانەکەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ناوە: (کۆمەڵی مسوڵمانان)، هەروەها پەیوەندیی لەگەڵ ئەو دەستە جیاکراوەیە توندو تۆڵتر بکات لەباقی مسوڵمانانی تر، وە بایەخ و گرنگی بە پەیوەندی نێوان ئەندامانی ئەو دەستەیەی خۆی بدات لەسەر حیسابی ئەو برایەتییە ئیسلامییەی کە خوای پەروەردگار جەختی لەسەر کردۆتەوەو فەرمانی پێ کردووە چاودێری بکرێ، ئەوا پاڵنەری هەقیقی کارەکە بریتییە لە خۆبەباشتر زانین و خۆ بەپێش خستن و خۆویستیی، جیاوازیەکەی تەنها ئەوەیە ئەنانیەت و خۆویستیەکە لەسەر ئاستی کۆمەڵ و گروپە، نەك تاکە کەس.

بۆچوونی وابوو ئەو دوو دروشمەی کە زۆرترین کۆمەڵ و گروپە ئیسلامییەکان بەرزیان کردۆتەوە باشترین شاهێدە لەسەر ئەو قسانەی سەرەوە، دروشمی یەکەمیان ئەوەیە کە دەڵێن: (هەر کەسێك لەگەڵ ئێمە نەبێ کەواتە لەدژمانە)، دروشمی دووەمیشیان دەڵێن: (هەر کەسێك لە ئێمە نەبێ ئەوا مسوڵمانێکی پلە دووە).

بیستبووی دیارترینی ئەو کۆمەڵ و گروپانە کار لەسەر ئەوە دەکەن گەنجان و بگرە منداڵانیش بەچاوی کەم و کوڕیەوە بڕواننە

خێزانەکانیــان، هەروەهــا زۆر لــە پێگــەی واجــب بوونــی گوێڕایەڵــی دایــکان و بــاوکان دەهێننــەوە خــوارەوە، بــۆ ئــەوەی بەئاســانی بتوانــن وا لــەو گەنــج و منداڵانــە بکــەن بــەدزی دایــکان و باوکانیــان کار لەگــەڵ ئــەو گروپانــە بکــەن، وایــان لێبــێ لــە ئامــۆژگاری دایــکان و باوکانیــان هەڵگەڕێنــەوە، زۆر لــەوەش دەترســا ئــەو کارە دزە بکاتــە نێــو ماڵەکــەی خۆشــی، دەترســا لــەوەی کوڕەکــەی یاخــود یەکێــك لــە نەوەکانــی بەهــۆی کاری ئــەم گــرووپ و تاقمانــەوە وایــان لێبــێ ســەرپێچی و یاخــی بــبن لــە بازنــەی بڕیارەکانــی ئــەوو، لــەو ڕێبــازو مەنهەجــە لابــدەن کــە ئــەم ئەوانــی لەســەر پــەروەردە کــردووە، ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ لەهەمــوو بۆنەکانــدا ئامــۆژگاری منــی دەکــرد بــەوەی لەگــەڵ کۆمەڵــی گشــتی مســوڵمانان بــم، ئــەو لایەنگیرییــە کــە خــوا فەرمانــی پــێ کــردووە بەهیــچ لایەنگیرییەکــی تەســکی دیکــە نەگۆڕمــەوە، دوای ئــەوەی لەمــن دڵنیــا بــوو کــە ئامۆژگاریەکانــی بەهەنــد وەردەگــرم، ئنجــا فەرمانــی پێکــردم چاودێــری ســێ کوڕەکــەی خــۆم بکــەم، بەدواداچوونیــان بــۆ بکــەم و کاغــەزو نووســینەکانیان و شــوێنی هەڵگرتنــی کتێــب و کــەل و پەلەکانیــان تەماشــا بکــەم، لەترســی ئــەوەی نــەوەك یەکێکیــان کاریگــەری دەســەڵاتی یەکــێ لەو گرووپانــەی لەســەر بــێ و پشــتیوان و لایەنگیریان بێــت و هاریکاریان بــکات بەنهێنــی و لــە ئێمــەی بشــارێتەوە، لــە کۆتاییشــدا لــە خێــزان و دایــك و باوکــی هەڵگەڕێتــەوە.

منیــش ئــەو کارەی ئــەو پێــی ڕاســپاردبووم ئەنجامــم دا، پێدەچــێ ئەمــە گرنگترینــی هۆکارەکانــی پاراســتنی مــن و منداڵەکانــم بــێ لەلایــەن خــوای پــەروەرگارەوە لەشــوێن کەوتنــی ئــەو ڕێچکــەو ڕێگا

خوارو خێچانەی ئینسان دوور دەخەنەوە لەوەی خۆشەویستی و پشتیوانی بۆ هەموو مسوڵمانان هەبێ، ئەوەی کە شك و گومانی تێدا نییە ئەوەیە ئەو پاراستنە خواییەی بە ئێمەی بەخشی بەهۆی ئەو پەروەردە جددی و بەردەوامەی باوکم بوو بۆ ئێمە، ئەو پەروەردەیەی باوکم دڵی ئێمەی کردەوە بۆ خۆشویستنی هەموو مسوڵمانان بەبێ ڕەچاو کردنی جیاوازیی دەستەو تاقم و مەشرەبەکانیان، لەبەر ئەوەی دوور کەوتنەوەو خۆ پاراستن لە پشتیوانی کردن و لایەنگیری کردن بۆ یەك کۆمەڵ و تاقمی دیاری کراو، گرەنتی ئەوە بە مسوڵمان دەدا پەیوەندیی لەگەڵ هەموو چین و تاقم و کۆمەڵەکانی دیکە باش و ڕێك و پێك بێت.

لەو بارەوە ئەزموونی زۆرم لە ژیانی باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ کۆ کردۆتەوە، ئەو ئەزموونانە هەموویان بوونە هۆی ئەوەی متمانەو یەقینم زیاتر بێ بەو مەترسیەی کە باوکم هەموو جارێك ئێمەی لێ ئاگادار دەکردەوە، زۆر جاریش وەك بەڵگەیەك لەسەر قسەکانی باسی ئەو ئەزموونانەی خۆی بۆ دەکردین لەسەر ئەو مەسەلەیە، وای لێ دەکردین دڵنیابین لەسەر ئەوەی ئامۆژگاریەکانی لەو بارەوە هەق و ڕاستن، وە نزیکترن لە پابەند بوون بەو ڕێگایەی کە خوای پەروەردگارو شەریعەتەکەی دەیانەوێ.

یەکێ لەو ئەزموونانەی کە لەزۆر بۆنەدا باسی دەکرد: ڕۆژێك دوای ئەنجامدانی نوێژی هەینی گەنجێکی کەم تەمەن لەڕێگاداو

لـەدەرەوەی مزگـەوت دەیوەسـتێنێ، ئـەو كات باوكـم وتـار بێـژ بـوو، دەسـت دەكات بـە گفتوگـۆو موجادەلـە لەگـەڵ باوكـم، لەسـەر بەشـێك لـەو قسـانەی كـە كردبوونـی لەنێـو وتارەكـەدا، پاشـان بـە باوكـم دەڵـێ: ئایـا تـۆ لـەوەی باسـت كـرد بەرهەڵسـتی فـلان كـەس و فـلان كەسـت نەكـرد؟

باوكـم گوتـی: منیـش پێـم گـوت: {كاتـێ منالێكـی وەك تـۆ لەسـەر ئـەوە پـەروەردە دەكـرێ كـە شـێخێكی وەك مـن لەسـەر رێـگا رابگـرێ بـۆ ئـەوەی تەحقیـق و موجادەلـەی لەگـەڵ بـكات وەك ئـەوەی تـۆ كـردت مسـوڵمانان حاڵیـان بـەو حاڵـە دەگات كـە ئێسـتا تووشـی بوونـە، وەك ئـەوەی ئێسـتایان لـێ دێ كـە چـۆن دوور كەوتوونەتـەوەو بچـووك بوونەتـەوە}.

هەروەهـا بـۆی گێڕاینـەوە جارێكیـان گەنجێـك كـە لـە كێڵگـەی یەكـێ لـە گەورەتریـن پارتـە ئیسـلامییەكان كاری دەكـرد دێتـە لای، بـە لووتبـەرزی و ڕەخنـە گرتنێكـی نەزانانـە پێـی دەڵـێ: یـا شـێخ هەتـا كـەی دەتانـەوێ خەڵـك بـۆ نوێـژ كـردن و جێبەجـێ كردنـی عیبادەتـەكان بانـگ بكـەن؟

باوكیشـم پێـی دەڵـێ: {هەتـا دەبینیـن خەڵـك هەمـووی جێگیـر بوونـە لەسـەر ئـەو رێگایـە}، پاشـان بـە گەنجەكـە دەڵـێ: {ئـەو عیبادەتـەی تـۆ ئـاوا بەسـووكی قسـەی لەبـارەوە دەكەیـت و ڕەخنـەی پـێ لـە ئێمـە دەگـری گوایـە بۆچـی خەڵكـی بـۆ بانـگ دەكەیـن، هـۆكاری بـەرز كردنـەوەی هەمـوو خێـرو چاكەیەكـە، تاكـە كلیلـی چارەسـەری هەمـوو كێشـەكانە، ئەمـە ئـەو ئەركەیـە كـە خـوای

پـەروەردگار ئێمـەی تێـدا كرۆدتـە بەرپرسـیارو ئێمـەی لەپێنـاودا دروسـت كـردووە، بەبەردەوامـی هەڵدەسـتین بـە جێبەجـێ كردنـی و بەبیـری خەڵكیشـی دەهێنینـەوە، تـا ئـەو كاتـەی مردنمـان دەگاتـێ].

ئـەو كەسـە دەتوانـێ لـە ناڕەحەتیەكانـی باوكـم بـگات لەبـارەی ئەو رەخنـە بـێ ناوەڕۆكانـە كـە ئـاگای لـەوە هەبێ باوكـم چەندە پەیوەسـت بـوو بـە زۆر ئەنجامدانـی پەرسـتش و خـۆ یـەكلا كردنـەوە بـۆ خـواو بیـر هێنانـەوەی خەڵكـی بـەوەی كـە لـەو ڕێگایـەوە ڕوو بكەنە خـوا، بە رادەیـەك لـەو بـارەوە لەپلـەی یەكـەم بـووە لەنێـو زانایانـی دیمەشـق، ئامـۆژگاری خەڵكـی دەكـرد لـەدەرگای خـوا پەرسـتی و عیبادەتـەوە چارەسـەری كێشـەكانیان بكـەن، پاشـان ئـەو دەیزانـی ئـەو رەخنانـە رەخنـەی تاكـە كەسـی نیـن و لـە بۆچوونـی هەڵـەی كەسـێكەوە سـەرچاوەی نەگرتـووە، بەڵكـو بـاوەڕی تـەواوی بـەوە هەبـوو ئـەو رەخنانـە تەعبیـر كردنـە لـە گۆشـە نیـگای ڕێـگاو ڕێبـازی كۆمەڵێـك.

**دووەم: جەخت كردن لەسەر دوور خستنەوەی دەسەڵاتی نەتەوەیی و قەومچێتی لەو برایەتییە ئیسلامییە پیرۆزو گشتگیرە:**

وەك دیـارە باوكـم كـورد بـوو، زمانـی كـوردی زمانـی دایـك بـوو بـۆ ئـەو، ئاسـەواری عەجەمیـی بـوون هـەر مابـۆوە لەسـەر زمانـی لەكاتـی قسـە كـردن بەعەرەبـی، بـەڵام وریایـی دەدا لەبـارەی ئـەوەوە كـە نابـێ لایەنگیـری بـۆ گـەل و نەتـەوەی خـۆت ببێتـە سـەرچاوەی ڕەچـاو كردنـی پەیوەندییـە نەتەوەییـەكان، كارێكـی لـەم شـێوەیە پەیوەسـت بـوون بـە بازنـەی برایەتیـی ئیسـلامیی بێهێـز دەكات، یاخـود پاكیـی ئـەو لایەنگیرییـە گشـتگیرە لێـڵ و شـێلوو دەكات،

بەبۆچوونـی باوكـم بەدرێژایـی هەمـوو چاخـەكان برایەتـی ئیسـلامیی یەكەمیـن قەڵغـان بـووە بـۆ بوونـی ئیسـلام، مەترسـیدارترین ئافـەت و نەخۆشـی چـاوەڕوان كـراو ئەوەیـە ئـەو قەومچێتییـە سـەر دەربێنـێ و گەشـە بـكات، دواتـر شـوێنی ئـەو برایەتییـە ئیسـلامییە گشـتگیرە بگرێتـەوە، ئنجـا مسـوڵمانان سـەیری خۆیـان بكـەن و ببینـن لەبـری ئـەو قەڵغانـە بەهێـزەی برایەتـی ئیسـلامیی قەڵغانـی بێهێـزو پـڕ لـە كـەم و كـوڕی قەومچێتـی شـوێنی گرتۆتـەوە.

بـە بـڕوای ئـەو، تاكـە ڕێـگا بـۆ مانـەوەی ئـەو قەڵغانـە پیـرۆزەی برایەتـی ئیسـلامیی، ئەوەیـە مسـوڵمان ئەركـی خـۆی بـە شـێوەیەكی جـددی جێبەجـێ بـكات، ڕەچـاوی لایەنگیـری بـۆ گـەل و میللەتەكـەی خۆشـی بـكات، هەروەهـا پارێـزگاری لـە زمانەكەشـی بـكات كـە خـوا ئەمـی پـێ جیـا كردۆتـەوە، بـەڵام لەچوارچێـوەی بازنـەی فراوانـی برایەتـی ئیسـلامیی، بەجۆرێـك ملكـەچ بـێ بـۆ بەرژەوەندیەكانـی ئـەو برایەتییـەو بـەدوای پێویسـتیەكانی ئـەو برایەتیـەدا بـڕوا.

مـاوە مـاوە هەنـدێ لـە كـوردە قەومییـەكان دەهاتنـە لای، هەنـدێ جـار موناقەشـەی نێـوان ئـەوان و باوكـم زۆر تونـد دەبـوو، لەسـەر ئـەو بابەتـە، بـێ ئـەوەی ئـەو موناقەشـەو گفتوگـۆ تونـدە بیانگەیەنێتـە سـازانێك.

ڕۆژێكیـان دكتۆرێكـی كـوردی بەناوبانـگ بـە باوكمـی گـوت: ئەوانـەی تـا ئێسـتا بوونەتـە هـۆكاری بێبـەش بوونـی كورد لـە هەلی سـەركەوتنی قەزیـەی كـوردی ئێـوەی پیاوانـی ئاینـی كـوردن!..

باوكیشم پێی گوت: چۆن؟ ئێمە چیمان كردووه؟

گوتـی: ئێـوه دینتـان وا لێکـردووه ببێتـه بابه‌تـی یه‌كه‌مـی ژیانـی میلله‌تـی كوردمـان، ئه‌مـه‌ش وای كـردووه كـورده‌كان بخاتـه نێـو خزمـه‌ت كردنـی عـه‌ره‌ب له‌پێنـاوی ئایـن، وای لێکـردوون توانـا قه‌ومییه‌كانـی خۆیـان واز لـێ بهێنـن و بێبه‌شـی كـردوون لـه مافـه سرووشـتی و ئینسـانیه‌كانیان.

باوكم گوتی: باشه پێویسته ئێمه چی بكه‌ین؟.

گوتـی: پێویسـته هاریـكاری ئێمه بكه‌ن لـه هه‌وڵه سیاسـیه‌كانمان، ئـه‌و كه‌سـایه‌تی و شـه‌عبیه‌ته به‌هێـزه‌ی هه‌تانـه وه‌ك و زانـاو پیـاوی ئاینـی به‌گـه‌ڕی بخـه‌ن و یه‌كـی بخـه‌ن له‌گـه‌ڵ هـه‌وڵ و چالاكییـه قه‌ومییه‌كانـی ئێمـه.

بـــاوكم پێیگـــوت: باشـــه! ئێـــوه هـــاوكاری ئێمـــه بكـــه‌ن لـــه پابه‌نـد بـوون بـه فه‌رمانه‌كانـی شـه‌رع و حوكمه‌كانـی دیـن، ئێمـه‌ش هـاوكاری ئێـوه ده‌كه‌یـن لـه هه‌وڵـه سیاسـییه قه‌ومییه‌كانتـان.

دكتۆره‌كـــه وه‌ڵامـــی باوكمـــی دایـــه‌وه‌و گوتـــی: جـــارێ ئێـــوه فرسـه‌تمان بده‌نـێ، فه‌رمـان و سیسـتمه شـه‌رعیه‌كانی خۆتـان تاخیـر بكـه‌ن بـۆ دوای ده‌سـتكه‌وته قه‌ومییه‌كانمـان، بـۆ دوای درووسـت بوونـی ده‌وڵه‌تـی كـوردی، ئـه‌و كات ئێمـه‌ش ئه‌وه‌تـان بـۆ جێبه‌جـێ ده‌كه‌یـن كـه ئێـوه ده‌تانـه‌وێ.

باوكـم زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌كـی گاڵتـه ئامێـزی بـۆ قسـه‌كانی دكتـۆر كـردو پێـی گـوت: مـن لـه‌و ڕێگایـه گه‌ڕاومه‌تـه‌وه كـه تـۆ ده‌تـه‌وێ

پێمـی بناسـێنی و پێمـی بگریـە بـەر، زۆر پێشـی تـۆ ئەتاتـورك ئـەم فێـڵ و تەڵەكەیـەی بـەكار هێنـاو زۆر لەتـۆش بەتواناتـر بـوو لـە بەكارهێنانـی، دەتانـەوێ ئێمـە ببینـە پـردی گەیشـتن بـەو شـتانەی كە ئێـوە دەتانـەوێ، لـە كۆتاییشـدا نكوڵـی لـە هەموو شـتێك بكـەن، ئنجا پێـمان بڵێـن: ئێمـە هـەر ناشـتان ناسـین و هەرگیـز كارمـان بـە ئێـوە نەبـووە، گفتوگـۆو موناقەشـەكەی نێوانیـان لـەم سـنوورەدا وەسـتا.

ئـەو وێنەیـەی لەبیـرو زیهنـی باوكـم بـوو بـۆ كـوردی مسـوڵمان و توركـی مسـوڵمان و عەرەبـی مسـوڵمان و فارسـی مسـوڵمان وێنـەی چەنـد گوڵێكـی ڕەنگ جیـاواز بوو كـە هەموویـان بەیەكگەیشـتبوون و لەیـەك باخچـەدا تێكـەڵ یەكـتر ببـوون، ئەویـش باخچەی ئیسـلام بـوو، برایەتـی ئیسـلامیی وێنـای كردبـوون و ڕۆڵـی هەریەكێكیـان ئـەو وەحدەتـە ئیسـلامییەی لـێ بەرهـەم هاتبـوو كـە هـۆكاری دروسـتبوونی شـوێنەوارێكی ئینسـانیی خۆشـیهێن بـوو بـۆ هەمـوو جـۆرە جیاجیاكانـی ئـەم گوڵانـەی نێـو باخچەكـە.

پوختـەی قسـەكان لـەو بـارەوە ئەوەیـە باوكـم ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ بۆچوونـی وابـوو: كاركـردن لەسـەر پاراسـتنی وەحدەتـی ئوممەتـی ئیسـلامیی واجبێكـی ئیسـلامیی گەورەیـەو لەگەردنـی هەمـوو مسـوڵمانێكە، جـا ئـەو مسـوڵمانە لەهـەر قـەوم و میللەتێـك بێـت، بەسـتانەوەو تونـدو تـۆڵ كردنـی ئـەم وەحدەتـەش لـەوەدا خـۆی دەبینێتـەوە ڕەچـاوی ئـەو برایەتییـە ئیسـلامییە بكـرێ كـە پێویسـتە هەمـوو چیـن و توێژەكانـی مسـوڵمانانی تێدابـن، بەگوێـرەی جیاوازیـی ئاسـتی پابەنـد بوونیـان بـە ئیسـلام.

## بۆچونی لەبارەی پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتداران و چۆنیەتی ئامۆژگاری کردنیان

باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ لەو مەسەلەیەدا -وەك زۆرێك لە مەسەلەکانی تر- تەواو قەناعەتی بەو بۆچوونەی ئیمام غەزالی هەبوو کە لە کتێبی (ئیحیا)کەیدا هێناویەتی، پوختەی قسەکانیشی بەم شێوەیەیە: هەوڵدان بۆ گەیشتن پێیان لەپێناو بەدەست هێنانی دەستکەوتێکی دونیایی جا ئەو دەستکەوتە دونیاییە هەر جۆرێك بێت شتێکی ڕقلێگیراوو سەرزەنشت کراوە، هەرچەندە لەژێر پۆشاکی بانگەوازی بۆ لای خوا یاخود فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە بێ، بەڵام پەیوەندی پێوە کردنیان بەمەبەستی ئامۆژگاری کردنیان و خوا بەبیر هێنانەوەیان لەگەڵ بێ نیازی بەدونیاکەی ئەوان و خۆ بەرز ڕاگرتن بەرامبەر پێدانەکانیان کارێکی درووستەو موبارەکە، لەمەشدا بەڵگەی بە حاڵی زۆرێك لە زانا ڕەببانیەکان دەهێنایە لە سەردەمەکانی ئەمەوی و عەبباسی.

لەهەر بارودۆخێکدا پێشەوا، یان دەسەڵاتدار بانگی هەر یەکێك لە خەڵکی بکات بۆ دانیشتنەکەی یاخود بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵیدا، وەڵام دانەوەی واجبە لەسەر ئەو کەسەی کە بانگهێشت کراوە، پێویستە لە وەڵامدانەوەکەیدا پابەندی شێوازو ئادابی ئیسلامیی بێ.

هەروەهـا باوكـم دانـی بـەوەدا دەنـا کـە جمهـوری زانایـان لەسـەری کـۆك و موتتەفیقـن، هەروەهـا فەرمایشـتی صەحیـح دەلالەتـی لەسـەر دەكات، ئەویـش بریتیـە لـەوەی: دەرچـوون بەسـەر پێشـەوا لەهـەر بـارو دۆخێكـدا حەرامـەو درووسـت نیـە، مەگـەر ئـەو پێشـەوایە تێوەگلابێتـە نێـو کوفرێکـی ئاشـکرا، واتـە: کوفرێکـی ڕوون و حاشـا هەڵنەگـر.

هەروەهـا جەختـی لەسـەر ئـەوە دەکـردەوە کـە گونـاه و لادان، بردنـی ماڵـی خەڵـك، تێـوەگلان بـە جـەورو سـتەم، ئەمانـە هیچیـان نابنـە هەنجـەت بـۆ دەرچـوون بەسـەر ئیـمام، هەروەهـا بۆچوونـی وابـوو: دەسـەڵاتدار هەرچەنـدە فاسـیق بـێ و سـتەمی هەبـێ، سـتەم و لادانەکانـی زیاتـر نیـن لـەوەی کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەبارەیـەوە فەرموویەتـی: [دوای مـن پێشـەوایانێك دێـن ڕێگـەو ڕێبـازی مـن ناگرنـە بـەر، پیاوانێکیـان تێـدا هەڵدەکـەوێ دڵیـان دڵـی شـەیتانە لـە بەدەنـی ئینسـاندا]، ئایـا تەصـەوڕ دەکەیـت لادان و گوناهـی دەسـەڵاتدارێك لـەوە زیاتـر بـێ کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەو فەرمایشـتەدا وەسـفی کـردووە؟ لەگـەڵ ئەوەشـدا دەبینیـن پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـەم شـێوەیە وەڵامـی حوزەیفـە دەداتـەوە کاتـێ پرسـیاری لـێ دەکات ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگـەر گەیشـتینە ڕۆژێکـی وا چـی بکەیـن؟ پێـی دەفەرمـووێ: [گـوێ بگـرەو، گوێڕایـەڵ بـە بـۆ پێشـەوا، ئەگـەر لەپشتیشـی دای و ماڵەکەشـی زەوت کـردی، هـەر گـوێ بگـرەو گوێڕایـەڵ بـە][1].

---

(١) رواه مسلم في صحيحه من حديث حذيفة بن اليمان.

كاتێكيــش لــە ســووريادا لــە ئەنجامــی تێگەيشــتنی هەڵــەی هەنــدێ لــە بزووتنــەوە ئيســلامييەكان فيتنــە بەرپــا بــوو، باوكــم ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ نكوڵــی ســەرلەبەری كارەكــەی كــرد، نكوڵی لــە سەرپەرشــتيارانی ئــەو بزووتنــەوە ئيســلامييانە كــرد لەبــارەی كافــر كردنــی بەكۆمــەڵ، بــێ ڕەچــاو كردنــی زەوابــت و ئەحكامــی شــەرعی.

ئــەو كاتــەش كــە قەســابخانەكەی قوتابخانــەی مەدفەعيــە ڕوويــدا لــە حەلــەب، بەرپرســانی وەزارەتــی ڕاگەيانــدن پەيوەنديــان پێــوە كــردم، داوايــان لــێ كــردم حوكمــی شــەريعەتی ئيســلامیی لــەو بــارەوە بخەمــە ڕوو، منيــش ڕاوێــژم بــە باوكــم كــرد ســەبارەت بــەو داواكاريــەی ئــەوان، فەرمانــی پــێ كــردم وەڵاميــان بدەمــەوە، ئاڕاســتەی كــردم بــۆ ئــەو حوكمــە شــەرعيەی كــە پێويســتە بــێ حەزەر كــردن و دوودڵــی بيڵێــم، منيــش وەڵامــم دانــەوە، ڕاگەيەندراوێكــی تەلەفزيۆنــی تێــرو تەســەلم لــەو بارەوە پێشــكەش كــرد، لەبــارەی حەرام بوونــی ئــەو كارەی كــە ڕوويــداوە، ڕامگەيانــد كــە ئــەم كارە بەهيــچ شــێوەيەك ناچێتــە نێــو چوارچێوەی كوشــتنی ڕێگــە پێــدراو، وە ناچێتە نێــو چوارچێــوەی كوشــتنی هەڵگــەڕاوە (مورتــەد)، لەبــەر ئــەوەی هەڵگەڕانــەوە ڕووی نــەداوە، هيــچ بەڵگەيەكيــش نييــە هەڵگەڕابنــەوە، هەروەهــا ناچێتــە چوارچێــوەی كوشــتنی تۆڵــە ســەندنەوەش، چونكــە هيــچ يەكێــك لــە كــوژراوان بەرپرســيارێتی هيــچ تاوانێكــی كوشــتنيان لەســەر نەچەســپاوە، وە ناچێتــە چوارچێــوەی كوشــتنی ئــەو كەســەی هێرشــت بــۆ دێنــێ و ســەرو ماڵــت زەوت دەكات، چونكــە ئــەوان نــە داگيركــەرو نــە هێرشــبەر بــوون.

لەڕاسـتیدا هەمـوو ئـەو شـتانەی ئـەو کاتـە گوتـم، لەژێـر ڕۆشـنایی ئاڕاسـتە کردنـی باوکـم بـوو ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ.

بۆچوونـی باوکـم وابـوو پێویسـتە بەگوێـرەی توانـا ئامـۆژگاری دەسـەڵاتداران بکـرێ، هەروەهـا بـڕوای وابـوو ئـەم کارە لـە بەڕێزترینـی ئـەو شـتانەیە کـە خاوەنەکـەی لەخـوای پـەروەردگار نزیـك دەخاتـەوە، بەمەرجێـك پـاك و پاڵفتە بـێ لە تەماحی بەدەسـت هێنانـی دەسـتەوکەتی دونیایـی، یاخـود لـە ترسـی لەدەسـتدانی شـتێکی دونیایـی، هەروەهـا پێویسـتە ئامـۆژگاری کردنەکـە بـەو پـەڕی حیکمـەت و نـەرم و نیانـی بـێ.

جارێکیـان وەزیـری ئەوقافـی پێشـوو دکتـۆر موحەممـەد موحەممـەد خەتیـب بڕیـاری سـازدانی میهرەجانێکـی وتاربێژیـی گەورەیـدا بەبۆنـەی چوونـە نێـو سـەدەی پانـزەی کۆچیـی، پێـی ڕاگەیانـدم دەبـێ وەك وتاربێـژی میهرەجانەکـە بـەژداری بکـەم، لەبەرامبـەر سـەرۆك حافـز ئەسـەد وتـاری زانکـۆی دیمەشـق پێشـکەش بکـەم، ڕووداوەکانـی فیتنەکـەش لـەو کاتـەدا لـە لووتکـەدا بـوو.

داوای لێبوردنـم لێکـرد لەبـارەی بـەژداری کردنـم، پێـم ڕاگەیانـد ئـەم کارە لەبـەر زۆر هـۆکار بۆمـن کارێکـی قوڕسـە، دوای ئـەوەی کـە زۆر پێداگیـری کـرد منیـش کارەکـەم حەواڵـەی باوکـم کـرد، بەمەرجـم گـرت ئەگـەر ئـەو بـەڕوون و ڕاشـکاوی گوتـی ڕازیمـە ئـەو کات منیـش ڕازی دەبـم، مـن وای بـۆ دەچـووم باوکـم ڕازی نەبـێ بـەوەی مـن بچمـە نێـو بوارێکـی لـەم شـێوەیە کـە یەکەمجـارە

منی بۆ بانگ دەکرێ، دکتۆر خەتیب حەواڵەکردنەکەی منی بۆ لای باوکم قەبووڵ کرد، سەردانی باوکمی کرد پێشنیارو پڕۆژەکەی خۆی بۆ باس کرد، پێی ڕاگەیاند ئاهەنگەکە لەژێر چاودێری جەنابی سەرۆکە، ئەوەی جێگەی زۆر سەرسوڕمانی من بوو باوکم پێشوازی لە پڕۆژەکە کرد، ڕازی بوو بەوەی لەو میهرەجانەدا وشەو پەیامی زانکۆی دیمەشق لەلایەن منەوە پێشکەش بکرێ، بەڵام بەمەرجی گرت کەنابێ پابەند بکرێم بەقسەیەك کە ئەوان دەیانەوێ، لەبەرامبەردا دەست کراوەو ئازاد بم لەوەی دەمەوێ بیڵێم، جەنابی وەزیریش بەو مەرجە ڕازی بوو.

پاشان منیش لەگەڵ باوکم دانیشتم و ڕاوێژم پێکرد لەبارەی ئەوەوە کە پێویستە چی بڵێم، ئەمیش باسی ئەو پاداشتە گەورەیەی خوای پەروەردگاری بۆ کردم کە لە ئامۆژگاری کردنی دەسەڵاتداراندا هەیە، ئەگەر بێت و ئەو قسانە بەنیاز پاکییەوە بکرێن و خاڵی بن لە لادان و خوارو خێچی، ئامۆژگاری کردم و گوتی: با ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرمووێ: {هەمووتان بەرپرسیارن هەریەکێکیشتان پرسیاری لێ دەکرێ لەبارەی ئەو بەرپرسیارێتیەوە} میحوەری کۆکەرەوەی هەموو قسەکانت بێ، هەروەها ئامۆژگاری کردم بەوەی وریایی لەبارەی ئەوەوە بدەم کە هەموو چین و توێژەکانی ئوممەت ئەم بەرپرسیارێتیەیان بەردەکەوێ و پێویستە هاریکاری یەکتر بکەن لەسەر هەڵسان بە ڕاپەڕاندنی ئەو بەرپرسیارێتیە، هەروەها پێی گوتم: کە یارمەتی دانی یەکتریش

بۆ ئەم مەبەستە بەوە دێتە دی هەمووان گومانی باش بەیەکتر ببەن، ئاگاداریشی کردمەوە لەوەی مەسەلەی (بەکافردانان بەپێی کەیف و ئارەزوو) چەکی کینە لەدڵ و دوڕووانە، لە بەرامبەردا ئامۆژگاری کردن لەسەر بنچینەی هاوکاری یەکترو گومانی باش بەیەکتر بردن چەکی موجاهیدانە.

وشەو پەیامی زانکۆی دیمەشقم لەو ئاهەنگە مێژوییەدا پێشکەش کرد، خوای گەورە ویستی وابوو دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبێ، زۆربەی خەڵکەکەش لەلایەك ئاگاداری ئەوە نەبوون نهێنی ئەو دەنگدانەوە گەورەیە بریتی بوو لەو ئامۆژگاری و هەڵوێست و ئاڕاستە کردنانەی باوکم، لەلایەکی تریشەوە پابەند بوونی من بوو بەگوێرەی توانا بەو ئامۆژگاری و وەسیەتانەی ئەو.

لەیەکێ لە مانگەکانی ڕەمەزانی ناوەڕاستی هەشتاکان بانگهێشت کرام بۆ گفتوگۆیەکی تەلەفزیۆنی، ئەو کاتە جەنابی سەرۆك هەندێ لە دەستکەوتە ئیسلامییە بەسوودەکانی بەدەست هێنابوو، یەکێ لەو دەستکەوتانە بریتیی بوو لە هەڵگرتنی کۆت و بەندو چاودێری کردنی زیاد لە پێویست کە پێشتر دەگیرایە بەر بەرامبەر کتێبە ئیسلامییەکان، وە هەڵگرتنی چەند کۆت و بەندێکی تایبەت بە باڵاپۆشی لە بەڕێوەبەرایەتیەکان، هەروەها زیاتر ڕەنگ کردنی بەرنامەکانی ڕاگەیاندن (بیستراوو بینراو) بە زەوابیتی ئەخلاقی ئیسلامیی، باوکم ئاگاداری ئەو دەستکەوتانە بوو، ئامۆژگاری کردم لەو گفتوگۆ تەلەفزیۆنیەدا

ئامـاژە بەو دەستكەوتانە بكەم و سوپاسی جەنابی سەرۆكیش بكەم، پێی گوتم: بەڵكو ئەو دەستخۆشی و سوپاس كردنە ببێتە هۆی ئەوەی كاری زیاتری لەم شێوەیە بكات، پاشان ئەو ئامۆژگاریانەی بەرامبەر بەمن بەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ پشتڕاست كردەوە كە دەفەرمووێ: {سوپاسی خوای نەكردووە كەسێك سوپاسی خەڵكی نەكات}.

بانگهێشتە تەلەڤزیۆنیەكەم قەبوڵ كرد، وەك گوتم: بەرنامەكە لە مانگی ڕەمەزاندا بوو، ئەو قسانەی باوكیشم جێبەجێ كرد كە ئامۆژگاری منی پێ كردبوو، سوپاس و دەستخۆشیم لە خاوەنی ئەو دەستە شاراوەیە كرد كە لە پشتی بەدەستهێنانی ئەو دەستكەوتانە بووە، ئەمیش بریتیی بوو لە جەنابی سەرۆك[1].

---

(١) ئەمە مەنهەج و ڕێبازی باوكم بوو لەبارەی مامەڵەو پەیوەندی لەگەڵ حوكمڕانان، چۆنیەتی ئامۆژگاری كردنی ئەوان لەلایەن باوكمەوە بەم شێوەیە بوو، هەر لەسەر ئەو ڕێچكەو ڕێگایەش ئامۆژگاری دەكردم، منیش پشتیوان بەخوا هەرگیز لەو ڕێگاو ڕێبازەی ئەو لانادەم تا دەگەمەوە خزمەت خوای پەروەردگار، ئامۆژگاریان دەكەم بە خێرو چاكە، گومانی باشیشیان پێ دەبەم، هەردەستكەوتێك بەڕاستی بەدەستهاتبێ سوپاسیان دەكەم، دوور دەكەومەوەو خۆم دەپارێزم لەو دەستكەوت و قازانجە دونیاییەی كە دەكرێ لەو ڕێگەیەوە بەدەست بهێنرێ، بەردەوامیش دوعایان بۆ دەكەم بەوەی خوای پەروەردگار ئیستیقامەیان بدات لەسەر بەرچاو ڕۆشنی، تا لەژیاندا مابن، تۆی خوێنەر ڕەحمەتی خوات لێبێ لێرە بەراوردێك بكە لەنێوان ئەو جۆرە ڕێبازە كە باوكم ئێمەی لەسەر پەروەردە كرد، كە هەر كەسێك باوكمی

پاشان باوكم ئامۆژگاری دەكردم بەوەی دوعا بۆ كەسی حوكمڕان بكەم، خوای پەروەردگار هیدایەتی بدات بۆ شتێك كە خۆی پێی خۆشە، وە یارمەتی بدات بۆ شتانێك كە خێری ئیسلام و بەرژەوەندی مسوڵمانانی پێوەیە، لەم مەسەلەیەشدا چەندین هەڵوێست و گوفتاری پیاوانی پێشینی، چاكی بەبەڵگە دەهێنایەوە.

**بانگەوازی كردن بۆ لای خواو، گرنگی دان بە گوناهباران و بەزەیی هاتنەوە پێیان:**

ڕەحمەتی خوای لێبێ بەردەوام و بێ پسانەوە بەدڵسۆزیەوە خەڵكی بانگ دەكرد بۆ لای خوا، بەفەرمان كردن بە چاكەو ڕێگری كردن لە خراپە، هەر كاتێك هەلێكی بۆ بڕەخسایە درێخی نەدەكرد، ئەوە كاری باوكم بوو لەو دانیشتنانەدا كە بانگهێشت دەكرا بۆی، لەو دانیشتنانەشدا كە خەڵكی دەوریان دەدا، نەك هەر ئەوە بەڵكو لە ڕێگەشداو لەكاتی ڕۆیشتنیشدا ئەگەر هەلی بۆ بڕەخسایەو پێویستی بكردایە درێخی نەدەكرد لە بانگەوازی كردن و فەرمان كردن بە چاكەو ڕێگری كردن لە خراپە.

---

ناسیبێ گومانی نەبووە لە خۆیەكلا كردنەوەو ئیخلاص و پاكی پەنهان و نیەت و مەبەستی، وە خۆ پاراستنی لە دونیاو هەڵخەڵەتێنەرەكانی، هەروەها لەنێوان هەندێ لەو كەسانەی كاتێ ئەم مەنهەجەی باوكمیان پێ گەیشتبوو، وە ئەو وەسفەی منیان پێ گەیشتبوو لەبارەی دەوڵەتی عەرەبی سووری سەری دونیایان لێ وێك هاتبۆوە، سەیری كتێبی (هذه مشكلاتهم) بكە لا ١٢.

ئەگەر بەشوێنێکدا بچووایەو لە ڕێگادا خراپەیەکی ببینایە دەوەستاو ئامۆژگاری کەسەکەی دەکردو بەرچاو ڕۆشنی پێ دەداو ئاگاداری دەکردەوە، پاشان دەستی دەکردەوە بە ڕۆیشتن، جارێکیان لە ماڵەوە بەرەو مزگەوت دەچوو لە ڕێگادا بەلای ماڵێکدا تێپەڕی گوێی لە دەنگێکی بەرزی ڕابواردن و گاڵتەو گەپ بوو، وەستاو گوتی: ئەی خەڵکی نێو ئەم خانووە بەیانی دەخرێنە نێو خانووی هەمیشەییتان لە گۆڕدا.

نمونەیەکی دیکە: ڕۆژێکیان دەهاتە نێو مزگەوت لە مەدخەلی مزگەوتەکە خەڵکێکی زۆر وەستابوون لە چاوەڕوانی جەنازەیەك لە مزگەوتەکە، وەك عادەتی زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی بەم شێوەیەیە، گەیشتە خەڵکەکەو وەستا، نکوڵی ئەو جۆرە وەستانە بێئاگایانەی ئەوانی کرد لەبەرامبەر دەرگای مزگەوت، کە بۆچی ناچنە نێو مزگەوت و لەگەڵ خەڵکەکەی تر نوێژ ناکەن؟ پێی گوتن: ئایا ئەو جەنازەیەی کە هێناوتانە بۆ ئەوەی کفن و دفنی بکەن و بیشارنەوە واتان لێ ناکات بیر لە چارەنووس و سەرەنجامی خۆتان بکەنەوە؟ ئایا ئەو مردنە واتان لێ ناکات تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە لای خوا؟!

هەندێ جاری دیکە وا ڕێککەوتووە بەلای گەنجانێکدا تێپەڕیوە بینیویەتی خەریکی گاڵتەو گەپی ناشەرعی بوونە، لە هەندێ لە قاوەخانەکان یان لە سەر ڕێگاو کوچەو کۆڵانەکان، وەستاوەو ئاگاداری کردوونەتەوە لە خراپی و حەرامی کارەکەیان، خوای پەروەردگاری بەبیر دەهێنانەوە، داوای لێ

دەكـردن كـە دەسـت لـەو جـۆرە كارانەيـان هەڵگـرن، تەوبـە بكـەن و بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوای بـەرزو مـەزن.

بـەڵام ئـەوەی پێویسـتە ئامـاژەی پـێ بكـرێ ئەوەیـە: هەمیشـە ئـەو شـتەی دەبـووە پاڵنـەری ئـەو كارانـەی ئـەو بریتـی بـوو لـە: سـۆزو بەزەیـی و شـەفەقەت بەرامبـەر گوناهبـاران، بەڵكـو زۆر جـار لـە دانیشـتنە تایبەتیـەكان و وانـە گشـتیەكانی ئـەوەی بەبیـر دەهێنایـنـەوە كـە گونـاح و تـاوان تاقیكردنەوەیـە، بۆیـە لەسـەر ئـەو كەسـە پێویسـتە كـە گوێڕایەڵـەو پارێـزراوە لـە گونـاح سوپاسـی خوا بـكات لەسـەر ئـەوەی لـەو تاقیكردنەوەیـە پارێـزراوە، بـەردەوام جەختـی لـەوە دەكـردەوە دەبـێ كەسـی ڕێنیشـاندەر چارەسـەری گوناهبـار بـكات وەك چـۆن دكتـۆر چارەسـەری نەخـۆش دەكات، پاسـاو بـۆ نەخۆشـیەكەی بهێنێتـەوە لەهەمـان كاتـدا چارەسـەری گونجاویشـی پـێ بـدات بـەو پـەڕی دڵسـۆزی.

هەروەهـا دەیگـوت: هەڵسـان بـەكاری بانگـەوازی و ڕێنیشـاندانی خەڵـك شـتێك نیـە غەیـری جێبەجێ كردنـی بڕیـاری شـەرع، لەوانەیە عاقیبـەت و چارەنوسـی كەسـی فاسـقی گوناهبـار باشـتر بـێ لـە عاقیبـەت و چارەنووسـی ئـەو كەسـەی كـە ئامـۆژگاری دەكات و ڕێگـەی پێشـان دەدات، لەوانەیـە چارەنووسـی حاڵـی ڕێنیشـاندەر خراپـتر بـێ لـە چارەنوسـی حاڵـی ئـەو گوناهبـارەی كـە لەنێـو گونـاح و تاواندایـە، لەسـەر بانگخـوازان و ڕێنیشـاندەرانە بەیەقینـی ئـەم هەقیقەتـە بزانـن و مامەڵـەی لەگەڵـدا بكـەن، نـەك هـەر خاكـی بوونێكـی ڕواڵەتـی بنوێنـن و خۆیانـی پـێ جـوان بكـەن!

لەو بارەوە بەڵگەی بە هەندێ لە گەورە پیاوانی تەصەووفی شارە كوردیەكان دەهێنایەوە، بۆی باس دەكردین كاتێ ئەو گەورە پیاوانە دادەنیشتن لەنێوان موریدەكانیان بەر لە خەتمی تەریقەتی نەقشبەندی، سەرەتا ئامۆژگاریان دەكردن، پاشان زۆربەی كات پێیان دەگوتن: لەگەڵ هامان و فیرعەون حەشر بكرێم ئەگەر وابزانم یاخود وا گومان ببەم كەمن لەلای خوا لەیەكێ لە ئێوە باشترم، ئەوەی دەیبینین تەنها جێبەجێ كردنی بەرپرسیارێتییەكە لەگەردنمداو پێویستە ڕایپەڕێنم.

دەڵێم: ئەوە حاڵی زانا ڕەببانیەكانە، ئەوە پێگەو مەقامی ئەوانە لە سەیر كردنیان بۆ دەروونی خۆیان، وە لە مامەڵەیان لەگەڵ خەڵكی، هەر ئەمەش نهێنی ئەو كاریگەرییە زۆرەی قسەكانیانە لەسەر دڵ و دەروونی ئەوانی تر، لەوانەیە باسكردنی ئەو ڕووداوەی خوارەوە ئەو ڕاستییە زیاتر بەرجەستە بكات:

جارێكیان بەرپرسێكی گەورە كە پێگەیەكی دیاری هەبوو لە دەوڵەت بێ هیچ پێشەكی و ئاگادار كردنەوەیەك بۆ یەكەمجار سەردانی باوكمی كرد، ، ئەو بەرپرسەی دەوڵەت یەكێ بوو لەو پیاوانەی زۆر گوێیان بە شتە ڕواڵەتی و خۆ دەرخستنەكان نەدەدا، جا ئەگەر ئەو شتە ڕواڵەتیە پابەند بوونی دینداریش بێ.

باوكم لە ژوورە بچووكە سادەو ساكارەكەی خۆی پێشوازی لێكرد، بەهەمان شێوەی پێشوازی كردنی خەڵكانی دیكە كە دەهاتنە لای، پیاوەكە بەشێوەیەكی وەها دانیشت وەك ئەوەی بیەوێ شتێكی نامۆو غەریب بزانێ لەبەرگی ئینسانێكی نەناسراو، تەنها بە پاڵنەری حەزو ئارەزووی زانین و بەدواداچوون هاتبوو.

ئــەو بەرپرســە گەورەیــە بــەو قســە بــاوو چاولێکەرییــە دەســتی بەقســە کــردن کــرد لەگــەڵ باوکــم، گوتــی: یــا شــێخ زۆر کەمتەرخەمیــن، دوعامــان بــۆ بکــە! تەبعــەن زۆرێــك لــە خەڵکــی کاتــێ لەگــەڵ کەســانی وەك باوکــم دادەنیشــن ئــەو قســەیەیان بەدەم گرتــووە کــە زیاتــر لەزمــان دێتــە دەر نــەك لــەدڵ.

باوکــم ســەیرێکی کابــرای کــردو گوتــی: تــۆ دڵنیــای لــەو قســەیەی دەیڵێــی، بەجددیتــە؟ بەڕاســتی یەقینــت وایــە کەمتەرخــی؟ ئەگــەر دڵنیــای کــە بــەم شــێوەیەی ئــەوا دڵنیاشــبە لــەوەی خــوای گــەورە بەزەیــی پێتــدا دێتــەوە.

پاشــان پێــی گــوت: تــۆ ســکاڵای کەمتەرخەمــی خــۆت لــەلای مــن دەکــەی؟ کــێ هەیــە لــە ئێمــە کەمتەرخــەم نەبــێ بەرامبــەر خــوای پــەروەردگار، لەوانەیــە بــەوە هەڵخەڵەتابــی گوێــت لــێ دەبــێ پێــم دەڵێــن: شــێخ مــەلا، شــێخ مــەلا، پەشــتەماڵێکی نوێــژ کردنــم لەپێشــەو، تەســبیحێکم لەدەســتەو، مێــزەرم لەســەرەو، ڕیشــێکم هەیــە، لەبــەر ئــەو شــتانە وا گومــان دەبــەی مــن لەتــۆ چاکــترم، هاتویتــە لای مــن و ســکاڵای کەمتەرخەمــی خــۆت لــەلای مــن دەکــەی، کــێ هەیە لــە ئێمــە کەمتەرخــەم نەبــێ بەرامبــەر پــەروەردگار؟! ئەگــەر ئــەو ســکاڵایەی تۆ دەیکەیت لەکانگای هەســت و شــعورێکی ڕاســتگۆیانە هاتبێتــە دەر، ئــەوا لەوانەیــە زۆر زیاتــر لــە عیبادەتــی شــێخێکی وەکــو مــن، کــە وادەزانــێ هەمــوو مافەکانــی خــوای گــەورەی ئەدا کــردووە، باشــتر بێــت و زیاتــر لەخــوای گــەورەت نزیــك بخاتــەوەو وات لــێ بــکات زیاتــر شایســتەی بەزەیــی پێــدا هاتنــەوەی ئەوبیــت.

پاشـان باسـی گەورەیـی مافـی پەروەردگارێتـی خـوای مەزنـی بـۆ كـرد بەسـەر بەندەكانیـەوە، بەرامبـەر بێهێـزی ئینسـان لـە جێبەجـێ كردنـی بەشـێكی بچووكـی ئـەم هەقـە، پێـی گـوت كـە: باشـترین ڕێـگا بـۆ نزیكبوونـەوەی بەنـدە لـە پـەروەردگاری بریتییـە لـە نواندنی زەلیلیەكـی ڕاسـتگۆیانە بـۆ خـوا، هەروەهـا بڕیـاردان لەسـەر ئـەوە كـە هەنـگاو بهـاوێ بـۆ جێبەجـێ كردنـی فەرمانەكانـی بەپێـی توانـا، هەروەهـا سـەیری بەندەكانـی خـوا بـكات بەچـاوی سـۆزو بەزەیـی، نـەك بەچـاوی خـۆ فەڕزكـردن و گەورەیـی نوانـدن بەسـەریاندا.

تەماشـــای پیـــاوە بەرپرســـەكەم كـــرد كاریگەریەكـــی زۆری قسـەكانی باوكمـی بەسـەرەوە دیـار بـوو، لـە كۆتاییـدا بـە باوكمـی گـوت: گـەورەم هیـچ زیكـرو ویردێكـت هەیـە پێمـی بـدەی ئەنجامی بـدەم بـۆ ئـەوەی نێوانـی خـۆم و خـوای گـەورەی پـێ ئـاوەدان بكەمـەوەو نزیكـم خاتـەوە لەخـوا، زیكـرو ویردێكـی ئاسـان لەگـەڵ حـاڵ و بـارو دۆخـی مـن بگونجـێ؟

باوكـم وەڵامـی داوا كاریەكـەی دایـەوە هەنـدێ ویـردی ئاسـانی پێـدا لـەو ویـردو زیكرانـەی كـە لـە كتێبەكانـی سـوننەتدا هاتـوون لـە بەیانیـان و ئێـواران، پیاوەكـە هەڵسـاو خـوا حافیـزی كـردو ڕۆیـی، منیـش دانیشـتم و بیـرم كـردەوەو زۆر سەرسـام بـووم بـەوەی چـۆن ئەمـە ڕوویـدا پیاوێـك بەمەبەسـتی بەدەسـت هێنانـی هەواڵێـك و حـەزی گـەڕان و سوڕان هاتـووە بـۆ لای باوكـم كەچـی پـاش كەمێـك وەك موریدێكـی ڕاسـتگۆ خواحافیـزی لـە شـێخەكەی دەكات و دەچێتـە دەرەوە؟!

پێش ئەمە بەچەند مانگێك یاخود پێش نزیكەی ساڵێك بەرپرسێكی باڵای دیكە سەردانی باوكمی كرد بۆ ئەوەی پێشتر یەكتریان ناسیبێ، سەرەتا كە دانیشت چەند پرسیارێكی دینی لە باوكم كرد بۆ ئەوەی باوكم وەڵامیان بداتەوە، باوكم بەسینە فراوانیەوە وەڵامی پرسیارەكانی دایەوە، پاشان دەستی كرد بە ئامۆژگاری كردنی بەرپرسە باڵاكە، بیری خستەوە خوای پەروەردگار چ مافێكی گەورەی بەسەر بەندەكانیەوە هەیەو، مرۆڤیش لەژێر بارێكی قورسی بەرپرسیارێتی بەندایەتی دایە بەرامبەر بەخوا، (قسە كردن لەسەر هەست كردنی بەندە بەبەندایەتیەكەی بۆ خوا، لە گرنگترین ئەو بابەتانە بوو كە باوكمیان سەرقاڵ كردبوو زۆر باسی دەكردو زۆریش چێژی لێ دەبینی)، هەر بەرپرسێكی گەورە هاتبێتە لای باوكم، باوكم ئەم بابەتەی لەگەڵ باس كردووە، بەرپرسەكە دەستی كرد بە گریانێكی بەكوڵ، دواتر بە ئەدەبێكی زۆرەوە داوای مۆڵەتی لە باوكم كرد كە دەیەوێ بچێتە دەرەوەی ژوورەكەو جگەرەیەك بكێشێ، باوكیشم پێی گوت: ئاساییە چۆنی پێت خۆشە، دەتوانی لەشوێنی خۆت جگەرەكە بكێشیت و نەچیتە دەرەوە[1].

---

(١) ئەی خوێنەرەكەم ئایا شتێكی سرووشتی نییە بەو پەڕی پەرۆشیەوە بپرسی: كوان ئەوانەی خەڵكی بانگ دەكەن بۆ لای خوا؟ ئایا بەم ڕۆحیەتەوە خەڵك بانگ دەكەن بۆ لای خوا؟ ئایا بە وروژاندن و گەرم كردنی هەست و شعوری بەندایەتییان بۆ خوا بانگیان دەكەن؟ ئایا بەو نەفس بەرزی و بێنیازیە لە دونیاو دەستكەوتە جۆر بەجۆرەكانی دونیا خەڵكی بانگ دەكەن بۆ لای خوا؟ ئایا هەقی خۆی نییە پرسیار بكەین: لەبەرچی و لەپێناوی چیدا مینبەرەكانی دەعوەو بانگەوازی گۆڕاوە بۆ

ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ هەرگیـز بێتاقـەت نەدەبـوو لـە پرسـیارو گفتوگـۆ سـەبارەت بـە ڕەواندنـەوەی گومانـی کەسـانی لادەر، یاخود ئەوانــەی گومــان لەدڵــی خەڵــك درووســت دەکــەن، بەمەرجێــك ئەگــەر ئــەو کەســانە جــددی بووبــن بــۆ بــەدوا گەڕانــی هــەق و ڕاســتی، ئەگــەر بەجــددی بــەدوای وەڵامــدا گەڕابــن بــۆ ئــەوەی گومانەکانیــان بڕەوێننــەوە، یاخــود ئەگــەر ویســتبیان بزانــن هەڵوێســتی زانســت لەبــارەی مەســەلەیەکەوە چییــە.

بۆیــان گێڕامــەوە ڕۆژێکیــان ســێ گەنــج دەچنــە لای باوکــم، بــە ڕاشــکاوی پێــی ڕادەگەیەنــن کــە ئــەوان بــێ دیــن (مولحيد)ن

---

گۆڕەپانـی تونـدو تیـژی و تۆڵـە سـەندنەوە؟ بۆچـی ئـەو دڵانـە شـاراونەتەوەو ونـن، کـە پێویسـتە سـۆزو بەزەیـی و دڵسـۆزیان تێـدا بـڕژێ؟ لەشـوێنیدا دڵانێـك دەرکەوتـوون ڕق و بوغـزو کینەیـان لـێ دەڕژێ.

تـۆ بڵێـی چارەنووسـی خەڵکـی چـی بەسـەربێ ئەگـەر ئەوانـەی خەریکـی هەڵسـاندنەوەی کۆمەڵگـەی ئیسـلامین ڕێـگای ئـەو پیـاوە خواییانـە بگـرن لـە قسـەو حیـوارو بانگـەوازی کردنیـان بـۆ لای خـوا؟ ئـەو کاتـە سـوێند بەخـوا دڵـە داخـراوەکان بـە وشـە نورینەکانـی ئـەو مامۆسـتا بەڕێزانـە دەبنـەوە، ئەگـەر بـەو شـێوەیە خەڵکـی بانـگ بکـەن ئـەوا خـاوەن پۆسـت و پێگـە بەرزەکانیـش بەرامبـەر قسـەکانیان بچوکـی و زەلیلـی دەنوێنـن، دەبنـە خۆشەویسـتی نێـو دڵ و دەروونـی خەڵکەکـەش بەگشـتی، ئاگاداربـن ڕێـگا بـۆ ئەمـە کراوەیـە، ئـەوەی بیـەوێ وەك ئـەو پیـاوە گەورانـە دەعـوە بـکات هیـچ زەحمەتـی و داواکاریەکـی قورسـی لـێ ناکـرێ، تەنهـا خـۆ سـاغ کردنـەوەو نیـەت پاکـی بـۆ خـوا، لەگـەڵ بەندایەتییەکـی سەر ڕاست و خـۆ بەگەورەتـر زانیـن و نەفـس بـەرزی لـە ئاسـت دەمارگیـری و خۆشویسـتنی هـەواو ئـارەزوو.

باوەڕیان بە بوونی خوا نیە، دەیانەوێ پێچەوانەی ئەوەی ئەوان باوەڕیان پێی هەیە بۆیان بسەلمێنرێ بەبەڵگەی زانستیی یەکلاکەرەوە.

باوکم بەخێرهاتنیان دەکات، زۆر بە سینە فراوانیەوە گوێ بۆ گومانەکانیان دەگرێ، پاشان لەبارەی هەقیقەتی گومانەکانیان قسەیان لەگەڵ دەکات و پووچی و باتڵی بۆچوونەکانی ئەوان دەردەخا، پاشان باسی چەند بەڵگەیەکی جۆراو جۆریان بۆ دەکات لەسەر بوونی بەدیهێنەری پەروەردگارو درووستکردنی گەردوون لەلایەن ئەو بەدیهێنەرەوە، ماوەیەکی زۆر لەگەڵیان دادەنیشێ و واز لە ئیش و کارەکانی دیکەی دەهێنێ، لەپێناو هەڵسان بەو واجبە کە دەگمەن و لەپێشترە.

گوتیان: لە کۆتاییدا دوو لەو گەنجانە بەقەناعەت و تێگەیشتنەوە باوەڕیان بە بوونی خواو تاکو تەنیایی خوا هێنا، بەڵام سێیەمیان لەنێو گومان و دوودڵیدا مایەوە، ئنجا باوکم بەردەوام ئومێدو هیوای وابوو گەنجەکەی تر جارێکی دیکە بگەڕێتەوە قسەو گفتوگۆکانیان درێژە پێ بدەن، بەڵکو هیدایەت وەرگرێ.

ئەوەی گرنگە ئەوەیە باوەڕی وابوو کە دانیشتن لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە لەپێناوی هیدایەت درانیان و دەرهێنانیان لەو گومڕایی و سەرگەردانییە لە ڕیزی جیهادە موبارەکەکانە، جا ئەگەر مەبەستەکەی خۆی بپێکێ یان نەیپێکێ.

کاتـێ بەرپرسـێکی وەزارەتـی ڕاگەیانـدن پەیوەنـدی پێـوە کـردم، پێشـنیاری بیرۆکـەی بـەژداری کردنـی بـۆ کـردم لەگـەڵ دکتـۆر تەیـب تیزینـی لـە دیبەیتێکـی تەلەفزیۆنیـدا سـەبارەت بـە تـوراس و ئـەو شـتانەی کـە پەیوەندییـان بـە توراسـەوە هەیـە، ڕاوێـژم بـە باوکـم کـرد سـەبارەت بـە بـەژداری کـردن یاخـود نەکردنـم، ئـەو کاتـە نەخۆشـیش بـوو، بیرۆکەکـەی زۆر پـێ بـاش بـوو داوای لێکـردم بـەژداری بکـەم!

دواتـر بـە کردەیـی بەژدارییـم تێـدا کـرد لـە دوو دیبەیتـی یـەك لـەدوای یـەك کـە نزیکـەی سـێ کاتژمێـری خایانـد، کورتـەی باسـەکانی دیبەیتەکـە لـەدەوری فەلسـەفەی مـاددی و ڕوانگـەی ئـەو فەلسـەفەیە بـۆ دیـن و تـوراس دەخولایـەوە، هەمـووان دەزانـن دکتـۆر تیزینـی تـا ئێسـتاش بـاوەڕی بـە فەلسـەفەی مـاددی دیالیکتیکـی هەیـەو تەبەننـی ئـەو فەلسـەفەیە دەکات.

هەنـدێ لـە زاناکانـی دیمەشـق نکوڵـی ئـەو بـەژداری کـردن و چاوپێکەوتنـەی منیـان کـرد، پێیـان شـتێکی بـاش نەبـوو، پێیـان وابـوو ئەمـە شـتێکی حەرامـەو ناتەواویـی خسـتنە پـاڵ دینـە، ئـەوان باوەڕیـان وابـوو پێویسـتە ئینسـان خـۆی بەرزتـر ڕابگـرێ لـە دیبەیـت و چاوپێکەوتنێکـی لـەم شـێوەیە.

باوکـم ئینـکاری و نکوڵـی ئـەو زانایانەی دیمەشـقی بـۆ گەڕایەوە لەبـارەی دیبەیتەکـە، پاڵکەوتبـوو بەسـەر جێگاکەیـدا گوتـی: {ئـە ئێمـە باشـترین لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە دەچـووە نێـو شـوێنی کۆبوونـەوەو یانەکانـی هاوبەشـدانەران بـۆ گفتوگـۆ لەگـەڵ کردنیـان

و بانـگ كردنيـان، نـە (تيزينـی)ش خراپـترە لـەو هاوبەشـدانەرانەی كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەچـووە لايـان و لەگەڵيـان دادەنيشـت}.

كاتێكيـش بـۆی گەڕايـەوە هەنـدێ لەوانـەی ڕەخنەيـان گرتبـوو سـەرەڕای ڕەخنەكەيـان لـە بـەژداری كردنـم لـە ديبەيتەكـە قسـەيان لەسـەر باوكيشـم كردبـوو كـە نەدەبووايـە مـن بەتەنيـا ڕاوێـژ بـە باوكـم بكـەم، بەڵكـو دەبـوو ڕاوێـژم بـە خەڵكێكـی ديكـەش بكردايە، گوتوبيـان: شـێخ مـەلا (واتـە: باوكـم) لـە بارودۆخێكـی ئـاوا نييـە بزانـێ چ بكـرێ باشـە لـەم مەسـەلەيەدا! كـە ئـەم قسـەيەی لەسـەر خـودی خـۆی بـۆ گەڕايـەوە بێدەنگـی هەڵبـژاردوو قسـەيەكی لەسـەر ئـەو قسـەيەی ئـەوان نەبـوو.

چالاكييە زانستييەكانی:

باوكـم بـەوە نـاسرا بـوو كـە: زەبـر دەسـتە لـە فيقهـی ئيمامـی شـافعی، وە خوێندنـەوەو بەدواداچوونێكـی فراوانيشـی هەبـوو لـە فيقهـی حەنەفـی، دەرسـێكی زۆری لەهـەردوو فيقهەكەدا پێشـكەش كردبـوو، هـەروەك بەدواداچـوون و زانسـتێكی فراوانيشـی هەبـوو لە زانسـتی ئالـە وەك مەنتـق و زانسـتەكانی نەحـوو صـەرف، لـەوەش گرنگـتر تەحقيـق و لێكۆڵينەوەكانـی بـوو لـە مەسـەلە زانسـتيەكان، بەتايبـەت مەسـەلە فيقهيـەكان، زۆر بەناخـی مەسـەلەكاندا قـووڵ دەبـۆوەو بەدواداچوونـی بـۆ دەكـرد، زۆر جـار دوو بـۆ سـێ ڕۆژ بەديـار تەحقيـق كـردن و بەدواداچوونـی يـەك مەسـەلەی فيقهـی دەمايـەوە، ئـەو مەسـەلەيە دەبـووە مايـەی سـەرقاڵ بوونـی ئـەوو، وازی لـێ نەدەهێنـا تـا نەگەيشـتبايە بڕيارێكـی يەكلاكـەرەوە.

زۆر جـار ڕەخنـەی لـە زانسـتخوازان و مامۆسـتاکانیان دەگـرت لەسـەر ئـەوەی لەمەسـەلەکان قـووڵ نابنـەوەو بەدواداچوونـی بـۆ ناکـەن، بەڵکـو زۆر بەسـادەیی بەسـەریدا تێدەپـەڕن، هـەر قوتابیـەك بهاتایەتـە لای بـۆ ئـەوەی دەرسـێکی لـەلا بخوێنـێ هـەر دەرسـێك بووایـە، ڕەتـی نەدەکـردەوە، زۆر جـار قوتابیەکـە خـۆی پێشـنیاری ئـەو زانسـتەی دەکـرد کـە دەیـەوێ بیخوێنـێ، واتـە: قوتابیەکـە هەڵیدەبـژارد، زۆربـەی ئـەو دەرسـانەی کـە لـەلای باوکـم دەیانخوێند بریتـی بـوو لـە: فیقـە، تەفسـیر، زانسـتەکانی ئالـە وەك مەنتـق و نەحـوو صـەڕف و بەلاغـە، سـەرەڕای تەزکیـەو تەصـەووف، زیاتـر لـە جارێـك کتێبـی ڕیسـالەی قوشـەیری بـە بەشـێك لـە قوتابیەکانـی گـوت، هەروەهـا حیکمەتەکانـی ئیبن و عەتـاو هەنـدێ لـە شـەرح و ڕوونکردنـەوەی حیکمەتەکانیشـی پـێ دەگوتـن، هەروەهـا کتێبـی قەواعیـدی تەصەووفـی شـێخ زەڕوق.

بـەڵام لـە (دە) سـاڵی کۆتایی تەمەنیـدا ڕووی کردە سـەرقاڵ بوون بـە تەصـەووف، هەروەهـا لێکۆڵینـەوە لـە ژیانـی زانـا خواییـەکان، لـەو دە سـاڵەی کۆتایـی تەمەنیـدا ئەگـەر یەکـێ بهاتایـە بـۆلای و داوای لـێ بکردایـە لـە زانسـتەکانی تـر دەرسـێکی بـۆ دابنـێ، حەواڵـەی لای یەکێکـی تـری دەکـرد.

کۆتـا سـەردەمەکانی دەرس گوتنـەوەی خـۆ یـەکلا کردنـەوەی بـوو بـە گوتنـەوەی کتێبـی ئیحیـا علومودینـی ئیـمام غەزالـی، خەڵکێکـی زۆر بـۆ وەرگرتنـی ئـەو دەرسـە کـۆ دەبوونـەوە لەهەمـوو چیـن و توێـژەکان و ئاسـتە جیـاوازەکان، زۆربـەی جـارەکان لەکاتی

دەرسەکە ماڵمان پڕ دەبوو، دەرسەکەش لە ڕۆژانی دووشەممەو سێشەممەی هەموو هەفتەیەك پێشکەش دەکرا، دوای ئەوەی کتێبەکە تەواو بوو باوکم و هەموو بەژدار بووانیش پێیان خۆش بوو دووبارە لەنوێوە بیخوێننەوە، ئەوەی لەیادم مابێ بەم شێوەیە نزیکەی هەشت ساڵ لە گوتنەوەی بەردەوام بوو.

باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ لەو کەسانە نەبوو خۆی لە نووسینی کتێبدا ببینێتەوە، لەدوای خۆیدا هیچ کتێبێك و نووسینێکی زانستی جێنەهێشت، جگە لەو نامەیەی کە وەك وەسیەتێك بۆ تاقە کوڕەکەی نووسی، لەو ڕۆژەدا کە تووشی نەخۆشیەکی قورس بووبو ترسا لەوەی بەهۆی ئەو نەخۆشیە کۆچی دوایی بکات، بەڵام سوپاس بۆخوا لەنەخۆشیەکەی چاك بۆوە وەك لەسەرەتا باسمان کرد.

بەڵام لە پڕێکدا شتێکی دەگمەن و نامۆ لە بیر کردنەوەو جۆری چالاکیە زانستیەکانی باوکم ڕوویدا، پاڵی پێوەنا بۆ نووسین و بڵاو کردنەوەی دوو وتار (مەقالە)، ئەمە لە کاتێکدا نە پێشتر مەقالەی نووسیبوو، نە دوای نووسینی ئەو دوو مەقالەیەش مەقالەی دیکەی نووسی واتە: یەکەمجارو کۆتا جاری بوو.

مەقالەی یەکەم لەبارەی چەند ڕەخنەیەك بوو لەلایەن چەند کەسێکەوە لە بابەتێکم ، لە ژێر ناوونیشانی هەڵێنجان (ئیجتیهاد)ی گەورەمان پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەگەری ڕوودانی هەڵە لە هەڵێنجانەکانی، ئەم بابەتەش یەکێك بوو لە بابەتەکانی

کـتێبـــێکـــم بەنـاوی فیقهـی سـیرەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، مەقالەکـەی گەیشـتە گۆڤـاری (نهـج الإسـلام) کـە لەلایـەن وەزارەتی ئەوقـاف دەردەچـوو ئـەو کاتـەی کـە دکتـۆر موحەممـەد مەحەممـەد خەتیـب وەزیـری ئەوقـاف بـوو.

لەبــارەی ئــەو قســانەی دەکــرا لەســەر ئــەو بابەتــەی نێــو کتێبەکـەم قســەم لەگـەڵ باوکــم کــرد، ئــەو قســانەی نووســیبوم سـەبارەت بـە بابەتەکـە پێشـانمدا، هەواڵـم پێـدا لەبـارەی ڕەخنـەی ئـەو کەسـانەی کـە زانیاریـان نییـە یـان خۆیـان نـەزان دەکـەن لـە بنچینەکانـی زانسـت و قسـەی پێشـەوایان، ڕەخنەیـان لـەو بابەتـەی مـن گرتـووەو تۆمەتبـارم دەکـەن، هەنـدێ لـەو تۆمەتانـە نزیـك بـوون لـە بەکافردانـان و بەفاسـق دانانـی مـن!!

باوکـم پشـتگیری کـردم لـەوەی کـە نووسـیبووم، مۆڵەتـم لـێ وەرگـرت کـە بەدواداچـوون بکـەم لەسـەر ئـەو ڕەخنانـە بەچەند شـتێك بـۆ ئـەوەی هەقەکـە ڕوونـترو ئاشـکراتر بـکات، مۆڵەتـی دام، بەڵکـو هانیشـی دام بـۆ ئـەم کارە، سـەرنجی ڕاکێشـام بـۆ باشـترین شـێواز لـە لێکۆڵینـەوەو تەحقیـق کردنـی مەسـەلەکە لەهەمـوو لایەکانیـەوە.

بـۆ بەیانـی ڕۆژی داهاتـوو کاتـێ لـەلای دانیشـتم پێـی گوتـم: ئەمشـەو خەوێکـی زۆر سـەیرم بینـی، هەرگیـز لـە ژیانـی خۆمـدا خـەوی وا سـەیرو نامـۆم نەبینیـوە، منیـش پێـم گـوت: خێـر چیـت بینیـوە؟ تـکام لـێ کـرد بۆمـی بـاس بـکات، دەسـتی کـرد بـە گێڕانـەوەی خەونەکـە سەرسـوڕمانی سـەرتاپا ئـەوی داگیـر کردبـوو گوتـی: خـوای بـەرزو مەزنـم بینـی ....

پاشــان بێدەنــگ بــوو، زۆر تــكام لــێ كــردو پێداگیریــم كــرد تــەواوی بــكات هیــچ شــتێكی دیكــەی نەگــوت، ئــەو خــەوەی بۆهیــچ كەســی دیكــەش بــاس نەكــرد، بــەڵام دوای كەمێــك داوای لێكــردم كاغــەزو قەڵەمێــك بهێنــم پاشــان پێــی گوتــم: بنووســە[1]، بــەو پــەڕی وردی و تەحقیقــەوە هەنــدێ قســەی بــۆ كــردم لەســەر مەســەلەی (هەڵهێنجانــی پێغەمبــەری خــواو ﷺ نەگــەری هەڵەكــردن و نەكــردن تێیــدا)، بــۆ ئــەوەی بینوســمەوە، ئــەوەی كــە لەدەمــی ئــەوەوە نوســیمەوە گەیشــتە نزیكــەی ســێ پــەڕی گــەورە، پاشــان پێــی گوتــم: ئەمــە دەرەنجامــی ئــەو خەونــە ســەیرە بــوو كــە شــەوی ڕابــردوو بینیــم، پاشــان داوای لێكــردم ئــەم نووســینە بــۆ دكتــۆر موحەممــەد موحەممــەد خەتیــب ڕەوان بكــەم ســەر نوســەری ئەوكاتــی گۆڤــاری (نهــج الإســلام)، بــۆ ئــەوەی لــە گۆڤارەكەیــدا بــڵاوی بكاتــەوە، دواتــر بڵاویــش كرایــەوە.

ئەمــە بــووە جێگــەی سەرســوڕمانیەكی گــەورە لەلایــەن ئــەو كەســانەوە كــە باوكمیــان دەناســی، شــێخ مــەلا ڕەمــەزان وتارێكــی لــە گۆڤارێكــی گــەڕۆك بــڵاو كردۆتــەوە ئەمەیــان زۆر لــەلا ســەیر بــوو!

خوێنەر دەتوانێ لە كۆتایی ئەم كتێبە دەقی وتارەكە ببینێ.

بەســەرهاتی وتــار (مەقالە)كــەی دووەم دەگەڕێتــەوە بــۆ ئــەوەی كــە یەكــێ لــە شــێخەكانی تەریقەتــی نەقشــبەندی لــە دیمەشــق شــتێكی لــەلا گەلاڵــە ببــوو، بــووە جێــی ســەرنجی خەڵكەكــە،

---

(١) باوكــم ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ لــە كۆتاییەكانــی تەمەنیــدا چاوەكانــی بێهێــز بووبــون، نەیدەتوانــی بەبــێ چاویلكــە بخوێنێتــەوە.

داوای لـە موریـدان و خەڵكانـی دەورو بـەری خـۆی كردبوو شـتێك لـەو دەسـتەواژەیە زیـاد بكـەن كـە لەبـارەی صەڵـەوات دان لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتـووە لـە كتێبەكانـی فەرمـوودەدا، ئەویـش بریتیـی بـوو لـە وشـەی (وَوالِدَيـه) واتـە: وە (دایـك و باوكـی)، دەسـتەواژەكە دوای دەسـتكاری كـردن ئـاوای لێهاتبـوو: (اللهـم صل علی محمـد ووالدیـه...) پاشـان وای لێكردبـوون لـە هەمـوو یـادو بۆنـەو دانیشـتنەكاندا ئـەو شـێوازە بـەكار بهێنـن، بەمـە پاڵپشـتی داهێنانەكـەی خـۆی دەكـردو بەرگـری لـێ دەكـرد، كـە گوایـە لای زۆربـەی زانایـان و ئەهلـی تەحقیـق هاتـووە كـە دایـك و باوكـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە ڕزگار بووانـن، هەڵسـابوو قسـەی ئـەو زانایانـەو داهێنانەكـەی خـۆی تێـك هەڵكێشـا بـوو بەیەكـەوەی پەیوەسـت كردبـوون.

دوای ئـەوەی باوكـم ئـەو كارەی ئـەو شـێخەی بیسـت زۆری پـێ ناخـۆش بـوو، زۆر ئەزیەتیشـی پـێ خـوارد، ئەزیەتـی خـوارد بـەوەی ئـەو شـێخە لەلایـەك بیدعەیەكـی داهێنـاوەو بانگەشەشـی بـۆ دەكات لەنێـو خەڵكانـی سـادەو سـاكار، لەلایەكـی تر ئـەو بیدعـە خراپەیەی خـۆی بەشـتێك پـەردە پـۆش كـردووە كـە قسـەی لەسـەر ناكـرێ كـە ئەویـش بۆچوونـی زۆربـەی زانایـان و ئەهلـی تەحقیقـە لەسـەر ئـەوەی كـە دایـك و باوكـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە ڕزگار بووانـن لـە دۆزەخ، ئەمـەی دووەمیـان زۆر زیاتـر ئەزیەتـی دەدا، چونكـە وای دەخسـتە مێشـك و دڵـی كەسـانی نـەزان و سـادەو سـاویلكە كـە بـۆ ئـەم كارەی بەڵگـەی زانستـی پێیـە، بەڵگەكەشـی بریتییـە لـەوەی كـە دایـك و باوكـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە ڕزگار بووانـن.

ڕەحمەتی خوای لێبێ بۆ جاری دووەم بانگی کردم داوای لێکردم وەرەقەو قەڵەمێك ئامادە بکەم، پاشان چەند قسەیەکی زانستی لەو پەڕی وردی و دیققەتەوە پێ گوتم بۆ ئەوەی بۆی بنووسمەوە، ڕوونی کردەوە ڕزگار بوونی دایك و باوکی پێغەمبەری خوا ﷺ نابێتە بەڵگەو پاساوو بۆ ئەوەی دەستەواژەیەکی دیکە دابهێنرێ لەجیاتی ئەو صەڵەواتەی کە وارید بووەو خوای گەورە خۆی فێری کردووین.

بەهەمان شێوە خوێنەر دەتوانێ ئەو وتارەی دووەمیش لە کۆتایی ئەم کتێبە بخوێنێتەوە، ئەم وتارەی دووەمیش دوای چەند مانگێك لە وتارەکەی یەکەم لە هەمان گۆڤار بڵاو کرایەوە، ئەمەی باسکرا ئەو نوسینانە بوون کە لەدوای خۆی جێی هێشتن ڕەحمەتی خوای لێبێ.

**دووبارە گەڕانەوە بۆ کەنارگرتویی لە دوای کۆمەڵێك چالاکی:**

کەواتە: باوکم لە گەڵ کۆمەڵێك لە زانایانی دیمەشق چەندین چالاکی کۆمەڵایەتی و ئاینی هەبوون، لە سەرەتای شەستەکانەوە دەستی پێ کردو بەردەوام بوو تا سەرەتای هەشتاکان، یاخود کۆتایی حەفتاکان، پێویست ناکات جۆراو جۆری ئەو چالاکیانە زیاتر لەوەی باسکرا بهێنین.

ئەوەی گرنگە باسی بکەین ڕەحمەتی خوای لێبێ لە کۆتایی حەفتاکاندا دەستی کێشایەوە لە بەژداری کردن لەو ئاهەنگ و کۆبوونەوەو چاوپێکەوتنانەی بۆی بانگهێشت دەکرا،

مەیلی بەلای دووره پەرێزی و کەنار گرتویی دەچوو، دەیویست بگەڕێتەوە بۆ ئەو حاڵەی کە لە ساڵانی سەرەتای هاتنمان بۆ دیمەشق هەیبوو.

وەك ئەوەی هەندێك خەیاڵی لێ دەکەن و وای بۆ دەچن گوایە ئارەزووی باوکم بۆ تەنیایی و کەنار گرتویی لەبەر پیری و بێهێزی بووە، ئەمە ڕاست نییە، بە پێچەوانەوە هەم زاکیرەو هەم کۆنترۆڵی بەسەر عەقڵیدا، هەروەها جووڵەو چالاکیەکانی، لەو پەڕی باشیدا بوون تا کۆتاییەکانی تەمەنی، هەروەها وەعی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵکیدا بەردەوام لە باشیدا بوو.

نزیکەی ساڵ و نیوێك بەر لە وەفات کردنی لەلایەن حکومەتی جەزائیریەوە هەڵبژێردرام بۆ وەرگرتنی پۆستی بەڕێوەبەری زانستی زانکۆی ئەمیر عەبدولقادر لە قوسنتینە لە جەزائیر، مەسەلەکەم بۆ باوکم باس کرد ئامۆژگاری کردم کە ڕەتی بکەمەوە، وەك هەموو جارێك دووبارە ئامۆژگاری کردمەوە بەوەی کە لەبەر هەر هۆیەك لە هۆکارەکان سوریا جێنەهێڵم، مەگەر بۆ سەفەرێکی دیاری کراو، منیش بە شێوەیەکی فەرمی لە ڕێگەی ئەو لایەنانەی کە پەیوەندیان بە کارەکەوە هەبوو لە دیمەشق، داوای لێبوردنم کرد.

لەکۆتایی هەمان ساڵ بانگهێشت کرام بۆ وڵاتی جەزائیر بەمەبەستی ئامادە بوون لە پانێڵێکی فیکریی کە لە هاوینی هەموو ساڵێکدا دەبەسترا، دەتوانم بڵێم لەهەموو ساڵەکاندا ئامادە دەبووم، بڕیارمدا بۆ ئەم ساڵە داوای لێبوردن بکەم و

بەژداری نەكەم بەهۆی ئەو حاڵەتە تەندروستییەی باوكم پێیدا تێدەپەڕی وای دەخواست لەلایدا بمێنمەوە.

وەك عادەت و نەریتی خۆم هەموو ئەو شتانەم بۆ باس دەكرد، ئەمەشم پێ ڕاگەیاند كە دەمەوێ داوای لێبوردن بكەم لەو بانگهێشتنامەیەی كە پێم گەیشتووە بۆ ئامادەبوون لەو پانێلە فیكرییە.

ڕەحمەتی خوای لێبێ ڕازی نەبوو بەوەی بەژداری نەكەم، پێداگیری كرد لەسەر ئەوەی دەبێ وەڵامی بانگهێشتنامەكە بدەمەوە، جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە بەرژەوەندی لەوەدایە بچم بەژداری بكەم، دوای ئەوەی پرسیارم لێكرد ئایا چ بەرژەوەندیەك لە بەژداری كردنی مندا هەیە؟ پێی گوتم: ئەگەر تۆ داوای لێبوردن بكەی لە بەژداری كردن لە كۆبوونەوەیەكی لەم شێوەیە دوای ئەوەی كە پێشتریش داوای لێبوردنت كردووە لەسەر وەرگرتنی ئەو پۆستەی كە بۆت پێشنیار كرابوو، ئەوكات وا گومان دەبەن كە دیارە خودی حكومەتی جەزائیری هەڵوێستێكی نەرێنی نواندووە بۆیە تۆ بەژداری ناكەیت، بەڵكو لەوانەیە لەوەش خراپتر ئەو هەڵوێستەی تۆ بە هەڵوێستێكی نەرێنی حكومەتی سووری لێك بدەنەوە بەرامبەر بە حكومەتی جەزائیریی، لەبەر ئەوە بەرژەوەندی لەوەدایە ئێمە نەبینە هۆكاری درووست بوونی ئەو جۆرە گومانانە، یاخود نەبینە هۆكاری گومانی خراپ بەیەكتر بردنی نێوان دوو دەوڵەت[1].

---

(١) ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەو كاتەی كە لە (بلودان) بوو بۆ

بەم شێوەیە باوكم ئاگاداری دەكردمەوە بە چاودێری كردن و ئاگادار بوون لە وردترین پێوەری ئەو پەیوەندیە هەستیارانەی كە لە ئارادان، نەك هەر لەنێوانی كەسەكان، بەڵكو لە نێوانی حكومەتەكانیش، ئەم جۆرە بیر كردنەوەیە لە حاڵەتێكی لەم شێوەیە نەك هەر كەسی ئاسایی بگرە كەم كەسی خاوەن فیكرو بیرتیژیش لەوانەی كە لەنێو ئەم جۆرە كارانەدان بیری لێ ناكەنەوە، ئەو حاڵەتە كە باسی دەكەم پێش وەفات كردنی بوو بە كەمتر لە ساڵێك، كە بە بڕواو قەناعەتی خۆی تەمەنی (١٠٣) ساڵی تێپەڕاندبوو!

لە بەشی كۆتایی ئەم كتێبەماندا بەڵگەی زیاتر دەهێنینەوە لەسەر دیقەت و وردیی هەستەكانی، وە لەسەر ئەو هۆشیاریە زۆرەی كە هەیبوو بەرامبەر بە كێشەو مشت و مڕە جیاجیاكان، كە چۆن ئەندازەگیری بۆ دەكرد بەو شێوەیەی كە شایستەیە،

---

پشوو، منیش لە دیمەشق بووم دووبارە بە تەلەفون جەختی لەسەر ئامۆژگاریەكەی كردەوە كە وەڵامی بانگهێشتەكەی وڵاتی جەزائیر بدەمەوە، ئەو دەیزانی هۆكاری دوودڵیەكەم بۆ ئەم سەفەرە ئەو حاڵەتە تەندروستیەیە كە ئەمی تێدایە، پێی گوتم: لەبەرچی دەترسی؟ ئەی وەسیەتم نەكردووی كە لەدوای هەموو نوێژێكدا ئەمە بخوێنی: {حسبي الله لديني، حسبي الله لدنياي، حسبي الله لما أهمني، حسبي الله لمن بغى علي، حسبي الله لمن حسدني، حسبي الله لمن كادني بسوء، حسبي الله عند الموت، حسبي الله عند السؤال، حسبي الله عند الصراط}؟ گوتم: با، گوتی: كەواتە بچۆ، بە نەبوونی تۆ هیچ شتێكی نەخوازراو ڕوونادات!! خوایە! بەڕەحمی خۆت ڕەحمی پێ بكەیت، پاداشتی بدەیتەوە بەباشترین ئەو پاداشتەی باوكێك وەریدەگرێ لەسەر منداڵەكانی و نەوەكانی.

لەهەنـدێ لـەو شـتانەدا کـە دەیهێنینـەوەو باسـیان دەکەیـن نـەك سـاڵێك بەڵکـو چەنـد مانگێـك بـەر لـە وەفـات کردنـی بـووە.

کەواتـە لێـرە ئەمەمـان بۆیـە بـاس کـرد مەبەستمان ئەوەیـە بـۆ هەمـوو لایـەك ڕوون بێتـەوە هـۆکاری کەنارگرتـن و دووره پەرێـز بوونـی لـە کۆمەڵـگاو چالاکیەکانـی کۆمەڵـگا ئـەوە نەبـوو کـە زاکیـرەو فیکـری بێهێـز بووبـێ و وەعـی کۆمەڵایەتـی لەدەسـتدابێ، هیـچ یەکێـك لـەو نیشـانانەی لەسـەر بـەدەر نەکەوتن لـەو ماوەیەی کـە ڕووی کـردە کەنارگرتـن و دووره پەرێـزی لـە خەڵـك.

ئـەی کەواتـە: هـۆکاری ئـەو کەنـار گرتـن و دووره پەرێزییـە لـە (دە) سـاڵی کۆتایـی تەمەنیـدا چـی بـوو؟

پێشـتر گوتـم: ئـەو بێئومێـد بوونـەی لـە چارەسـەر کردنـی میحنەتەکـەی شـێخ حەسـەن حەبنکەلمەیدانـی بـۆی درووسـت بـوو یەکـەم فاکتـەر بـوو بـۆ ئـەوەی دوور بکەوێتـەوە، واتـە: هـاوکاری نەکـردن و هەماهەنگـی نەنوانـدن بـۆ چارەسـەر کردنـی کێشـەکان و سەرخسـتنی هـەق، وایـان لـە باوکـم کـرد دوور بکەوێتـەوە، دوای ئـەو بێهەڵوێسـتیەی کـە ڕوویـدا لـە مەسـەلەی چارەسـەرکردنی میحنەتەکـەی شـێخ حەسـەن حەبەنکـە چ بەهـاو نرخێـك دەمێنێتەوە بـۆ چاوپێکەوتـن و بەیەکگەیشـتنی چالاکیـە کۆمەڵایەتیـەکان.

بەتێپـەڕ بوونـی ڕۆژگارو، بـەدوادا چوونـی زیاتـر بـۆ هۆکارەکانی ئـەم هـاوکاری نەکردنـە، هەسـت و شـعوری کەنـار گرتویـی زیاتـر دەبـوو لـە دەرونیـدا، ئـەو ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ ناڕەحـەت دەبـوو لـەو بوارانـەدا کـە ناوەڕۆکەکانیـان هیـچ سـەنگ و بەهـاو نرخێکـی

لەخـۆ نەگرتـووە، بەداخـەوە ئەمـەش تووشـی زۆرێـك لـە ئەهلـی عیلـم دەبـێ.

ڕەحمەتـی خـوای لێبێ هەسـتی بـەو شـعورە وردەی خـۆی دەکرد کـە زۆرێـك لـەو خەڵکانـەی دەسـتەواژەی وا بـەکار دێنـن پـڕە لـە پێداهەڵگوتـن و بەگـەورە گرتـن و سەرسـامی نوانـدن بـە چاکیـی و بـە زانسـتی زۆری ئـەو قسـانێکی سـەرزارەکی و بـێ بنچینـەو ناوەڕۆکـە، هـەر ئەوەندەیـە کـە لـەلای ئـەون، هەرکاتـێ چوونـە دەرەوە ئـەوکات لـە پێوەرێکـی تـری بۆچـوون و حیسـاباتەکانی خۆیانـی دادەنێـن.

زۆر جـار بـە دەربڕینـی زۆر ئاشـکراو ڕوون، یاخـود بـە بەکارهێنانـی دەسـتەواژەی زۆر قـوڕس و گران ڕووبـەڕوی هەقیقەتی ئـەو قسـانە دەبوویـەوە کـە بریتـی بـوون لـە سـتایش کـردن و پێـدا هەڵگوتنـی ئـەو، لـەو قسـانەی کـە بـەردەوام پێـی دەگوتـن ئەوەبوو: ئێـوە کاتـێ بـەرەو ڕووم دەبنـەوە یاخـود دێنـە مەجلیسـم پێـم دەڵـێ: شـێخ مـەلا، شـێخ مـەلا، بـۆ بەرەکـەت هاتوویـن، مـن دەزانـم کـە قسـەکانی شـێخ مـەلا هیـچ قیمەتێکـی هەقیقـی نیـە لەدەروونـی ئێـوە، مـن لەسـەر زمانـی ئێـوە قوتبـی زەمانـەو وەلـی خـوام لەسـەر زەوی، بـەڵام لـە دەرونتـان وا هەسـت دەکـەن کـە دەروێشـێکم و دەتوانـن بەیـەك دوو وشـان موجامەلـەم بکـەن[1].

---

(١) ئەمـڕۆ مـن هەمـان شـت دەبینم، بەڵام هێـزو توانـای ئـەو دوورە پەرێزیەم نیـە کـە باوکـم ڕووی تێکـرد، لەکاتـی چاوپێکەوتـن و بـەرەو ڕوو بوونـەوە دەستخۆشـی و مـەدح و سـتایش کـردن دەبیسـتم، بەجۆرێـك کـە دبلۆماسـە

زۆر جــار قســەیەكی شـێخ موحەممــەد زەیــن و لعابدینــی ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ دووبـارە دەكـردەوە كـە پێشـتر بـە باوكمـی گوتبـوو ئـەو جـۆرە كەسـانە بـێ هـۆش و بێئـاگام دەكـەن بـەوەی ئەوەنــدە مــەدح و ستایشــم بكــەن پاشــان دەبینــم تەنیــا یــەك مەبەسـتیان هەبـووە لـەو كارە ئەویـش بریتیـی بـووە لـەوەی بمكـەن بــە پردێــك بــۆ گەیشــتن بــە بەرژەوەنــدی و ئارەزووەكانیــان.

لەســەر ئــەو كارەش بەڵگــەی زۆری هەبـوو، لـە زۆر دانیشـتنان مەسـەلەیەك خراوەتـە ڕوو بـۆ گفتوگـۆو قسـە لەسـەر كـردن پاشـان بەڕواڵـەت گەیشـتوونەتە ڕێككەوتـن لەسـەری، هێشـتا مەجلیسـەكە تێـك نەچـووە پێچەوانـەی ئـەوەی لەسـەری ڕێككەوتـون بەدیـار كەوتــووە، بۆیــە جــاری وابــووە لــە مەجلیســێك ڕێككەوتــن ڕوویــداوە لەســەر مەســەلەیەك، بــەڵام ئــەو ڕێككەوتنــە هــەر بەڕواڵــەت بــووە كەســانێك لەنــاو مەجلیســەكەدا لــە پەنهــان و لەناخیانــدا پێچەوانــەی ئــەوەی تێــدا بــووە كــە ئیتیفاقــی لەســەر كــراوە، كەواتــە: ئــەو هەمــوو كاتژمێــر بەدواداچــوون و گفتوگۆیــە هەمــووی بــەدەم بــاوە چــووە!

یەكـێ لـە تایبەتمەندیەكانـی سرووشـتی باوكـم ئەوەبـوو ڕقـی لەو بـوارە زیادانـە دەبـۆوە، هەروەهـا ڕقـی بـوو لـە بەكارهێنانـی قسـەی

---

جیهانیـەكان بـەم شـێوەیە ناتوانـن ئـەو دەسـتەواژە بـێ ناوەڕۆكانـە دابڕێـژن، هـەر كاتێكیـش چاوپێكەوتنەكـە كۆتایـی دێـت، پێچەوانـەی ئـەو قسـانە دێنـە گـۆڕێ، لەشـوێنی ئـەو مـەدح و پێداهەڵگوتنـە وشـەی بریندارکـەرو ڕەخنـەی ڕوخێنـەر بەزمانێكـی ئاسـن دەردەبڕدرێـن، تۆمـەت دەبەخشـێتەوەو ئاڕاسـتەم دەكات بـێ هیـچ پاساوو پێوەرێــك.

بریـق و بـاق و ڕازاوە بـۆ مـەدح کـردن و بەگـەورە گرتنـی بەرامبـەر، هەتتـا ئەگـەر ئـەو قسـانە لـە هەسـت و شـعورێکی ڕاسـتگۆیانەی ناخیشـەوە دەرچووبـن، ئـەی دەبـێ هەڵوێسـتی چـۆن بووبـێ ئەگـەر زانیبێتـی نـەك هـەر لـەدڵ و دەروونـەوە دەرناچـن بەڵکـو تەنهـا چەنـد لەفزێکـن بـۆ گـەرم کـردن و خـۆش کردنـی مەجلیسـەکە بەکاردێـن؟

ئەمـە ئـەو هـۆکارە بـوو کـە هەسـت و شـعوری دوورە پەرێـزی و کەنـار گرتویـی لـە چاوپێکەوتـن و چاڵاکیـە کۆمەڵایەتیەکانـی لـە (باوکـم)دا چانـد، قسـانێك کـە تەنیـا لەسـەر بناغـەی مـەدح و ستایشـی (دبلۆماسـیانە)ی پـڕو پـوچ بونیـات نـراوە، ئـەو پاسـاوەی کـە بـووە هـۆی ئـەوەی واز لـە کـۆڕو کۆبوونـەوەکان بێنـێ ئەوەبـوو کـە: یـان دەبـوو ئـەو مـەدح و ستایشـە بـێ بنەمایانـە قەبـوڵ بـکات و ئەمیـش لەبەرامبـەردا هەمـان دەسـتەواژە بـەکار بهێنێتـەوە، ئـەم کارەش بەبۆچوونـی ئـەو جۆرێکـە لـە نواندنێکـی بـێ ئەرزشـانەو بـەلای نیفـاق و دوڕوییـدا دەچـێ، یانیـش دەبـێ ئـەو دەمامکـەی ئـەوان لاببـاو بەشـێوەی ڕاسـتەقینەی خۆیـان مامەڵەیـان لەگەڵـدا بـکات، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی دروسـت کردنـی فیتنـەو ڕق و کینەیـەك کـە هیـچ خێرێکـی پێـوە نیـە، تاکـە چارەسـەر لـە حاڵێکـی لـەم شـێوەیەدا خـۆدوور گرتنـە لـە هەمـوو ئـەو چاوپێکەوتـن و چاڵاکیانـە.

بـەڵام ئـەو کەنارگرتـن و دوورە پەرێزییـەی کـە باوکـم سـەپاندیە سـەر خـۆی لەیـەك لایەنـەوە بـوو، هیـچ گومانـی تێـدا نییـە

بەهیـچ شـێوەیەك دەرگای دانەدەخسـت بـەڕووی ئـەو كەسـانەی دەیانویسـت بێنـە خزمەتـی یاخـود بـۆ پێویسـتیەك بێنـە لای، تەنهـا ئـەو كاتانـە نەبـێ كـە سـەرقاڵی خـۆی بووبـێ، بـۆ وێنـە: وەك كاتەكانـی نێـوان مەغریـب و عیشـا، لـەو كاتـەدا قسـەی لەگـەڵ كـەس نەدەكـرد، ڕێـی بەكەسـیش نـەدەدا بەهیـچ جـۆرە قسـەیەك سـەرقاڵی بـكات، بەهەمـان شـێوە كاتـی دوای نوێـژی عیشـاش مەگـەر بـۆ زەرورەتێـك یاخـود پێویسـتییەكی ئاینـی.

جگـە لـەم دوو كاتـە، لـە كاتەكانـی پشـوودانی و دانیشـتنیدا پێشـوازی لەهـەر كەسـێك دەكـرد كـە بهاتایەتـە لای، بـەڵام زۆربـەی كات بێدەنگـی هەڵدەبـژاردو تەنهـا گوێـی دەگـرت، بەتایبـەت ئـەو كاتانـەی كـە دانیشـتووانی مەجلیسـەكەی خەریكـی باسـكردنی بابەتێكـی دونیایـی بـوان، ئـەو كاتانـە خـۆی سـەرقاڵ دەكـردو خەریكـی زیكـرو تەسـبیحات دەبـوو، بـەڵام ئەگـەر باسـە دونیاییەكـە درێـژ بووبایـەوە یاخـود غەیبەتـی تێبكەوتایـە قسـەكانی پـێ دەبڕیـن، ئـەو كاتـە زۆر بـە گـەرم و گـوڕی دەسـتی دەكـرد بـە قسـە كـردن و ئامـۆژگاری كـردن و بیـر خسـتنەوە، ئـاگاداری دەكردنـەوە لـە گەورەیـی بەهـای كات، كـە نابـێ ئینسـان وا بـە ئاسـانی بەزایـەی بـدات، چونكـە كات تاكـە سـەرمایەی هـەر یەكێكـە لـەم ژیانـی دونیایـەدا.

بەهەرحـاڵ ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ ڕێگـەی بەكـەس نـەدەدا ئەو بخاتـە نێـو بـاس و خواسـی كێشـەیەكی كۆمەڵایەتـی، هەروەهـا ڕێگـەی نـەدەدا بیخەنـە نێـو بـاس و خواسـێك بـە پاسـاوی

چارەســەری كێشــەیەك كــە ڕاجیایــی درووســت دەكات لەنێــو چیـن و توێژەكانـی كۆمەڵـگا، یاخـود ڕاجیایـی درووسـت دەكات لەنێـوان خزمـان و نزیـكان، ئەگـەر یەكـێ هەوڵێكـی لـەم شـێوەیەی بدابووایــە، ئــەوا هــەر زوو وەرس بــوون و تــوڕە بوونــی لەســەر بــەدەر دەكــەوت و دەیگــوت:

فـلان كـەس! عەقڵـم بەشـی چارەسـەر كردنـی كێشـەكانی خـۆم و كارەكانـی خـۆم و چارەنووسـی خـۆم نـاكات، ڕەحمەتـی خـوات لێبـێ وازم لێبێنـە لـەوەی كـە خـۆم تێیـدام، بـڕۆ بـەدوای پیاوێكـی دیكـەدا بگـەرێ بـۆ چارەسـەری ئـەو كێشـانەی باسـی دەكـەی.

ئەگـەر باسـی مەسـەلەیەكی زانسـتیش بكرایـە بابەتەكـە ببوایەتـە جێگـەی موجادەلـەو ڕاجیایـی نێـوان خەڵـك، هەرچەنـدە بـواری هەڵهێنجانــی تێدابووایــە خــۆی دەپاراســت لــەوەی قســەی لــێ بــكات، بــۆ ئــەوەی پارێــزگاری لــە دووره پەرێزیەكــەی خــۆی بـكات تێكـەڵ نەدەبـوو، بەپێویسـتی دەزانـی دوور بكەوێتـەوە لـە قیـل و قـال.

بیــرم دێ كــە هاوڕێــی كــۆچ كردوومــان دكتــۆر (مەحمــود نەحــلاوی) ڕەحمەتــی خــوای لێبــێ زۆر نزیــك بــوو لــە باوكــم، زۆر باوكمــی خــۆش دەویســت بڕیاریــدا لــە ماڵەكــەی خۆیــدا ئاهەنگێكــی زۆر تایبــەت بەبۆنــەی لەدایــك بوونــی پێغەمبــەری خــوا ﷺ ســاز بـكات، ئـارەزووی خـۆی پێشـاندا لـە ئاهەنگەكـەدا وتارێكـی كاریگـەر پێشـكەش بكـرێ، ئـەوەی بـە خەیاڵـدا هـات هەمـوو ئاهەنگەكـە تۆمـار بـكات بـە ڤیدیـۆ بـۆ ئـەوەی زۆرتریـن

كەس سوود لە خێرو بێری ئاهەنگەكە ببینن، داوای لەمن كرد بۆ ئەمە مۆڵەت لە باوكم وەربگرم، باوكیشم ڕەحمەتی خوای لێبێ لەو سەرو بەندەدا بەو قۆناغەدا تێدەپەڕی كە لەسەرەوە ئاماژەم پێكرد، كاتێ داوای مۆڵەتم لێ كرد پێی گوتم:

ڕۆڵەكەم! ئەوەی تۆ لەبارەیەوە قسەم لەگەڵ دەكەی (مەبەستی تۆماری ڤیدیۆییە)، شتێكی نوێیەو زانیاریم لەسەری نیە، وای لێ كردووم هەڵوەستەی لەبارەوە بكەم، ئەمەش ڕێگریم لێ دەكات حوكمێكی یەكلاكەرەوە لەبارەیەوە بدەم، چارەسەری ئەو كێشانە ئەوەیە كۆمەڵێك لە فوقەهای شارەزاو بەرچاو ڕوون هاوكاری یەكتر بكەن سەبارەت بە هەقیقەتی ئەو ئامێرەو كاركردنی، با ئەو كۆمەڵە فوقەهایە تەماشای كارەكە بكەن و هەڵهێنجانی تێدا بكەن، پاشان ئەو بڕیارە بدەن كە خوای پەروەردگار تێیدا ڕێنماییان دەكات، بەڵام سەبارەت بەمن لەوەی تێیدام لێمگەڕێ، با خەریكی خۆم بم.

بەڵام لەبارەی ئەو حوكمانەی كە دەرفەتی بەدواداچوون و هەڵهێنجانیان نییە، بۆ هیچ كەسێك ڕێگە پێدراو نیە بە ئارەزووی خۆی یاریان پێ بكات، ئەگەر شتێكی لەو جۆرە ببوایە ئەوا هەموو ئەوەی لەتوانایدایە خەرجی دەكرد لەپێناوی بەیان كردنی هەق، لەبەردەم ئەو كەسانە دەوەستایەوە كە دەیانەوێ یاری بەو مەسەلە جێگیرانە بكەن، تەنانەت ئەگەر كارەكە پێویستی بكردایە لە كەنارگرتویی و دووره پەرێزیەكشی دەردەهات، بەسەرهاتی نووسینی ئەو دوو مەقالەیەی پێشتر

باسـم کـردو پاڵنەرەکانـی بـڵاو کردنەوەیـان، لەهەمـان ئـەو قۆناغـی دوورەپەرێـزی و کەنـار گرتوییــە، نموونەیەکـە لەســەر ئەمــە.

لەســاڵانی گۆشــەگیریەکەیدا زۆرجــار باســی لــەوە دەکـرد کـە زۆر پەشــیمانە بـۆ ئـەو هەمـوو ســاڵانەی بەبــێ ســوود لــە قســەو قســەڵۆکی زیـاد بەڕێـی کـردوو، وای دەبینـی ئـەو ڕۆژانــە ڕۆژانــی بەزایـە دان بـوون بـێ ســوود لەتەمەنــی ڕۆیشــتن.

ئێمـەش پێـمان دەگـوت: بەڵکـو ئینشـائەڵڵا ئەزموونـی بـەرەو خوا چوونـت بـووەو ڕێگایـەك بـووە لـە ڕێگاکانـی هـەوڵ و تێکۆشـان، هەرچـی چارەنووسـی کردەوەکانیشـە بەگوێـرەی ئـەو نیەتانەیـە کـە دەبنـە پاڵنـەری ئەنجامدانـی.

## قۆناغەکانی نەخۆش کەوتن و...
## پاشان وەفات کردنی

ژیانی باوکم لە هەموو ئەو قۆناغانەی کە پێشتر باسم کرد پڕ بوو لە زیندووێتی و چوست و چالاکی، پڕ بوو لە تەندروستی و لەش ساغی، جگە لە کاتەکانی سەرەتای نیشتەجێ بوونی لە دیمەشق، وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، سێ بۆ چوار ڕۆژ لە مانگێکدا تووشی ژانە سەر دەبوو، وەك هەندێ لە پزیشکان پێیان ڕاگەیاندبوو هۆکاری ژانە سەرەکە جۆرێك بوو لە ڕۆماتیزمی ئەعساب، ئەم حاڵەتە لەو کاتەوە دەستی پێ کرد کە لەدیمەشق نیشتەجێ بوو، نزیکەی بیست ساڵی خایاند.

سەرەڕای ئەوەی یەکێك لە پزیشکەکان بڕیاری یەکلاکەرەوەی دا لەبارەی ئەوەی کە نەخۆشیەکەی چاك نابێتەوەو تا مردن لەگەڵی بەردەوام دەبێت، کەچی لەپڕێکدا نەخۆشیەکە وون بوو نەما، دوای ئەو ماوە دوورو درێژە هیچ شوێنەوارێکیشی نەما.

### سەرەتای نەخۆشیەکەی:

لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٨٢) دوای تێپەڕاندنی شەوێکی ناخۆش کە خۆزگەی پێ ناخوازرێ، تووشی تاو لەرزێك بوو هۆکارەکەشی نەزانراو بوو، وەك نەریتی خۆی لەجێگاکەی

هەڵسایەوە بۆ ئەوەی بڕوا، بەڵام هاوسەنگی خۆی لەدەستداو بەلادا دەچوو، هەوڵیدا بۆ ئەوەی چەند هەنگاوێك بهاوێ، بەڵام لەو ڕێگایەی کە بەرەو گەرماوەکە دەچوو بەربۆوە.

دواتر بۆمان دەرکەوت ئەگەر لەبەر پیری و بەساڵاچوونی نەبێ ئەو نەخۆشیەی تووشی بووە زۆر سووك و ئاسانترە لەوەی ئاوای لێبکات و بیگەیەنێتە ئەو ئاستە، ئەو کات تەمەنی وەك خۆی پێی ڕادەگەیاندین و بەگوێرەی ئەو بەڵگانەش کە پشتی پێ دەبەستا خۆی لە نەوەد ساڵ دەدا، دکتۆرەکان ئەو ڕۆژە بۆیان ڕوون کردینەوە ئەو حاڵەتەی کە لەپڕێکدا تووشی بووە بەهۆی کاریگەری جۆرە میکرۆبێکی توندە، بەڵام ئەوەی وای لێکردووە ئاوا بێهێزی بکات تەمەنەکەیەتی، هێزی بەرگری لەشی کەم بووە بەهۆی تەمەنی زۆری، هەر ئەمەش هۆکاری بەربوونەوەکەی بووە، بۆ ماوەی چەند سەعاتێك لەو پەڕی بێهێزیدا بوو، ئەوەی زیاتر بێتاقەتی کردو هێزی بەرگری لەشی کەم کرد نەمانی ئارەزووی بوو بۆ خواردن، ئەم بارودۆخە چەند ڕۆژێك لەگەڵیدا مایەوە.

بەهۆی ئەو بارودۆخەو تێکچونی باری تەندروستیەکەی ماوەی مانگێك لەسەر جێگاکەی کەوت، خوای پەروەردگار یارمەتی دام لەماوەی ئەو مانگەدا بەشەوو ڕۆژ لە خزمەتیدابم، دوای ئەو مانگە وردە وردە بەرەو چاکبوونەوە چوو، دوای ئەو ماوە زۆرە دابڕانە لە مزگەوت و خەڵکەکەی، بۆ یەکەم جار لەماڵ هاتە دەر بۆ ئەوەی بچێ بۆ مزگەوت، نوێژخوێنانی مزگەوت بەهاتنەوەی

باوكـم زۆر كاريگـەر بـوون، لەگـەڵ گەڕانـەوەی باوكـم دەنگـی گريان و هـاوارو دوعايـان لـێ بـەرز بـۆوە.

لەوانەيـە شـتێكی بـاش بێـت ئەگـەر ئـەو هەواڵـەی تريـش بـاس بكەيـن كـە هـەر پەيوەنـدی بـە ڕووداوەكانـی نەخۆشـيەكەيەوە هەيە:

مـن تـازە چوبوومـە ئـەو خانـووەی نزيـك خانووەكـەی باوكـم، خـوای پـەروەردگار سـينەی كردمـەوەو ئـەوەی خسـتە دڵـم لەڕێگـەی ئاهەنگێـك و كۆكردنـەوەی خەڵكێـك بـۆ خوێندنـەوەی يـادی لەدايـك بوونـی پێغەمبـەر ﷺ تەعبيـر لـە شـوكرانە بژێـری و سوپاسـگوزاری بكـەم، بەيارمەتـی خـوای پـەروەردگار كارەكـەم ئەنجامـدا، خانـووە بچووكەكـەم بـە كۆمەڵـە خەڵكێكـی موبـارەك پـڕ ببـوو، سـتايش و پێـدا هەڵگوتـن بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەماڵەكەمانـدا دەنگـی دەدايـەوە، خـوای پـەروەردگار سـينەی فـراوان كـردم لەگـەڵ سروودبێـژەكان بـە پێداهەڵگوتنێـك بـەژداری بكـەم كـە پێشـتريش لـە مەولـودی شـێخ نەبهانـی ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ خوێندبوومـەوە.

وا ڕێككـەوت هەمـان ئـەو شـەوە باوكـم تووشـی ئـەو تـاو لـەرزو نەخۆشـيە بـێ كـە تـازە باسـم كـرد، بـۆ بەيانيەكـەش كەوتـە سـەر زەوی، كاتێـك هەواڵەكـەم زانـی تووشـی شـۆك بـووم، بەتەنيا وەسـتام و هانـام بـۆ خـوای گـەورە بـرد، لێـی پاڕامـەوە كـە ئـەو ئاهەنگـەی بەمەبەسـتی دڵخـۆش بـوون بـە لەدايـك بوونـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە ماڵەكـەی خۆمـدا سـازم كـرد ئەگـەر بـە فـەزڵ و گەورەيـی خـۆی قەبوڵـی فەرمـووە ئـەوا بيكاتـە مايـەی شـيفای باوكـم لـەو نەخۆشـيە.

دواتریــش زانیمــەوە كــە موحەممــەد تۆفیقــی كوڕیشــم هەنــدێ صەدەقــەو خێــری كــردووە بەئومێــدی چــاك بوونــەوەی باوكــم، وە زەینەبــی خوشكیشــم كــە لــە خێزانــی دووەمــی باوكــم بــوو نــەزری كردبــوو چەنــد ڕۆژێــك بــەڕۆژوو بــێ ئەگــەر باوكــم چــاك بێتــەوە، هەمــوو تاكەكانــی دیكــەی خێزانەكەمــان هەریەكەیــان شــتێكی كردبــوو بــە نیەتــی ئــەوەی خــوای پــەروەردگار شــیفای بــدات.

باوكــم لــە ڕۆژانــی نەخۆشــیەكەی هەواڵــی پێدایــن لەخەویــدا لەبەرانبــەر خۆیــەوە چەنــد دەفرێكــی جوانــی بینیــوە لەتەنیشــت یەكــەوە ڕیــز كــراون و زانیویەتــی كــە دەرمانــی تێدایــە بــۆ چارەســەر كردنــی نەخۆشــیەكەی، یەكــێ هاتــووەو پێــی گوتــووە: ئەمەیــان لەلایــەن تۆفیقــەوە بۆتــۆ كراوەتــە خــەڵات، ئەوەیــان لەلایــەن زەینەبــەوە، ئەوەیــان لەلایــەن فلانــەوە، ....هتــد، پاشــان گوتــی: لەنێــو هەمــوو دەفرەكانــدا ئامــاژە بــە گەورەتریــن و جوانترینیان كــرا گوتیان: ئەمەشــیان خەڵاتــی كوڕەكــەت موحەممــەد ســەعیدە بۆتــۆ.

زۆر دڵخــۆش بــووم بــەو خەونــەی باوكــم ڕەحمەتــی خــوای لێبێ، لەبــەر چەنــد هۆكارێــك: لەهەمــوو هــۆكارەكان گرنگــتر ئەوەبــوو كــە یەقیــن و دڵگوشــادیم زیاتــر بــوو بــەوەی كۆبوونــەوە لەبــەر یــادی لەدایــك بوونــی پێغەمبــەر ﷺو صەڵــەوات دان و ســتایش كردنــی كارێكــی موبارەكــە لــەلای خــوای پــەروەردگارو ئینســان پاداشــتی لەســەر وەردەگــرێ، تەبعــەن ئەگــەر ئــەو كەســە نیەتەكــەی بــۆ خــوا بێــت و ویســت و مەبەســتێكی پــاك و خاوێنــی هەبــێ، هەروەهــا ئاهەنگەكــە خاڵــی بــێ لــە قەدەغــە كــراوەكان، ئەوەنــدە ســوودە

بەسسـە كـە دەبێتـە هۆكارێكـی پاڵنـەر بـۆ ئەوانـەی لە دانیشـتنەكەن خـوای پـەروەردگارو پێغەمبەرەكەیـان ﷺ زیاتـر خـۆش بـوێ.

بـەم شـێوەیە خـوای پـەروەردگار منەتـی ئـەوەی لەسـەر كردیـن باوكـم چـاك بوویـەوەو دووبـارە گەڕایـەوە ژوورە بچوكەكـەی كـە تەرخانـی كردبـوو بـۆ عیبادەتـی تاكـە كەسـی و پێشـوازی كـردن لـە میوانـان، هەروەهـا گەڕایـەوە سـەر گوتنـەوەی كتێبـی ئیحیـای ئیـمام غەزالـی.

خــوای پــەروەردگار ویســتی وابــوو لــەو ماوەیــە كۆمەڵێــك گەنجـی گــەڕەك پابەنــدی خۆیــان بــە فەرمانەكانــی خــوای پـەروەرگار ڕاگەیانـد دوای ماوەیەكـی دورو درێـژ لـە بـێ فەرمانـی و سـەرگەردانی، بـەم بۆنەیـەوە دانیشـتنێكیان بـۆ سـاز كـرا لـە ماڵـی باوكـم، خەڵكێكـی زۆری گەڕەكیـش بـەژداری دانیشـتنەكەیان كـرد، هەمـووان دڵخـۆش بـوون بـە دوو نیعمـەت: یەكەمیـان چـاك بوونـەوەی باوكـم، دووەمیـان: هیدایەتـی ئـەو كۆمەڵـە گەنجـە، دواتـر مەولودێـك خوێنرایـەوە، سروودبێـژان بـە ئـاوازی خـۆش و شـیعرەكانیان مەجلیسـەكەیان پـڕ كـرد لـە سـوپاس و ستایشـی خـوای پـەروەردگارو پێداهەڵگوتنـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، پاشـان باوكـم بـە هەندێـك ئامـۆژگاری پـاك و بێگـەرد بـۆ ئامادەبـووان كـە كاریگەریەكـی زۆری لەسـەر درووسـت كـردن، كۆتایـی بـە دانیشـتنەكە هێنـا.

ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ لەسـەر ئـەو حاڵـەی بـەردەوام بـوو تـا سـەرەتاكانی سـاڵی (١٩٨٩)، یاخـود وابزانـم كۆتاییەكانـی

ســاڵی (١٩٨٨)، بەتەندروسـتیەکی چـاك، بەچوسـت و چاڵاکیـەوە نوێژەکانــی بەکۆمـەڵ ئەنجـام دەدا، دەرسـە هەفتانەکانیشــی هــەر بــەردەوام بــوو لــە مزگــەوت.

لــە کۆتایــی ئــەو مێــژووەو لــە مانگــی ڕەمەزانــی پیــرۆز، تــووشــی وشــکبوونــەوەیەك (تجفاف)ێکــی گــەورە بــوو بەهــۆی بەڕۆژوبوونــەوە، ئــەوەی لەیــادم مابــێ ڕەمەزانەکــە کەوتبــووە نێــو گەرمایەکـی زۆرەوە، دوای وشـك بوونەوەکەش تووشـی نەخۆشـیەك بــوو بەهــۆی نەخۆشـیەکەش ماوەیــەك لەســەر جێــگا کــەوت.

تــازە کەمێــك چــاك بووبویــەوە بەهــۆی شــوێنەواری ئــەو دەرمانانــەی بــەکاری هێنابــوون تووشــی ئیلتیهابێــك بــوو لــە گــەدەی، هــاوکات تووشــی کۆمەڵێـك ژان و ئازاریـش بـوو، لـەو کاتــەوە ئــەو ژانانــە هەنــدێ جــار نــوێ دەبونــەوەو هەنــدێ جــار نەدەمــان، چەنــد ڕۆژێـك لـەش ســاغی بــۆ دەگەڕایــەوە دووبــارە دەچوویــەوە بــۆ مزگــەوت، دەگەڕایــەوە ســەر دەرس گوتنەوەکانــی، پاشــان هێنــدەی پێنەچــوو نەخۆشــیەکی دیکــەی تــوش بــوو، هــۆکاری ســەرەکی ئــەو نەخۆشـیەش ئــەو وشـکی و تیجفافـە بـوو کــە بەهــۆی بەڕۆژوبوونــەوە تووشــی بووبــو، جگــە لــەم هــۆکارە هـۆکاری تریـش هەبـوون کـە بریتـی بوون لـە ئاسـەوارو شـوێنەوارە خراپەکانــی ئــەو دەرمانانــەی بــەکاری دەهێنــان.

لـە هاوینـی سـاڵی (١٩٨٩) حاڵـی بـاش بـوو، مـاوەی مانگێکـی لـە (بلـودان) بەسـەر بـرد لەماڵـی هاوڕێیەکـی، دوای نەخۆشـییەکە ماوەیەکـی لـە پشـوو بەسـەر بـرد، لـەو ماوەیـەدا وەزیفـە ئایینیەکانی

بەڕێکی ئەدا دەکرد، هەروەها پارێزگاری لە خوێندنەوەی زیکرو وێردەکان دەکرد، ئەمە سەرەڕای خوێندنەوەی جوزمەکانی قورئان ئەوەندەی کە بۆی دەکرا دەیخوێندنەوە، ئەو دەترسا لەوەی بەشێك یا هەندێك لە قورئان لەبیر بکات کە لەبەری بوو، بەهۆی ئەو حاڵەت و بارو دۆخە تەندروستیەی هەیبوو.

لەهاوینی ئەو ساڵە، پێداگیری کرد لەسەر ئەوەی وەڵامی بانگهێشتنامەی جەزائیرییەکان بدەمەوە بۆ کۆبوونەوەی کۆڕبەندی فیکری ئیسلامیی، دوای ئەوەی پێشتر داوای لێبوردنم کردبوو لەوەرگرتنی ئەو ئەرکەی کە پێیان سپاردبووم وەك پێشتر ئاماژەم پێدا.

بەڵام ئەم ژان و نەخۆشیە یەك لەدوای یەکانەی کە هەیبوو دوای ماوەیەکی کەم دووبارە بۆی گەڕایەوە، بەبەردەوامی زۆرو کەم بەدەستیەوە دەیناڵاند، تا ئەو کاتەی مردنی پێگەیشت لە ڕۆژی سێ شەممەی ٢٠ی شەوالی ساڵی ١٤١٠ك.

بەڵام ئەوەی شایانی باس کردنە تا ئەو بەیانیەش کە وەفاتی کرد لەدەست و پێ نەکەوتبوو بەجۆرێك کە جوڵەی پێ نەکرێ و لەسەر جێگا بکەوێ، لە بەیانی ئەو ڕۆژەدا وەك نەریتی خۆی پێش نوێژی بەیانی دەستنوێژی شووشت گەڕایەوە ژورەکەی خۆی، ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بوو نوێژی کرد، پاشان وەك هەموو ڕۆژەکانی تری نوێژی بەیانیشی کرد.

**هۆشیار بوونی بەبەردەوامیی لەکاتی نەخۆشییەکەشی:**

باوكـم كۆتـا سـاڵی ژیانـی، بەگوێـرەی ئـەو بەدواداچوونانـەی خـۆی ئەنجامـی دابـوو تەمەنـی گەیشـتە سـەدو چـوار سـاڵ، سـوپاس بۆخـوای بـەرزو مـەزن لەوپـەڕی هۆشـیاریدا بـوو، توانای تـەواوی بەسـەر هەڵـس و كەوتـە عەقڵییەكانی خۆیـدا هەبـوو، لـەو تەمەنـە زۆرەشـیدا زۆر وردو دەقیـق بـوو لـە لێكدانـەوەی شـتەكان، لەبەشـەكانی پێشـوو چەنـد نموونەیەكـم هێنایـەوە لەسـەر ئەمـە، ئـەو نەخۆشـیەی كـە نزیكـەی سـاڵێك و بیسـت ڕۆژ لەگەڵیـدا بـوو بەهیـچ شـێوەیەك ئـەو بـارو دۆخـەی ئـەوی نەگـۆڕی.

جـاری وا بـووە بۆنـەو موناسـەبەیەك هاتۆتـە پێـش، بەهـۆی ئـەو بۆنەیـەوە دەورو بەرەكـەی بابەتێكـی فیقهیـان وروژانـدووە، یـان پرسـیارێكی فیقهیـان لـێ كـردووە كـە پەیوەنـدی بـەو بۆنـەو پێشـهاتانەوە بـووە، ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ بـە بیـرو هـۆش و زاكیرەیەكـی زۆر بـاش، بـەو پـەڕی وردیـی وەڵامـی داونەتـەوە.

جاروبـار هەنـدێ هەڵوێسـتی لەمـلاو ئـەولا پێدەگەیشـت، كـە بەبـڕوای ئـەو، ئـەو هەڵوێسـتانە لەگـەڵ تـەرازوی شـەرع و حوكمەكانـی نەگونجـاون، وەك ئـەو هەڵوێسـتەی هەنـدێ كـەس نواندیـان بەرامبـەر بـە بـەژداری كردنـی مـن لەگـەڵ دكتـۆر تیزینـی لـە دیبەیتێـك بەناوونیشـانی فەلسـەفەی مـاددی و تـوراس، بـەو پـەڕی وردی لـە بەڵگـەو، ڕەوانبێـژی لـە دەربڕیـن، وەڵامـی ڕەخنەكانـی دانـەوە وەك پێشـتریش ئامـاژەم پێـدا.

لەکاتی نەخۆشیەکەشدا زۆر بەوردی سوننەتەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ جێبەجێ دەکرد، لەو کاتەی ئێمە لەدەوری بووین و خزمەتمان دەکرد، بۆ نموونە جاری وا هەبوو یەکێ لە ئەندامانی خێزانەکەمان من یان تۆفیقی کوڕم لەلای دادەنیشتین بۆ ئەوەی گۆریەی لەپێ بکەین لەبیرمان دەکرد ئادابەکانی سوننەت جێبەجێ بکەین سەرەتا دەمانویست لەپێی چەپەی بکەین نەك ڕاستە، هاواری دەکرد: ڕاستە، ڕاستە، هەندێ جار ئەگەر ئەو لەبیر کردنەی ئێمە دووبارە بایەوە بەتوڕەییەوە دەیگوت: ڕاستە، ڕاستە.

دکتۆر مەحمود نەحلاوی ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەو کاتانەی باوکم نەخۆش بوو زۆر سەردانی باوکمی دەکرد، یەکێك بوو لەو کەسانەش کە زۆر بەگەرم و گوڕیەوە ئامادەی دەرسەکانی باوکم دەبوو، جارێك لەو جارانە دەستپێشخەری کرد بۆ ئەوەی یارمەتی باوکم بدات بۆ هەڵسانەوە گوتی: (یا رسول الله)، باوکم پێی گوت: بڵێ: یا الله!

بەو بۆنەیەوە دەمەوێ سەرنجتان ڕابکێشم لەسەر ئەوەی باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ تەوەسسول کردن بە پێغەمبەری خوای ﷺ پێ باشتر بوو لە هاوار بۆ بردنی، تەوەسسول قسە کردن و پاڕانەوەیە لە خوا، بەڵام هاوار بۆ بردن جیاوازەو باش نیە، چونکە هاوار بۆ بردن لێ پاڕانەوە دەگەیەنێ بە پێچەوانەی تەوەسسول، ئەمەش جۆرێکە لە بێئەدەبی بەرامبەر بەخوا، چونکە واجبە تەنها داوا لەخوا بکرێ، هەرچەندە

نەیدەگـوت: هــاوار بــردن بــۆ پێغەمبــەر ﷺ حەرامــە، بــەڵام وەك گوتـم: تەوەسسـولی پـێ باشـتر بـوو نـەك هانـاو هـاوار بـۆ بـردن، هەمـوو ئـەو قسـانەی کـردم ئـەو کاتـە بەبیـرو هۆشـی داهـات، کـە دکتـۆر مەحمـود دەستپێشـخەری کـرد بـۆ ئـەوەی یارمەتـی باوکـم بـدات و هەڵیسـێنێتەوە.

جارێکیــان دکتــۆر نەحــلاوی بــووە ئیمامــی باوکــم، باوکــم لــە ساڵەکانی کۆتایـی تەمەنیـدا پێـش نوێـژی نەدەکـرد، دوای ئـەوەی لــە نوێژەکەیــان بوونــەوە، ئــاگاداری دکتــۆر نەحــلاوی کــردەوە زیاتـر وردو بەدیقـەت بـێ لـە جێبەجـێ کردنـی ئادابەکانـی نوێـژ، ڕەخنــەی لێگــرت لەســەر ئــەوەی هەنــدێ لــەو ئادابانــەی نوێــژ کردنـی پشـتگوێ خسـتووە، یاخـود هەندێکیانـی لەبیـر کـرد.

**وەرچەرخانێکی ویژدانی بەرەو خوا:**

تاکـە شـتێك کـە باوکمـی بەسـەر نەخۆشـیەکەیدا زاڵ کردبـوو، تـەواو وەرچەرخانـی بـوو لـەڕووی فیکرو هەسـت و شـعورو هەڵس و کەوتەکانـی بـەرەو خـوای بـەرزو مـەزن، ئـەو وەرچەرخانـەش ڕەنگـی دابـۆوە لـە سرووشـت و وجـودی ئـەوداو سـەری خسـتبوو بەسـەر نەخۆشـیەکەیدا، ئـەو هەسـت و شـعورە ئیمانییـە زۆر بەسـەر ئــەو هەســت و شــعورە کەوتبــوو کــە نەخــۆش بەهــۆی ئێــش و ئــازارەوە بــۆی دروســت دەبــێ، هــەر یەکێــك لــە ئەندامانــی خێزانەکەمــان، یاخــود ئەوانــەی دەهاتــن بــۆ ســەردانیکردنی، سـەیری باوکمیـان بکردایـە دەیانبینـی لـە حاڵەتـی زیکـرو تێفکریـن و هەسـت کردنـە بـە لەگەڵدابوونـی خـوا.

زۆر جـار ئەگـەر یەكێكـمان پێویسـتی بكردایـە لەبـارەی هەنـدێ كارو بـاری دونیـا قسـەی لەگـەڵ بكردایـە سەرزەنشـتی دەكـردو دەیگـوت: مـن هەمـوو ژیانـی ڕابـردووی خـۆم لەهـەوڵ و تێكۆشـان دابـووم بـۆ ئـەوەی لـە كۆتاییەكانـی تەمەنمـدا خـۆم دابماڵـم لەهەمـوو شـتێكی دیكـەی غەیـری خـواو، لەگـەڵ خوادابـم، ئەوەی بەسـەرم بـرد بەسـەرم بـرد، گەنجێتیـم، ڕۆژەكانـی تەمەنـم، لەپێنـاوی ئـەو كاتانـەی كۆتایـی ژیانـم بـوو، ئێسـتا بۆچـی لـەو كاتانـەی كۆتایـی تەمەنمـدا سـەرقاڵم دەكـەن لەخـوای گـەورە؟

لـەو كۆتاییانـەی تەمەنیـدا دوای بەجێگەیاندنـی واجباتـەكان و ئەنجامدانـی زیكـرو ویـردەكان و خوێندنـەوەی قوڕئـان، بەتـام و چێژتریـن سـاتەكانی دوای ئـەو شـتانە گـوێ گرتنـی بـوو لـە هەنـدێ سروودو ئـاوازی خـۆش و قەسـیدەی ڕووحـی، بەهـۆی ئامێرێكـی تەسـجیل بەدەنگـی (عەبدولڕەئـوف حەلـلاق)، یاخـود (موحەممـەد ئەدیـب دایـخ)، زۆر دڵـی خـۆش دەبـوو بەگوێگرتـن لـەم دوانـە، تـام و چێـژی ڕوحـی زۆری لـەو قەسـیدەو سروودانـە دەبینـی.

هەنـدێ جـار لەگـەڵ گوێگرتـن لـە دەنگـی حەلـلاق دەكەوتـە حاڵێكـەوە جەزبـە دەیگـرت، بەتایبـەت لەكاتـی گوێگرتـن لـەو دێڕانە:

سعدان جئت ثنيــات اللــوى ... حى عني الحــي مــن آل لـــوي
واجر ذكري فاذا أصغوا لـــــه ... صف لهم ما قد جرى من مقلتي
وبشرح الحال فانشر ما انطوى ... في سقام قد طوا فـي أي طـــي

كاتێ حەللاق بە ئاوازێكی پڕ بە جۆش دەگەیشتە ئەوەی كە دەڵێ:

إن عيدي يوم آتي دارهم ... وأمرغ في ثراهم وجنتي

تووشـی حاڵەتـی وەجـد دەبـوو بەشـێوەیەك ئـاگای لەهەمـوو دەورو بـەری خـۆی دەبـڕا.

ئـەو حاڵـەی کـە باسـی دەکـەم تەنهـا لەکاتـی نەخۆشـیەکەی بـەم شـێوەیە نەبـوو، بەڵکـو بـەردەوام دڵـی سـووتابوو بـە تاسـەو شـەوقێکی تێکـەڵاو بـۆ خۆشەویسـتیی خـوا، هەروەهـا بـە خۆزەلیلکـردن و هـەژاری و خـۆ بەپێویسـت زانیـن لەبـەر دەسـتی ئـەو، بـەڵام ئـەو سـووتانەی نـاخ و دڵ و دەروونـی بـە خۆشویسـتنی خـوا لـە سـاڵانی کۆتایـی تەمەنیـدا زۆر زیـادی کـرد.

لـەو ماوەیـەدا کـە باسـی دەکـەم سروودبێـژ عەبولڕەئـوف حەللاق ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ لەگـەڵ کۆمەڵێـك لـە هاوڕێیانـی سـەردانی باوکمیـان کـرد، لـە ژووره بچووکەکەیـدا پێشـوازی لـێ کـردن، هـەر ئەوەنـدە کـە دانیشـتن ڕاسـتەوخۆ داوای لێکـردن شـتێکی بـۆ بڵێـن و ئەمیـش گوێیـان بـۆ بگـرێ، ئەوانیـش ئـەو بەیتانەیـان بـە ئاوازێکـی خـۆش بـۆ چـڕی:

كن مع الله تر الله معك ... ودع الكل وحاذر طـمعـك

لا تؤمل أمـــلا غـيـره .... إنما يسقيك من قد زرعـك

فإذا أعطاك من يـمنعـه .... ثم من يعطي إذا ما منعك

واتـە: لەگـەڵ خوابـە دەبینـی خـواش لەگەڵتـە، واز لـە هەمـووان بهێنـە وریـای تەمـاح و چـاو چنۆکـی بـە، هیـواو ئومێـدت نەبـێ بەغەیـری ئـەو، ئـەو کەسـە ئـاوت دەدا کـە تـۆی چانـدووە، ئەگـەر

ئـەو پێـت بـدات كـێ دەتوانـێ لێـت بگرێتـەوە؟ پاشـان ئەگـەر ئـەو لێـت بگرێتـەوە كـێ دەتوانـێ پێـت بـدا؟.

لەگـەڵ ئـەم دێڕانـەدا (وەجـد) هێرشـی بـۆ هێنـا، لـەو شـێوە سرووشـتیەی كـە تێیـدا بـوو دەرچـوو، لەگەرویـەوە لەفـزی جەلالـە دەردەهـات، بەیـەك جوڵـەی ڕێـك هەمـوو گیانـی دەجـوڵا، شـتێك لەنـاخ و سـینەیدا دەسـووتاو لـە لاشـەیدا بـەرز دەبوویـەوە، لەكاتێكـدا دانیشـتبوو وەك مەنجەڵـی ئـاوی كـوڵاو قوڵپـی دەدا.

كاتـێ لـە سروودەكەیـان تـەواو بـوون و ئەویـش دەروونـی ئـارام بـۆوە، گەڕایـەوە سـەر سرووشـتی خـۆی، سـەرتاپا گریان بەسـەریدا زاڵ بووبـو بـە گریانـەوە پێـی گوتـن: لەوجـۆرە سروودانـەم بـۆ بچـڕن، لـەو جـۆرەم بـۆ بچـڕن!.

لـەو قۆناغانـەی كۆتایـی تەمەنیـدا هـەر كەسـێك ئـەوی بینیبوایە هیـچ گومانـی نەدەمـا لـەوەی هەمـوو هەسـت و شـعورەكانی ئـەو پیـاوە بەسـتراوەتەوە بەخـوا، ئەمـەش لەسـۆنگەی شـەوق و تاسـەو زەلیلـی عبودیەتـی بـوو بـۆ خـوا، هەنـدێ جـار ئـەو هەسـت و شـعورانە هێرشـیان بـۆ دەهێنـا بـەو حاڵـە شـاراوانەی كـە زاڵ ببـون بەسـەر كیانیـدا لەبـەر ئـەوە بێئـاگا لەدونیـا قسـەی دەردەبـڕی.

بەیانیـەك تۆفیـق دەچێتـە ژورەكـەی دەبینـێ دەم و چـاوی باوكـم زۆر ڕونـاك و ڕەونەقـدارەو ڕووی زۆر خۆشـە، لەبـەر ئـەوە مزگێنـی دەدا بـە باوكـم و پێـی دەڵـێ: سـوپاس بـۆ خـوا ئەمـڕۆ دەم و چـاوت زۆر سـاف و ڕوونـاك و ڕەونەقـدارە، باوكیشـم تەماشـای دەكات و

پێی دەڵێ: سەرت سوڕماوە لە ڕوناكی و ڕەونەقی دەم و چاووم؟!
بەڵكو هەر زۆر بێ شەوق و ڕەونەقە بەراورد بە دڵم!

ئەم قسەیە زۆر گەورەیە قسەیەكە واتایەكی زۆر دوورو قوڵی هەیە لە ڕوانینی ئەو كەسەی كە دركی بەو حاڵە كردبێ، كە ئەو كات باوكمی پێدا تێدەپەڕی.

هەستی خۆ بە هەژار زانین و خۆ بەپێویست زانین بەرامبەر بەخوا ئەو هەستە بوو كە باوكم هیچ كاتێك لە كاتەكان لەبیری نە دەكرد، هەستی خۆبەكەمزانین و زەلیلی و بێدەسەڵاتی بەرامبەر بەخوا لەلایەن باوكمەوە لەلووتكەدا بوو، بەردەوام ئەم هەستە بەسەریدا زاڵ بوو، لێی جیا نەدەبوویەوە، وەسیەتی كردین ئەگەر وەفاتی كرد لەسەر تابووتەكەی بە خەتێكی گەورە ئەم دێرە بنوسین:

أتيتك بالفقر ياذا الغنى ... وأنت الذي لم تزل محسنا

واتە: بەهەژاری و بێدەسەڵاتیەوە هاتم بۆ لات ئەی بێنیازو دەوڵەمەند، تۆی كە بەردەوام چاكەكاریت.

ئەوەی ئەو داوای كرد بۆمان جێبەجێ كرد، ئەو بەیتە شیعرەمان بە خەتێكی گەورە لەسەر لەوحەیەك نووسی و بەپێشەوەی ئەو تابووتەمان هەڵواسی كە ئەوی پێ گوازرایەوە مەنزڵگای هەمیشەیی.

**چەند شتێکی نامۆ بەر لە وەفات کردنی:**

مـن لـەو کەسـانە نیـم کـە بـەدوای شـتی غەریـب و نامـۆدا دەچـن و کـۆی دەکەنــەوە، چ جـای ئـەو کەسـانەی کـە شـتی زیـادەی پێـوە دەنێـن یاخـود زۆری لەخۆیـان دەکـەن تـا ڕوداوەکان گـەورە بکـەن و شـتی غەریـب و نامـۆی پێـوە بلکێنـن.

بـەڵام حەزیـش بـەوە ناکـەم بەسـەر ڕووداوێکـدا بـاز بـدەم و باسـی نەکـەم کـە بەسـەر باوکمـدا هاتـووە تەنهـا لەبـەر ئـەوەی شـتێکی غەریـب و نامۆیـەو لـەو شـتانەیە کـە خەڵکـی دەقیـان پێـوە نەگرتـووە، پاشـان مـن بەڵێنـم داوە باسـی هەرشـتێك بکـەم کـە دەیزانـم دەربـارەی ژیانـی ئـەو لـە سـەرەتاوە تـا کۆتایـی، لـەو بـاوەڕەدام بـاس نەکردنـی ئـەو شـتانە نایەتـەوە لەگـەڵ ئـەو ئەمانەتـەی مـن خـۆم پێـوە پابەنـد کـردووە لـە نووسـینی ئـەو لاپەڕانـە.

ئـەو کاتـەی نەخـۆش بـوو، مـن و تۆفیقـی کـوڕم شـەوان لـە ژوورەکەیـدا بەنـۆرە دەماینـەوە، شـەوێکیان وا ئەزانـم نزیکـەی مانگێـك پێـش وەفـات کردنـی بـوو، مـن لـەلای نوسـتبووم، لەنیـوە شـەودا لەگـەڵ دەنگـی ئـەو خەبـەرم بـۆوە، بەپەلـە هەڵسـام وا گومانـم بـرد قسـە لەگـەڵ مـن دەکات و شـتێکی دەوێ، بـەڵام بـەووردی سـەیرم کـرد بینیـم ئـەو لەنێـو خەوێکـی قوڵدایـە، لەگـەڵ ئـەوەش بەردەوامـە لـە قسـە کـردن، منیـش گوێـم نزیـك خسـتەوە بـۆ قسـەکانی، بـۆ یەکەمجـار لەژیانـی خۆمـدا گوێـم لـە کەسـێکی

خەوتـوو بـوو زۆر بەڕێـك و پێكـی قسـە بـكات، بـۆ مـاوەی سـێ دەقیقـە لەسـەر یەكـتر قسـەی كـرد، قسـە كردنێـك كـە لەدەمـی كەسـێكەوە دەردەچـوو لەقوڵایـی خـەودا بـوو، چەنـد خۆزگـەم دەخواسـت بـۆم بڕەخسـایە ئـەوەی لـەوم بیسـت تۆمـارم بكردایـە.

ئـەوەی لـە قسـەكانیدا ئەزبـەرم كـرد، ئەوەبـوو دەیگـوت: {ئـەی پیـاو! تـۆ بەندەیەكـی لـە بەندەكانـی خـوا، منیـش بەهەمـان شـێوەی تـۆ، هەردووكـمان ڕاسـپێردراوین بـە: ئـەدا كردنـی مافـی بەندایەتـی، هەروەهـا بـە چاودێـری كردنـی خێـزان و پـەروەردە كردنـی منداڵەكانمـان، چ سـودێك لـەوە دەبینـی ئەزیەتـم بـدەی: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ﴾ آل عمـران.

لەشـەوی ڕابـردوو خەڵكێـك لـە حەلەبـەوە هاتبـوون بـۆ لام هەنـدێ سروودو ئاوازیـان بـۆ گوتـم، حـاڵ گرتمـی، ..... پاشـان بێدەنـگ بـوو، بـەردەوام بـوو لەسـەر خەوتنەكـەی.

ئـەوەی لەیادگەمـدا مابێتـەوە لەسـەر قسـەكانی ئەوەنـدە بـوو، ئـەو كاتـەی قسـەكانی دەكـرد بەشـێوەی دەربڕینەكـەی دیاربـوو لەگـەڵ قسـەكانی خۆیـدا تـەواو كارلێكـی كـردووە، هەروەهـا لەكاتـی قسـەكردنەكەدا بەدەسـتیش ئامـاژەی دەكـرد وەك ئـەوەی بەخەبـەر بـێ، بەكردەییـش ڕۆژێـك یـان دوو ڕۆژ بـەر لەمـە چەنـد سرودبێژێـك سـەردانیان كردبـوو لەنێویانـدا خـوا لێخۆشـبێ عەبدولڕەئـوف حەلـلاق هەبـوو.

کاتێـك بـەر لەنوێـژی بەیانـی هەڵسـا بـۆ نوێـژ کـردن، هەواڵـم پێــدا بــەوەی لێــم بینیبــوو، وە لێــم بیســتبوو، ئەمیــش گوتــی: خەوێکـم بینـی لەخەوەکەمـدا کەسێك بەرامبـەرم دەرکـەوت منیـش هەنــدێ ئامۆژگاریــم کــرد.

پێـش وەفـات کردنیشـی بـە (دە) ڕۆژ، یاخـود کەمـتر، گوێـی لەدەنگێـك بـوو ئێمـە گوێـمان لـێ نەبـوو، کاتـێ بـەر لەنوێـژی بەیانـی هەڵدەستێ بـۆ نوێـژ کـردن، دواتـر لەکاتـی بەرەبەیـان، پێـی گوتیـن: حاڵـی ئـەو کەسـانە زۆر سـەیرە کـە گۆرانـی دەڵێـن و تەپـڵ لێـدەدەن لـەو بەرەبەیانـەدا، بـێ ئـەوەی حیسـابێك بـۆ ئـەو کەسـانە بکـەن کـە لـەدەورو بەریانـدا نوسـتوون.

پێـم گـوت: کـە -بـەوردی گوێـی خـۆم هەڵخسـتووە- بـەڵام هیـچ شـتێك نابیسـتم، بەسەرسـوڕماوی سـەیری کـردم، گوتـی: ئایـا گوێـت لەدەنگـی ئـەوە نییـە گۆرانـی دەڵـێ؟ گوتـم: گوێـم لـێ نیـە، کـوا چـی دەڵـێ؟ کەمێـك گوێـی گـرت پاشـان پێـی گوتـم: نازانـم چـی دەڵـێ، لـە قسـەکانی ناگـەم، بانگـی تۆفیـق و ئەندامانـی تـری خێزانەکەمانـم کـرد، لێـم پرسـین ئایـا لـەم کاتـی هێمنـی و ئارامیـەدا شـتێك دەبیسـتن؟ گوتیـان: نەخێـر، هیـچ یەکێـك لـە ئێمـە هیـچ شـتێکی نەدەبیسـت، جگـە لـە باوکـم، زۆرم پـێ سـەیر بـوو کـە ئێمـە دەنگەکـە نابیسـتین، دڵنیـای کردینـەوە کـە ئـەو گوێـی لـە گۆرانییەکەیە لەگـەڵ دەنگـی دەف.

مـاوەی چەنـد ڕۆژێـك لەهەمـان کات واتـە: لەکاتـی بەرەبەیـان ئـەم شـتە دووبـارە دەبوویـەوە، هەواڵـی پـێ دەدایـن بـەوەی کـە

دەيبيست، تەبعەن بەخەبەر بوو، وە تەواو هۆشيار بوو، بۆ ئەوەى ئێمە هيچ شتێك ببيستين، هەروەك گوتم: باوكم بەهيچ شێوەيەك عەقڵ و ئاگايى و درك كردنى لەدەست نەدابوو، نەك هەر ئەوە بەڵكو لە جوڵەش نەكەوتبوو توانای دەست نوێژ شوشتن و نوێژ كردن و ئەو شتانەى هەبوو تا چەند كاتێكى كەم بەر لە وەفاتى!

بەڵام ئەوەى لەيادم مابێ هەفتەيەك بەر لەوەى وەفات بكات كاتى نوێژى بەيانى چوومە ژورەكەى، پرسيارى تەندروستيم لێ كرد لێم پرسى حاڵت چۆنە؟ تەماشام كرد گەشى و دڵخۆشى لەدەم و چاويدا دەبارى، پێى گوتم: ئەمشەو خەونێكم بينى، ئەگەر ڕاست بێ و بەڕاستى وەك ئەوە بێ كە بينيومە، ئەوا زۆر بەنرخترە لەهەموو گەنجينەى دونياو ئاخيرەت، پێم گوت: ئينشائەڵڵا خەوێكى خێرت بينيوە.

پێى گوتم: {خۆم بينى لە وەستانى ڕۆژى قيامەتا وەستاوم، دەورو بەرم پڕ بوو لە خەڵكانێك نەمدەناسين، لەبەردەم خواى پەروەردگاردا وەستام، پێى فەرمووم: تۆ لەدونيادا بەگەورەت دەگرتم، ئيمڕۆ من خۆت و منداڵەكەت ڕێزدار دەكەم و دەبەخشم}.

زۆر ڕوونە ئەم خەونە سەيرو نامۆيانە لەو جۆرە موژدەيەن كە خواى پەروەردگار پەيمانى بەبەندە چاكەكانى داوە پێيان بەبەخشێ لەژيانى دونياو بەر لە وەفات كردنيان بەكاتێكى كەم، بەڵگەشمان ئەم ئايەتەيە: خواى پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْأَخِرَةِ ﴿٦٤﴾ ﴾[1] يونس، بە صەحيحيش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە فەرموويەتی: {خەونی ڕاست بەشێكە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرايەتی}.

لە ڕۆژی يەك شەممە، ڕێكەوتی (١٨ شەوالی ١٤١٠ك) باوكم توشی بەد هەرسيەكی زۆر قوڕس بوو، لەئێوارەی ڕۆژی پاشتر كۆمەڵێك لە دكتۆرەكان سەردانيان كرد، لەوانەی لەيادم مابن (دكتۆر عەبدولەليك كەزبەری، د. مەحمود ئەلنەحلاوی، د. هيشام ئەلحورانی)، سەيريان كرد، ئەميش لەسەر جێگەكەی دانيشتبوو، هەندێ قسەی پڕ لە هەست و سۆزی نێو ناخی بۆ كردن ئەوانيش گوێيان بۆ گرت، ئێستا قسەكانم لەياد نەماوە، د. عەبدولەليك پێشنياری كرد موغەززی بۆ دابنرێ لە ڕێگەی سۆندەوە، داوای مۆڵەتی لە باوكم كرد موغەززيەكەی بۆ هەڵواسێ لەڕێگای دەمارەوە پێی بدرێ، باوكم پێی گوت: تكا دەكەم بەس ئەمشەو چاوەڕێ بكەن و وازم لێ بێنن، بەڵام (دكتۆر كزبری) وەك پيشەی هەميشەيی خۆی بەنەرمی تكای لە باوكم كرد مۆڵەتی بدات بۆ ئەم كارە، ئەميش مۆڵەتی دا.

بەيانی ڕۆژی سێشەممە باوكم وەك نەريتی هەميشەيی خۆی بەر لەنوێژی بەيانی هەڵسايەوە، چووە گەرماو بۆ ئەوەی دەستنوێژ بشوات، نوێژی بەيانی ئەنجامدا، ئەوەندەی كە توانی ئەو زيكرو ويردانەی خوێند كە بەردەوام دەيخوێندن.

---

(١) واتە: هەر بۆ ئەوانە موژدەی (كامەرانی و بەختەوەری) لە ژيانی دنيادا.

دواتر لەکاتی چێشتەنگاو وەك نەریتی خۆی وابوو گەڕایەوە سەر جێگاکەی بۆ ئەوەی بخەوێ، منیش لەگەڵ برا دکتۆرەکان چووینە دەرەوە بۆ ژوورە گەورەکەی دیکە بەرامبەر ئەو ژوورە بچووکە کە باوکمی تێدا خەوتبوو، لەوانەی کە لەیادم مابێ دکتۆرەکان د. هیشام ئەلحورانی و د. نەحلاوی و د. عیسا ئەلمەرزوقی بوون.

لەکاتێکدا ئێمە دانیشتبووین، هێشتا نیو کاتژمێر تێنەپەڕی بوو بەسەر خەوتنی ئەودا، گوێم لە دەنگێکی بەرز بوو بانگی کرد: سەعید!

بەپەلە خۆم گەیاندە ژوورەکەی، ئەوانەشی لەوێ بوون بەپەلە بەدوای مندا هاتن، بینیم لەناوەڕاستی جێگەکەی خۆی دانیشتووە، پێیەکانی کەمێك شۆڕ کردۆتەوە بۆ سەر زەوی، سەیری دەکردم و دەمی دەجولا چەند قسەیەکی لێوە دەردەهات تێنەدەگەیشتم، وام گومان برد دەیەوێ بۆ گەرماو بچێ، هەوڵماندا یارمەتی بدەین، بەڵام زۆری پێنەچوو گەڕایەوە سەر جێگاکەی و ڕاکشا، لەهەمان کاتدا کەوتە غەرغەرەی مردن، چاوەکانی بەزەقی بەرەو سەرەوە چوون، ئەمە هەمووی دەقیقەیەکی خایاند، دوای ئەوە ڕوحەکەی تەسلیم کرد.

ئەوەی کە یەقینم دەربارەی هەیەو یەك ساتیش گومانم لێی نەبووە ئەوەیە: باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ چاوی بە فریشتەی گیان کێشان کەوتبوو، زانیی بووی ئەمە ئەو کاتە دیاریکراوەیە کە دەبێ دونیا جێبێڵێ و کاتی جیا بوونەوەیە،

بۆیـە بەهەمـوو دەنگـی خـۆی بانگـی کـردم لـە ژوورەکەیـدا تـا کاتەکانـی مـاڵ ئاوایـی کردنـی ئـەو ببینـم، نـەوەك دواتـر بەسـەر جەنازەکەیـدا بێـم و بێبـەش بـم لـە بینینـی کات و سـاتی ماڵئاوایـی کردنەکـەی، لەوانەشـە ئـەو بانـگ کردنـەی مـن بـە ئامـاژەی یـان بـە مۆڵەتـی خـودی فریشـتەی گیـان کێشـان بووبـێ.

گومانـی تێـدا نییـە ئـەو وشـانەش کـە لـەدوای بانـگ کردنەکەی مـن درکانـدی و مـن تێـی نەگەیشـتم هەواڵـی ئـەو شـتە بـووە کـە بینیویەتـی و ویسـتویەتی پێـم ڕابگەیەنـێ کـە کاتـی ڕۆیشـتنیەتی بـەرەو خـوا، بـەڵام سـامناکی مـردن هێـزی لـەو دەمارانـە بڕیبـوو کـە دەنـگ دەردەهێنـن، وشـەکان لەسـەر لێویـدا دەنگیـان نەبـوو، تەنیـا ورتـە ورتێکـم دەبیسـت.

کۆچـی دوایـی باوکـم بەیانـی ڕۆژی سـێ شـەممە بـوو، کـە دەکاتـە (٢٠ی شـەوالی سـاڵی ١٤١٠ك)، بەرامبـەر بـە (١٥ ئایـاری ١٩٩٠ ز).

لەنیـوەڕۆی هەمـان ڕۆژ لاشـەکەی بەسـەر شـان شـەقامەکانی دیمەشـقی بـڕی بـۆ ئـەوەی لـە ئارامگەکەیـدا لـە (بـاب الصغیـر) بشـاردرێتەوە، لـەو گۆڕسـتانە بچووکـەی کـە هەنـدێ لـە زانـا دیارەکانـی دیمەشـقی تێـدا شـێردرابۆوە، بـەر لـە هەموویـان شـێخ ئیبراهیـم ئەلغەلایینـی، ڕەحمەتـی خـوا لـە هەموویـان بـێ.

خەڵکـی لەمـلاو ئـەولای جادەکـەدا کۆببونـەوە کاریگـەری زۆری وەفاتـی باوکمیـان لەسـەر بـوو، تەماشـای تابوتەکەیـان

دەكـرد كـە هيـچ شـتێكی بەسـەرەوە نەبـوو غەيـری عابايەكـی سـپی كــە جەنازەكــەی داپۆشــيبوو، لەگــەڵ ئــەو لەوحــە ســپييەی كــە بــە پێشــەوەی تابوتەكــە هەڵواسرابــوو، ئــەو دێــرە شــيعرەی لەســەر نوسرابــوو:

أتيتك بالفقر ياذا الغنى ... وأنت الذي لم تزل محسنا

ئەمەش وەك پێشتر باسم كرد بەوەسيەت و پێداگيری خۆيی بوو.

وەفاتــی كــردو ماڵئــاوای كــرد، لــەدوای خــۆی وەســيەتێكی گشــتی جــێ هێشــت بــۆ منداڵەكانــی و بــۆ ئــەو كەســانەش كــە قســەكەی ئەويــان پــێ دەگات، ئەمــە دەقــی وەســيەتەكەيە:

(ســوپاس و ســتايش تەنيــا بــۆ خــوای تــاك و تەنيــا، صــەڵات و ســەلام لەســەر ئــەوپێغەمبەری ﷺ كــە هيــچ پێغەمبەرێكــی ديكــەی بــەدوادا نايــەو، لەســەر شــوێنكەوتوان و هاوەڵانــی بەڕێــزی و، لەســەر هــەر ئيماندارێــك كــە شــوێنی ســوننەتەكەی دەكــەوێ، پاشــان... ئامـۆژگاری منداڵەكانـم و هەمـوو ئەوانـەش دەكـەم كـە قســەكەی مــن دەبيســتن، هيــچ كەســێكی ديكــەی غەيــری خــوا نەكــەن بــە دۆســت و يــارو يــاوەرو ســەرخەرتان، هيــچ كەســێكی ديكــەی غەيــری ئــەو نەكــەن بــە دادوەرو دەســەڵاتدار، داوا لەخــوای پــەروەردگار دەكــەم واتــاو لێكدانــەوەی ئــەو قســانەی مــن لــە ئێــوە بگەيەنــێ، مشــوری كارەكانتــان بخــواو كارەكانتــان بەخــۆی بســـپێرێ و بۆتــان جێبەجــێ بــكات).

# نمونەیەك لە تەحقیق و بەدواداچوونە زانستیەكانی و ئامۆژگاری و وەسیەتەكانی

## ڕێخۆشکردن

خوێنەر لەهەموو ئەو بەشانەی پێشتر هێنامان بۆی دەرکەوت مـن غەیری وەسف کردنی واقعی ژیانی باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێ شتێکی دیکەم زیاد نەکردووە، ئەوەی ڕوویدابوو وەك خۆی هێنام بێ ئەوەی شتێك زیاد بکەم بەمەبەستی پشتڕاستکردنەوەو بەهێز کردنی بابەتەکان، واتە: لەهەموو بەشەکانی ڕابردوو قسەی من لەبارەی باوکم قسەیەکی وەسفی بوو، تەنها وەسفی ژیانی ئەوم کرد، خۆم نەخستە نێو ئەو چوارچێوەیەی پێودانگێك بۆ شتەکان دابنێم و بڕیاریان لەبارەوە بدەم.

بەڵکو ئەم هەلەم بۆ خوێنەر جێهێشت، بۆ ئەوەی خۆی لەو واقیع و ڕووداوانە ڕابمێنێ کە منی نووسەر ئەوپەڕی هەوڵ و تێکۆشانی خۆم بەخەرجدا بۆ ئەوەی بە دیققەت و وردییەوە بیگێڕمەوە، ئەمەشم بۆیە کرد بۆ ئەوەی خوێنەر ئەو بڕیارو پێودانگانە بەکار بهێنێ و بیخاتە سەر ڕووداوەکان کە خۆی بڕواو قەناعەتی پێیە.

یەکێ لەو باسانە بریتیی بوو لە ئاستی زانستی باوکم، ئەو ئاستە زانستیەی باوکم هەیبوو دەچێتە نێو ئەو چوار چێوە گشتییەی کە تازە ئاماژەم پێکرد، خوێنەر دەزانێ لەبارەی ئاستی زانستی باوکمەوە زۆر نەدواوم جگە لەباس کردنی

ئــەو قۆناغانــەی ژیانــی كــە وەك: قوتابــی، پاشــان مامۆســتا، پاشـان مودەڕیـس پێیـدا تێپەڕیـوە، هەروەهـا باسـی ئـەو زانسـت و زانیاریانـەم كـرد كـە جێگـەی گرنگـی پێدانـی ئـەو بـوون، ئـەوەم ڕوون كـردەوە كـە زۆرتریـن گرنگیدانــی بـۆ فیقـە بـوو، هەروەهـا باسـم كـرد كـە زۆر زەبـر دەسـت بـوو لـە فیقهـی ئیمامـی شـافعی، هەروەهـا شـارەزاییەكی باشیشـی هەبـوو لـە فیقهـی ئیـمام ئەبـی حەنیفــە، بــەڵام بەهیــچ شـێوەیەك نەهاتمــە ســەر باســی ئاســتی زانسـتی و مەعریفـی كـە چەنـد ئەهلـی تەحقیـق و لێكۆڵینـەوە بـووە لـە مەسـەلەكان، لەبـەر ئـەوەی قسـە كـردن لەسـەر ئـەو لایەنانـە لـە سـنوری وەسـف كـردن دەردەچـێ، وەسـف كردنـی باوكـم لـەو لایەنانــە هەڵەیــە، بەڵكــو دەبــێ پێودانگێــك هەبــێ و ئــەو باســە بپێـوێ ئایـا ئاسـتی زانسـتییەكەی چـۆن بـووەو چـۆن نەبـووە.

بــەڵام ئێســتا دوو نموونــە لــە بەدواداچــوون و گفتوگــۆ زانسـتیەكانی ئـەو پێشـكەش بـە خوێنـەر دەكـەم، ئەگەرچـی بـە دەسـت و خەتـی خـۆی نییـە، بـەڵام بەداڕشـتنی خۆیەتـی، چونكـە ئــەو كاتــەی داوای كــرد بــۆی بنوســینەوە لــە حاڵێكــدا بــوو نەیدەتوانــی بنووســێ و بخوێنێتــەوە، بەهــۆی بێهێــزی چاوەكانــی دوای ئــەوەی دووجــار نەشــتەرگەری بــۆ كرابــوو.

هیــچ گومانــی تێــدا نییــە خوێنــەر دوای ئــەوەی بەجوانــی لــە هــەردو نموونەكــە ڕامــاو لێــی ورد بوویــەوە، ئەگــەر توانــی بەدواداچــوون بــكات بــۆ چۆنیەتــی بڕیاردانێكــی زانســتیانەو تێپەڕاندنــی ڕواڵەتــی بابەتــەكان و هەنــگاو نــان بــۆ ڕەگ و ڕیشــەو

قوولّـی مەبەسـتی نووسـینەکە، ئـەوکات دەتوانـێ لەبـارەی ئاسـتی زانسـتی باوکـم بگاتـە بڕیارێـك لـە قەناعەتـی خۆیـەوە هەڵقولاّبـێ.

کەواتـە: لێـرەوە ڕۆڵـی مـن لـە وەسـف کردنـی ژیانـی باوکـم و پێشـاندانی ڕووداوو بەسـەرهاتەکان کۆتایـی پێـدێ، لێـرە بـەدواوەی کتێبەکـە، لـەو بەشـەی کۆتایـی هیـچ دەورێکـی منـی تێـدا نیـە جگە لـە پێشکەشـکارو ناسـێنەری سـێ لێکۆڵینـەوە کـە پێشـتر هـۆکاری نوسـینەکەیم باسـکرد، ئێسـتا وەك خـۆی دەیخەمـە بـەر دیـدی خوێنـەر، فەرمـوون ئێـوەو وتـار (مەقالـەکان)ی باوکـم:

## هەڵێنجان (إجتهاد)[1] لەلایەن پێغەمبەری خاتەم ﷺ[2]

ئەمڕۆ بەیانی خەوێکی زۆر سەیرم بینی جورئەتی ئەوە ناکەم هەمووی باس بکەم، بەڵام لە نێو کورتەی خەونەکەدا داواکاریەك هەبوو بۆ نوسینی ئەم وشانەی خوارەوە:

هەندێ خەڵك ئەو قسەیە زۆر بەگەورە دەزانن ئەگەر بگوترێ: (دەکرێ لە هەڵێنجانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ نەپێکان ڕوویدا)، بە پێچەوانەی ئەو شتەی مەبەستە تێیدەگەن، لەبەر ئەوە پێیان باش بوو لەم وتارەدا مەبەستی ئەو کەسانە ڕوون بکەینەوە کە دەڵێن: (دەکرێ هەڵەو نەپێکان ڕوویدات لە هەڵێنجانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ)، ئەو کەسانەش کە ئەم قسەیە دەکەن و ئەم بۆچوونەیان هەیە جمهوری زانایانی شەریعەتی ئیسلامین.

---

(١) بەشێك لە وەرگێڕو نوسەرانی بەڕێز بەرامبەر وشەی (إجتهاد)ی زمانی عەرەبی وشەی کۆشش بەکار دێنن، من هەڵێنجانم پێ جوانترو گونجاوترە (وەرگێڕ).

(٢) ئەم وتارە لە ژمارە بیست و شەشی گۆڤاری (نهج الإسلام) بڵاو کرایەوە، لە مانگی جمادی ساڵی ١٤٠٧، بەرامبەر بە شوباتی ساڵی ١٩٨٧، سەیری بەسەرهاتی نوسینی وتارەکەو ئەو هۆکارانە بکە کە لە پشتی نوسینی بوون، لە لاپەڕەی (٢٨٦)ی ئەم کتێبە.

دەڵێیـــن: {بســم اللــه الرحمــن الرحيــم الموفــق للصــواب، حمــداً للــه وكفــى، والصــلاة والســلام عــلى ســيدنا محمــد المصطفــى، وآلــه وصحبــه الأوفيــاء الشرفــاء}.

بزانــە كــە پێویســتە لەســەرمان بــەر لــەوەی ڕوونكردنــەوە بدەیــن و وەڵام بدەینـــەوە باســـی پێشـــەكیەك بكەیـــن كـــە پێغەمبـــەران و نێردراوانـــی خـــوا ســـەلامی خوایـــان لێبـــێ مەعصـــوم بـــوون لـــە ئەنجامدانـــی گونـــاح و ســـەرپێچی، پاكـــترن لـــەوەی بەبڕیـــاری هـــەر كەســـێك هەڵـــەو لادانیـــان بخرێتـــە پـــاڵ.

چـــۆن پارێـــزراو نیـــن لەكاتێكـــدا خـــوای پـــەروەردگار لەبـــارەی گەورەمـــان پێغەمبـــەری خـــوا ﷺ دەفەرمـــووێ: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ۝٥﴾[1] النجـم، هەروەهـــا دەفەرمـــووێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ۝٦٤﴾[2] النســاء، چـــۆن پێغەمبـــەری خـــوا ﷺ ســـەرپێچی پـــەروەردگاری دەكات لەكاتێكـــدا خـــوای پـــەروەردگار فەرمانمـــان پـــێ دەكات گوێڕایەڵـــی بكەیـــن؟ یاخـــود چـــۆن هەقـــی ئەوەمـــان هەیـــە بڕیـــار لەســـەر ئـــەوە بدەیـــن ئـــەو هەڵـــە دەكات لەكاتێكـــدا ئێمـــە فەرمانمـــان پـــێ كـــراوە بەگوێڕایەڵـــی كردنـــی؟

---

(١) قســەو گوفتاریشــی (ئــەوەی كــە قورئانــە) لــە ئــارەزوو بــازی و هــەواو هەوەســەوە نییــە، ئەمــەی كــە ڕایدەگەیەنێــت تەنهــا نیــگاو وەحــی خواییــە، جوبڕائیلــی فریشــتە خاوەنــی هێــزو توانــای زۆر، قورئانــی فێــر كــردووە.

(٢) هیــچ فرســتادەیەكمان نەنــاردووە مەگــەر تەنهــا بــۆ ئــەوەی گوێڕایەڵــی بكرێــت بەفەرمانــی خــوا.

بـەڵام کـە دەڵێیـن: درووسـت نییـەو باتڵـە ئەگـەر خەڵکێـك بڵێـن پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەهـەر کارێـك لـە کارەکان ئەگـەری ئـەوە هەیـە هەڵـە بـکات و نەیپێکـێ، ئەمـە ئـەوە ناگەیەنـێ کـە: ئەگـەر ئـەم قسـەیە لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە کرابـێ بەرامبـەر بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ ئەویـش هـەر پـووچ و باتـڵ بـێ، نەخێـر، بەڵکـو ئەمـە بـۆ خـوای پـەروەردگار قەدەغـە نییـە لـە ئاسـت هـەر پێغەمبـەرو نێردراوێکـی خـۆی، خـوای پـەروەردگار لەبـارەی پێغەمبەرانـەوە چۆنـی بـوێ ئـاوا بڕیـار دەدات و داوەری دەکات، ئاڕاسـتەیان دەکات، یاخـود سەرزەنشـتیان دەکات، یاخـود بەهەڵەیـان دادەنـێ، ئەمـە بەویسـتی خۆیەتـی، بـەڵام وەك گوتمـان: ئەمـە هەقـی پـەروەردگارە نـەك بەندەکانـی، واتـە: ئـەو مافـەی کـە خـوای پـەروەرگار هەیەتـی بـە دڵنیاییـەوە بەنـدەکان نیانـە.

هـەروەك قسـەی ئیـبن حەجـەری هەیتەمـی لـەو ڕووەوە کـە دەڵـێ: ناپەسـندو مەکروهـە لـە بـارەی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ بگوتـرێ: نێـردراو (الرسـول)، بەڵکـو پێویسـتە بگوتـرێ: نێـردراوی خـوا (رسـول اللـه)، پاشـان دەڵـێ: بـەڵام ئەگـەر گوتـت: ئاخـر ئەوەتـا خـوای بـەرزو مـەزن فەرموویەتـی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ ﴿٤١﴾﴾ المائـدة، دەڵێـن: (ئەمـە جیایـە) خـوای پـەروەرگار مافـی خۆیەتـی هەرچۆنێکـی بـوێ ئـاوا بانگـی پێغەمبەرەکـەی بـکات.

نموونەیەکـی تـر بـۆ بەهێـز کردنـی ئـەم بۆچوونـە ئەوەیـە کـە: شـەرعزانان دەڵێـن: (درووسـت نیـە سـوێند خـواردن بـە غەیـری خـوا)، پاشـان دەڵێـن: (ئەگـەر بگوتـرێ: بـەڵام خـوای بـەرزو مەزن

ســوێندنی بــە هەنجیـرو زەیتــون و زۆر شــتی دیکــە خــواردووە! دەڵێیـن: خـوای پـەروەردگار بـۆی هەیـە هەر شـتێکی بوێ سـوێندی پـێ بخـوا، درووسـت نیـە لەمـەدا ئێمـە خۆمـان بـەو قیـاس بکەین).

کەواتــە: پوختــەی قســان ئەوەیــە: ئێمــە فەرمانمــان پــێ کــراوە پێغەمبــەری خــوا ﷺ بەپیـرۆز بگریــن، پارێــزراوی و عیصمەتــی بــۆ بڕیــار بدەیــن، بــە پاکــی بگریــن لــەو هەڵانــەی کــە خەڵکــی بــە هەڵێنجــان و بۆچوونــی خۆیــان پێیــان وایــە هەڵەیــە، چونکــە ئەمــە پێچەوانــەی ئەوەیــە کــە خــوای پــەروەردگار وەك فەرمانــی خــۆی جێگیــری کــردووە بــۆ ئێمــە کــە: گوێڕایەڵــی ئــەو بکەیــن لەهــەر شــتێك کــە فەرمانمــان پــێ دەکات و لــە هــەر شــتێکیش کــە لێــمان قەدەغـە دەکات، لەهـەر شـتێکیش کـە ئـەو بڕیـاری لەبـارەوە دەدات.

چـۆن ئـاوا سـەیری پێغەمبـەری خـوا ﷺ ناکەیـن؟ لـە کاتێکـدا هـەر لەنێـو خەڵکـی ئاسـاییدا کەسـێکی موجتەهیـد ناتوانـێ حوکـم لەسـەر موجتەهیدێکـی دیکـە بـدات بـەوەی کـە هەڵـەی کـردووە تەنهـا لەبـەر ئـەوەی بۆچوونەکـەی پێچەوانـەی هەڵێنجانـی ئـەوە، ئەگـەر موجتەهیدێـك دەسـەڵاتی ئـەوەی پـێ نەدرابـێ هەڵـە بداتـە پـاڵ موجتەهیدێکـی دیکـەی وەك خـۆی، چـۆن بـۆی دەشـێ هەڵـە بداتــە پــاڵ هەڵێنجانــی گــەورەی موجتەهیــدان پێغەمبــەری خــوا ﷺ؟ ئێمــە دەزانیــن پێغەمبــەری خــوا ﷺ دەریــای زانســت بــووەو زانســتی لــە پــەروەردگاری خــۆی وەرگرتــووە، خــوای پــەروەردگار بەجوانتریـن شـێوە ئـەوی پـەروەردە کـردووە، زانسـتی ئێمـە ناگاتـە یـەك دڵـۆپ لـە دەریـای زانسـتەکەی ئـەو.

بەڵام خوای بەرزو مەزن خۆی پێغەمبەرەکەی ﷺ فێر دەکات و پەروەردەی دەکات، مافی ئەوەی هەیە بەهەڵەی بزانێ وە سەرزەنشتیشی بکات، مافی ئەوەی هەیە هەر شتێکی خۆی بیەوێ بیداتە پاڵی، ئەوەتا پێی دەفەرمووێ: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ ﴾[1] الأنفال، هەروەها پێی دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ۖ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَٰجِكَ ﴿١﴾ ﴾[2] التحريم، هەروەها پێی دەفەرمووێ: ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾[3] التوبة، هەروەها پێی دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ﴿٣٧﴾ ﴾[4] الأحزاب.

---

(١) واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە كە دیلی هەبێت، هەتا كاتێك چاك پایەدارو جێگیر دەبێت لە زەویدا، (مەگەر) كەل و پەل و شتومەكی دونیاتان دەوێت؟! لەكاتێكدا خوا (سەرفرازیی) ئەو جیهانی دەوێت و قیامەتی مەبەستەو خوا باڵادەست و دانایە، (سەركەوتن بە ئیمانداران دەبەخشێت و دانایە لە تاقیكردنەوەیاندا).

(٢) واتە: ئەی پێغەمبەر تۆ بۆچی شتێك لەخۆت حەرام دەكەیت كە خوا بۆی حەڵاڵ كردویت، دەتەوێت بەو كارە هاوسەرەكانت ڕازی بكەیت؟!

(٣) واتە: خوا لێت خۆش بێت (ئەی پێغەمبەر ﷺ) بۆ مۆڵەتت دانێ (نە دەبوایە مۆڵەتیان بدەیتێ) هەتا بەچاكی بۆت دەربكەوێت، كێ ڕاستەو باوەڕ دامەزراوە، كێش درۆزن و دووڕووە.

(٤) (ئەی موحەممەد ﷺ) باسی ئەوە بكە كاتێك كە دەتگوت: بەو كەسەی خوا نیعمەتی ئیمانی پێ بەخشیوەو تۆش نیعمەتی ئازادی و

ئیـبن جەریـر لــە دایكـــان عائیشـــەوە خـوا لێـــی ڕازی بـێ ڕیوایـەت دەكات فەرموویەتـی: {هیـچ ئایەتێـك نەبـووە لـە قورئـان دابەزیبێتـە سـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەو ئایەتـە قورسـتر، ئەگـەر شـتێكی بشـاردایەتەوە لـەوەی كـە خـوا بـۆی وەحـی دەكات، ئـەوا ئـەم ئایەتـەی دەشـاردەوە}.

بزانـە كـە ئـەو ئایەتانـەی لەسـەرەوە هێنامـان ئـەو مانایانـەش كـە دەیگەیەنـن لـەوەی كـە خـوای پـەروەردگار هەڵـەی خسـتۆتە پـاڵ هەڵێنجانەكانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، یاخـود لۆمـەی كـردووە، هیـــچ ناتەواویـــەك نیـــن بـــۆ پێغەمبـــەری خـــوا ﷺ، بەڵكـــو ئەمـــە پاڵپشـتیەكە بـۆ پەیامەكـەی و پێغەمبەرێتیەكـەی، لەبـەر ئـەوەی ئـەم ڕەخنـەو لۆمـە كردنانـە لەلایـەن خـواوە ئاڕاسـتەی كـراوە نـەك لەلایـەن بەشـەرەوە.

بـــەم تێگەیشـــتنە دەتوانـــرێ بۆچوونـــی جمهـــوری زانایـــان و موخالیفەكانیـان كـۆ بكرێتـەوە (جەمـع) بكـرێ، هـەردوولا لـەو خاڵـە هاوبەشـەدا بەیـەك دەگـەن كـە فەرمایشـتی خـوای بـەرزو مـەزن دەلالەتـی لەسـەر دەكات و دەفەرمـووێ: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴾ النجـم، لەبـەر ئـەوەی كاتـێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە هەڵێنجانێكـدا ناپێكـێ -بەپێـی زانسـت و بڕیـاری خوایـە-،

---

پـەروەردەت لەنزیكـی خۆتـەوە پێـداوە: هاوسـەری خـۆت بهێڵـەرەوە لای خـۆت كـە (زەینـەب)ە، لەخـوا بترسـەو (تەڵاقـی مـەدە)، (ئـەی موحەممـەد ﷺ) شـتێك لـە دڵ و دەروونـی خۆتـدا دەشـاریتەوە، كـە خـوا دەیەوێـت ئاشـكرای بـكات، لـە خەڵكـی دەترسـیت؟ بـەڵام خـوا لەپێشـترە كـە حیسـابی بـۆ بكەیـت و لێـی بترسـیت.

بەهۆی ئیلهامێکە لەلایەن خواوە، لەبەر حیکمەتێکی گەورەی خودی خوا خۆی، پاشان وەحی دێت لەکاتێکی گونجاودا ئەو ئیلهامەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەسخ دەکاتەوە، واتە: دوای ئەوەی ئەو ئیلهامە حیکمەتە گەورەکەی تێدا تەحقیق بوو کە خوا دەیەوێ، ئنجا وەحی بە نەپێکراوی دادەنێ و نەسخی دەکاتەوە.

کەواتە: هەمووی هەر بە فەرمان و تەوفیقی خوا خۆیەتی، هەم ئیلهامەکەو هەم وەحیەکە، ئەمەش مانای ئەو قسەیەی زانایانە کە دەڵێن: ناکرێ وەحی دان بەنەپێکرانی پێغەمبەری خوادا ﷺ بنێ و جێگیری بکات و وازی لێبێنێ.

هەر لەو بارەوە ئەو ئایەتەش هەمان شت دەگەیەنێ: ﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ۝٧٨ فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ ۝٧٩ ﴾[1] الأنبياء، خوای پەروەردگار لەو سکاڵایەی کە لەلایەن دوو لایەنە ناکۆکەکە بەرز کرایەوە بۆ لای پێغەمبەر داوود سەلامی خوای لێبێ هەواڵمان پێ دەدات کە سولەیمان بەتەنیا خۆی پێکاویەتی و لەسەر صەوابە، پاشان هەواڵمان پێ

---

(١) واتە: یادی داوودو سولەیمانیش بکەرەوە کاتێك بڕیاریاندا دەربارەی ئەو کێڵگەیە کشتوکاڵیە، کاتێك کە مەڕو ماڵاتی خەڵکی تیایدا بڵاو بوونەوە بە شەوو زیانیان بە کێڵگەکە گەیاند، ئێمەش شایەت بووین لەسەر ئەو داوەری و بڕیارەی ئەوان، جا ئێمە چارەسەری کێشەکەمان لە سولەیمان گەیاند، بەڵام هەریەکە لەم (باوك و کوڕە) بەهرەوەرمان کردبوو لە حیکمەت و دانایی و عیلم و زانستی.

دەدا حوكم و عیلمی بەهەردووكیان داوە، واتە: خوای بەرزو مەزن حیكمەتی خۆی هەیە هەم لەوەدا كە ئیلهامی (داوود)ی كردووە لەو بڕیارەی كە داویەتی و نەیپێكاوە، هەم لە پێكانی مەسەلەكە لەلایەن سولەیمانەوە سەلامی خوای لێبێ، پاشان وەحی بۆ داود دەكات كە حوكمەكەی بگۆڕێ بۆ ئەو بڕیارەی سولەیمان داویەتی، سەلامی خوا لەسەر هەموویان.

لێرەوە مەبەستی جمهوری زانایانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە لەبارەی ئەو قسەیەیان كە دەڵێن: دەكرێ لە هەڵێنجانەكانی پێغەمبەری خوادا ﷺ هەڵە ڕوو بدات، حاشا لە جمهوری زانایان مەبەستیان ئەوەبێ كە دەشێ بەپێی بڕیارو بۆچوونی خەڵك هەڵە لە هەڵێنجانەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوو بدات! هیچ گومانی تێدا نیە ئەوان بەریینە لەوەی قسەیەكی لەو شێوەیەیان كردبێ، بەڵكو مەبەستیان ئەوەیە دەشێ نەپێكران ڕووبدات لە هەڵێنجانەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام كێ ئەو بڕیارە دەدات كە نەیپێكاوە؟ خوای كاربەجێ، وەك ئەو نموونەیەی خوارەوە:

سەیری ئیبن حەجەری هەیتەمی بكەن یەكێكە لە زانایانی -موتەئەخخیرین- چۆن ئەدەب دەنوێنێ بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ، وریایی لەبارەی ئەوە دەدات كە بێژەی (الرسول - نێردراو) مەكروهو ناپەسندە، بەڵكو دەبێ بگوترێ: (رسول الله - پێغەمبەری خوا ﷺ)، ئەمە سەرەڕای ئەوەی خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ ﴿٤١﴾ ﴾.

گوتوويەتـی: خـوای بـەرزو مـەزن لـە سـۆنگەی پەروەردگارێتـی خۆیـەوە مافـی ئـەوەی هەیـە ئەمـە بـە پێغەمبەرەکـەی بڵـێ، بـەڵام بـۆ ئێمـە درووسـت نیـە خۆمـان قیـاس بکەینـە سـەر خـواو ئـەو مافـە بەخۆمـان بدەیـن.

لــە کۆتاییــدا لەســەر ئیمانــدار پێویســتە لــەو مەســەلەیەو هاووێنەکانـی بەدواداچـوون بـکات و ورد بـێ، پێوەرەکانـی زانسـت بـەکار بهێنـێ، پەلـە نـەکات و هـەر زوو هەڵـە نەخاتـە پـاڵ زانایـان، بەتاییــەت ئەگــەر ئــەو زانایــە بۆچوونەکــەی هەمــان بۆچوونــی جمهـور بـوو، لەبـەر ئـەوەی لەوانەیـە جەمـع لـە نێـوان بۆچوونـی ئـەوان و بۆچوونـی ئـەو کەمـەی تـر کـە دەمێننـەوە بکـرێ، وەك ئـەوەی تـازە بینیـمان.

لەکۆتاییدا سوپاس و ستاییش بۆ پەروەردگاری جیهانیان

## لێكۆڵینەوە لەبارەی ڕزگار بوونی دایك و باوكی پێغەمبەری خوا ﷺ و صەڵەوات دان لێیان[1]

ئەمـە ئامۆژگاریەكـە لـە مـەلا ڕەمەزانـەوە بـۆ ئـەو كەسـانەی كـە صەڵـەوات دان لەسـەر دایـك و باوكـی پێغەمبـەر ﷺ بـە درووسـت دەزانـن و ئەنجامـی دەدەن، هەركەسـێكیش پێیـان بڵـێ: كارەكەتـان نادرووسـتە تۆمەتـی ئـەوەی دەخەنـە پـاڵ و پێـی دەڵێـن: دیـارە تـۆ دایـك و باوكـی پێغەمبـەری خـوات ﷺ پـێ كافـرە، بۆیـە پێـت دروسـت نیـە صەڵەواتیـان بـۆ بنێـردرێ.

حاشـا پیاوێـك ئیمانـدار بـێ و دایـك و باوكـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە كافـر بزانـێ، بەڵكـو زانایـان چەندیـن بەڵگەیـان بـاس كـردووە لەسـەر مسـوڵمان بوونیـان، یاخـود لەسـەر ئـەوەی كـە هەردوكیـان لـە ڕزگار بووانـی دۆزەخـن، یەكێـك لـەو بەڵگانـە كـە لەهەمـوو بەڵگەكانـی تـر بەهێزتـرە ئەوەیـە كـە ئـەوان بـە ئەهلـی فەتـرە هەژمـار دەكرێـن، واتـە: ئـەوان لـە سـەردەمێك ژیـاون كـە ڕێنمایـی هیـچ پێغەمبەرێكیـان لـە پێغەمبەرانـی بـەر لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ پـێ نەگەیشـتووە، بـەو سـەردەمەش نەگەیشـتوون كـە پێغەمبـەری خـوای ﷺ تێـدا ڕەوان كـراوە، بەڵگـەش لەسـەر

---

(١) سەیری بەسەرهاتی نووسینی وتارەكە بكە لە لاپەڕەی (٢٨٤)ی ئەم كتێبە.

ڕزگار بوونی ئەهلی فەترە بەگشتی ئەو ڕستە قورئانیەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾[1] الإسراء، یەكێكی دیكە لە بەڵگەكان فەرمایشتی دایكمان عائیشەیە خوا لێی ڕازی بێ، {پێغەمبەری خوا ﷺ داوا لە پەروەردگاری دەكات دایك و باوكی بۆ زیندوو بكاتەوە، خوای گەورەش هەردووكیانی بۆ زیندوو دەكاتەوە، بڕوایان پێ هێناو پاشان هەردووكیانی مراندەوە}، هەرچەندە فەرمایشتەكە لاوازە، زانایانی فەرمووده پشتی پێ نابەستن، یەكێكی دیكە لەو بەڵگانە لە كتێبەكانی تەفسیردا هاتووە لە تەفسیری ئەو ئایەتەی كە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ ﴾ الشعراء، واتە: لە سكێكەوە بۆ سكێكی تر لە پشتێكەوە بۆ یەكێكی تری (كڕنوشبەر) تۆیی گواستەوە، ئەمە ئاماژەیەكی ڕوونە لەسەر ئەوەی كە باپیرانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموویان ئیماندار بوونە یاخود هەمان حوكمی ئیماندارانیان هەبووە، یەكێكی دیكە لە بەڵگەكان ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕێزترینی دروستكراوانە، پێویستە بەڕێزترین دوروستكراویش لە بەڕێزێكەوە هاتبێتە دونیاوە، بەكافرزانینیان پێچەوانەی ئەمەیە.

بەو بەڵگانەی كە هەن، ئەوە جێگیر دەبێ پشتیوان بەخوا ئەوان لە ڕزگار بووانن، ئەو فەرمایشتەش كە لە (صەحیحی موسلیم)دا هاتووە ئەم بۆچوونە هەڵناوەشێنێتەوە، فەرمایشتەكە بەم شێوەیەیە لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە

---

(١) واتە: ئێمەش سزای كەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێكی بۆ دەنێرین.

کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: {داوای مۆڵەتـم لـە پـەروەردگارم کـرد بـۆ ئـەوەی داوای لێخۆشبوون بـۆ دایکـم بکـەم، بـەڵام مۆڵەتـی نـەدام، داوای مۆڵەتـم لـێ کـرد سـەردانی گۆڕەکـەی بکـەم مۆڵەتـی دام}، ڕواڵەتـی فەرموودەکـە ئـەوە ناگەیەنێ ئـەوان لە ڕزگار بـووان نەبـن، لەوانەیـە ئـەو قەدەغـە کردنـە لەبـەر هۆکارێکی تـر بـێ کـە خـوا خـۆی زاناتـرە پێـی، هـەر بەڵگەیەکیـش ئەگـەری کەوتــە نێــو، ئــەوا لــە بەڵگــە پێهێنانــەوە دەکــەوێ، هاوشــێوەی قەدەغــە کردنــی نوێــژ لەســەر کردنــی مردووێــك کــە قــەرزارەو قەرزەکـەی نەدراوەتـەوە، ئـەوە گشـتگیر تـرە لـەوەی کـە بەڵگـە بـێ لەسـەر کافـر بوونـی.

چـۆن بڕیـار لەسـەر بەکافـر دانانـی دایـك و باوکـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بدەیـن پێشـتر لـە هەنـدێ کاتـدا سـوڕەتی ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ﴾ م دەخوێنـد، لـە هەنـدێ کتێبـدا گێڕانەوەیەکـم لـە هەنـدێ لـە پیاوچاکانـەوە خوێنـدەوە کـە یەکـێ لـە پیـاو چـاکان زۆر ئـەو سـوڕەتەی خوێندۆتـەوە پێغەمبـەری خـوای ﷺ لەخـەودا بینیـوە لـە ڕوخسـاریدا نیشـانەکانی پێناخـۆش بـوون و سەرزەنشـتی بـەدی کـردووە، پاشـان پێـی فەرمـووە: ئایـا ئـەوە مامـی مـن نییـە؟ مەبەسـتی ئەبـو لەهـەب بـووە، منیـش لـەو کاتـەوە وەك ئـەدەب و ڕێزێـك بەرامبـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ خۆم گرتـەوە لـە خوێندنەوەی ئـەم سـوڕەتە جگـە لـە خوێندنـەوەی بەمەبەسـتی خەتـم کـردن.

بــەڵام ســەبارەت بــەوەی کــە دەڵێیــن: صەڵــەوات دان لێیــان دروســت نییــە، ئــەم بۆچوونەشــان هــەر لەڕێگــەی زانســت و

بەدواداچوونـەوە جێگیـر کـردووە، بـۆ ڕوون کردنـەوە ئـەم بەڵگانـە دەهێنینــەوە:

یەکەمیان: لەبەر واجب بوونی جێبەجێ کردنی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ، بوخاری لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی، هاوەڵان دوای دابەزینی ئەو ئایەتە کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾ الأحزاب، پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن چۆن صەڵەواتت لێ بدەین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: بڵێن: {اللهم صل على محمد وآله وذريته وأزواجه كما صليت على إبراهيم....}.

دووەمیان: پێویستبوون (واجب) بوونی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەوەدا کە خوای پەروەردگار قەدەغەی کرد داوای لێخۆشبوون بۆ دایکی بکات، بەڵکو من لەهەموو نزاکانیدا نەمبینیوە نزا بۆ دایك و باوکی یان بۆ یەکێکیان بکات، سەرەڕای هەموو ئەو داوای لێخۆشبوونانەی لە کتێبەکانی فەرموودەدا هاتون، وەك ئەو نزایەی لەپێش نوستندا کردویەتی: {رب اغفر لي ذنبـي واخسأ شيطاني وفك رهاني وثقل ميزاني} هەروەها ئەو دوعایەی تری کە دەفەرمووێ: {رب اغفر لي ذنبـي وتب علي إنك أنت التواب الرحيم}.

ئـەم قەدەغـە کردنـەش لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە کـە دوعایـان بـۆ نـەکات نابێتـە بەڵگـە لەسـەر بەکافـر دانانیـان، لەوانەیـە لەبـەر حیکمەتێـك بـێ کـە لێـمان ونـە، وەك پێشـتر باسـمان کـرد.

سێیەم: صەڵەوات دان لە پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکە لە بەڕێزترینی عیبادەتەکان، عیبادەتیش قەبوڵ نابێ و نایەتە جێ مەگەر بە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێ، واتە: دەبێ بەو شێوەیە بێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجامی داوەو فەرمانی پێ کردووە، جا بەکردەوە ئەنجامی دابێ و بەصەحیحی بۆمان گێڕدرابێتەوە، یان بە قسە فەرمووبێتی و بەصەحیحی بۆمان گێڕدرابێتەوە، یاخود بە کۆدەنگی شەرعزانان، جا نە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە هاوەڵان کردووە صەڵەوات لە دایك و باوکی بدەن، نە هاوەڵان خۆشیان ئەم کارەیان کردووە، نە شوێنکەوتووانیش ئەم کارەیان کردووە، نە ئەوانەش کە دوای شوێنکەوتووان هاتوون.

زانایــان بەمانــا ڕواڵەتیەکـەی و بەتایبــەت لەکاتــی تێکگیرانــدا گوتوویانــە: چاولێکـردن و شـوێنکەوتن باشـترو چاکـترە لـە ئـەدەب نوانـدن، بـۆ نموونـە:

هــەر لەبـەر جێبەجـێ کردنـی ئـەو بنچینەیـەی کـە باسـمان کـرد وەك ئیحتیـات وەرگرتنێـك تێبینـی ئـەوە دەکەین کە پێشــەوا شـافیعی لـە کتێبـی (الأم)دا کاتـێ نـاوی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەهێنـێ ناڵـێ: (سـیدنا محمـد)، بەڵکـو دەڵـێ: (محمـد ﷺ).

هــەروەك لـــە هەنــدێ حاشــیەی کتێبـــی (التحفــة)ی ئیــبن حەجـەردا هاتـووە هەنـدێ لـە خەڵکـی پێشـنیاری ئـەوە دەکـەن کـە وشـەی (سـیدنا) زیـاد بکـرێ لەکاتـی بانـگ و قامەتـدا، هەمـوو شــەرعزانان ئەمــە ڕەت دەکەنــەوە بــەوەی کــە ئــەم شــتە نەهاتــووە (واریــد) نەبــووە، نــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرمانــی پــێ کــردووە، نــە هــاوەڵان یاخــود شــوێنکەوتووان ئــەم کارەیــان کــردووە، ئەمــە

سـەرەڕای ئـەوەی لێـرەدا واتـە: لـەم مەسـەلەیەدا -ئاسـانكاری و دەسـت كراوەیـی- لەپێشتریشـەو نزیكتریشـە ئەگـەر درووسـت بـێ، لەچـاو مەسـەلەی صەڵـەوات دان لـە دایـك و باوكـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، لەگـەڵ ئەوەشـدا شـەرعزانان ئـەو زیادەیەشـیان قەبـوڵ نەبـووەو ڕەتیـان كردۆتـەوە.

ئەگـەر قەناعەتـت بـۆ درووسـت نەبـێ بـەو بنچینـە (قاعیدەیـەی) كـە زانایـان هێناویانـەو باسـیان كـردووە، دەڵێـن: (الأمتثـال خـير مـن الأدب) چاولێكـردن باشـترە لـە ئـەدەب نوانـدن، ئـەوا ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەبیـر خـۆت بهێنـەوە كـە دەفەرمـووێ: {هـەر كەسـێك شـتێك دابهێنـێ لـەو كارەی ئێمـە هێناومانـە تێشـی دانەبـێ ئـەوا ڕەت دەكرێتـەوە} خـوای پەروەردگاریـش دەفەرمـووێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٢١﴾ ﴾[1] الشـوری.

هەروەها لەكۆنەوە زانایان گوتوویانە:

كل خير في اتباع من سلف   كل شر في ابتداع من خلف

واتـە: هەمـوو خێـرو چاكەیـەك لـە شـوێنكەوتنی پێشـین دایـە، هەمـوو خراپەیەكیـش لـە داهێنراوەكانـی پاشـین دایـە.

---

(١) واتـە: (ئایـا ئـەو بێباوەڕانـە ڕازیـن بـە بەرنامـەی خـوا) یاخـود شـوێنی ئـەو هاوەڵگەرانـە دەكـەون كـە بەنـاوی دینـەوە بەرنامەیـان بـۆ دانـاون پەیڕەویـان دەكـەن بـێ ئـەوەی خـوا مۆڵەتـی دابێـت و پێـی ڕازی بێـت (حـەلاڵ و حەرامیـان بـۆ دیـاری بكـەن).

ئەنجامەكـە ئەوەيـە وەك هەمـوو شـەرعزانان هێناويانـە: درووسـت نييــە دەستپێشــخەری بـۆ ئەنجامدانــی هيــچ كارێــك بكــرێ وەك ديندارِيــی، مەگــەر دوای زانينــی حوكــم و بڕيــاری خــوا لەبارەيـەوە، ئايـا بـۆ چ دەقێـك دەگەڕێينـەوە لـە دەستپێشـخەريمان بۆ ئـەم بيدعەيە؟

ئــەو كەســەش كــە بانگەشــەی ئــەوە دەكات بەهــۆی ئــەم بيدعــەوە خۆشەويســتی خــۆی بــۆ پێغەمبــەری خــوا ﷺ جێگيــر دەكات، هيــچ شــاهێدو بەڵگەيەكــی نييــە لەســەر ئــەو قســەيەی، خــوای بــەرزو مــەزن دەفەرمــووێ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى ﴾ (٣١) آل عمـران، پێغەمبــەری خــواش ﷺ فەرموويەتــی: {خواتــان خـۆش بـوێ لەسـۆنگەی ئـەو نيعمەتانـەوە كـە وەك خۆراكێـك پێتان دەدا، منيشـتان خـۆش بـوێ لەبـەر خۆشويسـتنی خـوا بۆمـن}، وەك دەبينيــن پێغەمبــەری خــوا ﷺ خۆشويســتنی ئێمــە بۆخــۆی، گــرێ دەدا بـە خۆشويسـتنی خـوا، نـەك بەشـتێكی تـر، بنچينـەو بناغـەی ئەمــەش بريتييــە لــە شــوێنكەوتنی خــودی پێغەمبــەر ﷺ خــۆی.

بەڵكـو مـن وای دەبينـم ئەگـەر وشـەی (ووالديـە) بخرێتـە نێـو صەڵـەوات دان ئـەوا صەڵەواتەكـە باتـڵ دەكاتـەوە.

نـەك هـەر ئـەوە لەمەسـەلەی زۆر بچووكتريـش ئينسـان دەبـێ وريـا بـێ، ئەوەتـا لـە هەنـدێ كتێبـی فيقهيـدا بەرچـاوم كەوتـووە ئەگـەر نوێـژ خوێـن بڵـێ: (سـمع اللـه لمـن حمـد) بـێ ئـەوەی (هــ) ائەكـە، كـە ڕانـاوە دەربـبـڕێ نوێژەكـەی باتـڵ دەبێتـەوە، هـۆكاری باتــڵ بوونــی نوێژەكەشــی ئەوەيــە كــە نەگوتنــی (ڕاناوەكــە) وا لــە ڕِســتەكە دەكات ببێتــە رســتەيەكی بێگانــەی فەرمــان پێنەكــراو

لەنـاو نوێـژدا، ئەمـە ئەگـەر یـەك ڕانـاو كـە (هـ)ائـە نەیڵـێ، ئـەی دەبـێ ئەگـەر وشـەیەك زیـاد بكـەی چـۆن بـێ، كـە پێچەوانـەی فەرمانێكـی ڕوون و ئاشـكرای پێغەمبـەری خوایـە ﷺ.

هـەر لـەو ڕووەوە دەگێڕنـەوە پیـاو چاكێـك خـەون بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەبینـێ، بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەڵـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئایـا تـۆ فەرمووتـە: (الحیـا مـن الإیـمان) (بەبـێ هەمزەكـە دەیڵـێ)، پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرمووێ نەخێـر، كابـرا بەبەردەوامی پرسـیارەكەی دووبـارە دەكاتـەوە، پاشـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە كابـرا دەفەرمـووێ: بەڵكـو مـن فەرموومـە {الحیـاء مـن الإیـمان}!!

لەهەمـــوو ئـــەو بەڵگانـــەوە بۆمـــان ڕوون دەبێتـــەوە واجبـــە لەسـەر ئێمـە شـوێنكەوتەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بیـن، بەپاسـاوی خۆشویسـتنی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە ئـارەزووی خۆمـان شـت دانەهێنیـن، بەڵكـو ئەگـەر ئێمـە ڕاستگۆین لـەو بانگەشـەیەمان كـە پێغەمبـەری خوامـان ﷺ خـۆش دەوێ، بـا گـوێ لـەو فەرمایشـتەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بگریـن كـە دەفەرمـووێ: {مـن و ئـەو كەسـەی كەفالەتـی بـێ باوكێـك دەكات ئاوایـن} ئامـاژەی بـە پەنجـەی ناوەڕاسـت و شـەهادەی كـرد، پاشـان هـەوڵ بدەیـن ماناكـەی جێبەجـێ بكەیـن بەبەخشـینی مـاڵ و، بەخـۆ مانـدوو كـردن، ئەمـە بەكردەیـی بەڵگـەی خۆشەویسـتیانە بـۆ ئـەو، نـەك بیدعەیـەك دابهێنیـن كـە خـوای پـەروەردگار فەرمانـی پـێ نەكردوویـن، پاشـانیش بانگەشـە بـۆ بیدعەكەمـان بكەیـن و فیتنـەو جیاوازیـی درووسـت بكەیـن لـە پێناویـدا، ئـەم كارە درووسـت كردنـی خراپەكارییـە لەسـەر زەوی، خـوای گـەورەش خراپەكارانـی خـۆش

ناوێــن، بەڵكــو خــوای پــەروەردگار ئــەوەی بــۆ بەندەکانــی پــێ خۆشـە کـە شـوێن فەرمانەکانـی بکـەون، هەروەهـا دوور بکەونـەوە لــە بیدعــەو داهێــنراو.

ئەگــەر ڕێگایەکــی ئاســانت دەوێ بــۆ گەیشــتن بــە ڕەزامەنــدی خــواو نزیـك بوونـەوە لـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ، ئـەوا ڕێگایـەك هەیـە نە پێویسـت بەبەخشـینی ماڵێکـی زۆر دەکات، نـە پێویسـت بـە هـەوڵ و کۆشــش و خــۆ مانــدو کردنــی جەســتەش دەکات، شــوێن ئەو شــێوازە بکــەوە کــە هاتــووە لەبــارەی صەڵــەوات دان لــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ، ئــەو صەڵەواتــەی کــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ ئــاگاداری کردووینەتــەوە لــە پاداشــتە گەورەکـەی ئەگـەر لەسـەری بـەردەوام بیـن.

گێڕدراوەتــەوە کــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرموویەتــی: هەر کەســێ دوای هەمــوو واجبــەکان بڵــێ: {خوایــە! وەســیلە بــە موحەممــەد ﷺ ببەخشــە، بیکــە بــە خۆشەویســتی هەڵبژێــردراوان، پلــەی بــەرز بکــەوە بەســەر جیهانیــان، لــە نزیکخراوانــی خــۆت باســی بکــرێ} هــەر کەســێ ئــەم نزایــە بــکات ئــەوا شــەفاعەی منــی بەردەکــەوێ.

لـە کۆتاییـدا هـەر کەسـێك بیـەوێ دەسـت بـە دینەکەیـەوە بگـرێ، ئیمانیشــی تەحقیــق بــێ، بەڕاســت و درووســتی نزیــك بێتــەوە لــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ، بــا لــەو قســەیە ورد بێتــەوەو کاری پــێ بــکات، مــن هیــچ مەبەســتێکم نەبــووە لــە نوســینیدا جگــە لــە ڕەزامەنــدی خوا.

اللهم ألهمنا رشدنا وأعذنا من شرور أنفسنا، وارزقنا نعمة الإخلاص لوجهك الكريم، وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

## پوختەی ئەو وەسیەتەی کە لەسەردەمی گەنجێتیدا بۆ کوڕە تاقانەکەی نووسی[1]

ئـەی ڕۆڵـە! ئامۆژگاریـت دەکـەم بـە بیرکردنـەوە لەخـۆت، لـە ئاوێکـی بـێ نـرخ و بەهـۆی دایـك و باوکتـەوە درووسـت بوویـت و خەڵـق کراویـت، هــەروەك ئەوانیــش (دایــك و باوکیشــت) هــەر بەهەمــان شـێوە درووسـت بـوون، بـەم شـێوەیە درێـژ بۆتـەوە تــا باوکــان ئــادەم، خــوای پــەروەردگار (ئادەم)یشــی بــە توانــاو دەســەڵاتی خــۆی لــە گڵ درووســت کــرد، وەك لــە کتێبــە ڕوون و ئاشــکراکەیدا دەفەرمــووێ: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ﴿٥٩﴾ ﴾[2] آل عمــران، هەروەهــا ئــەو فەرمایشــتەی

---

(١) ئـەو پوختـە کردنەوەیـە مانـای ئـەوە نییـە کـە شـێوازی نووسـینەکەم گـۆڕی بـێ، هەرچـی تـۆ لێـرەدا دەیخوێنیتـەوە هەمـان ئـەو دەقانەیـە کـە نوسـیویەتی، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی پەیامەکـە دوورو درێـژ بـوو ئـەو شـتانەم تێـدا لاداون کـە دەکـرێ خۆتیـان لـێ بێنیـاز بکەیـت، ئەوەنـدەم هێنـاوە کـە گرنگترینـە لەنێـو قسـەکانی، ئەگـەر هەسـتت بـە جیاوازییـەك کـرد لەنێـوان ئـەو وەسـیەتەو دوو وتارەکـەی پێشـتر ئـەوا لەبـەر ئەوەیـە کـە ئـەو کاتـەی باوکـم ئـەو وەسـیەتەی نووسـی تـازە بـوو لـە زمانـی عەرەبـی و بەکارهێنانـی، بـۆ زانینـی هـۆکاری نووسـینی ئـەو وەسـیەتەش سـەیری لا () بکـە.

(٢) واتـە: بەڕاسـتی نموونـەی درووسـتبوونی عیسـا لەلایـەن خـواوە، وەك نموونـەی ئـادەم وایـە کـە لـە خـاك دروسـتی کـرد.

کــە دەفەرمــووێ: ﴿إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾﴾[1]ص، زانیــت تــۆ بەدیهێنراویــت، وە هەمــوو ئەوانــەی غەیــری تــۆن لــە ئاســمانەکان و زەویــدا بەهەمــان شــێوەی تــۆ بەدیهێــنراون، لەمــەدا هیــچ جیاوازیــەك نیــە لەنێــوان تــۆو ئەوانــدا، جگــە لــە خــودای زاڵــی کاربەجێــی هەربــوو (ئــەزەل)ی، خــودا درووســتکەرەو دروســتکراو نیــە، بەدیهێنــەرەو بەدیهێــنراو نیــە، ســەرەتایەك و کۆتاییــەك نییــە بــۆ بوونــی، لــە هەمــوو سیفەتەکانیشــیدا جیــاوازە لــە بەدیهێنراوانــی، ئەگــەر شــتێکی کــەم لــە ســیفەتەکانی بەدیهێنراوانــی خــۆی تێــدا بــێ ئــەو کاتــە بەکەڵکــی پەرســتن نایــەت و ناشــێ ببێتــە پەرســتراو، ئەمــەش شــتێکی شــاراوە نیــە لــەلای خاوەنانــی عەقــڵ و ژیــری.

ئەگــەر زانیــت کــە خــۆت و هەمــوو بەدیهێنراوانــی دیکــە بەدیهێــنراون، زانیــت کــە درووســتکراوان درووســتکەرێکیان هەیــە لــە عەدەمــەوە ئەوانــی درووســت کــردووە بــێ بوونــی هیــچ ماددەیــەك، ئــەو دروســتکارەش بریتییــە لــە خــوای ڕۆزی دەری ژیێنــەری مرێنــەر، ئــەو خوایــەی کــە هــەر شــتێکی بیــەوێ دەتوانــی جێبەجێــی بــکات، لــە زاتیــدا هیــچ هاوبــەش و شــەریکێکی نیــە، واتــە: چەنــد خوایــەك بوونیــان نیــە، لــە سیفاتەکانیشــیدا بەهەمــان شــێوە هاوبــەش و شــەریکێکی نیــە، نــەك لــە هەمــوو ســیفاتەکانیدا بەڵکــو لــە هەندێــك لــەو سیفاتانەشــدا هیــچ کەســێك و هیــچ شــتێك شــەریکی نیــە، خودایەکــی بەپاکگیــراو لــە چەندێتــی و چۆنیەتــی و شــوێن و کات، ئــەو خوایــەی وەك چــۆن تــۆی درووســت کــردووە،

---

(١) واتە: من دەمەوێت بەشەرێك لە قوڕ درووست بکەم.

هەموو شـتەکانی دیکەشـی درووسـت کـردووەو مشـوریان دەخوات، بـە دڵنیاییەوە حیکمەتێك لەپشـت درووسـتکردن و بەدیهێـنران هەیە، خـوای پـەروەردگار پاکـترە لـەوەی کارێـك بـکات حیکمەتێـك لەپشـتیەوە نەبـێ و هـەر بـۆ گاڵتـە درووسـتکراوان دروسـت بـکات، وەك دەفەرمـــووێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ ﴾[1] المؤمنـــون، هەروەهـــا دەفەرمـــووێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿١٦﴾ ﴾[2] الأنبيـــاء.

حیکمەتەکـەش هـەر دەبـێ بریتـی بـێ لـە بـەڵاو تاقیکردنـەوەی مرۆڤـەکان لەوانـەی کـە ڕاسـپێرداو (موکەللەفـن)، لەبـەر ئـەو فەرمایشـتەی خـۆی کـە دەفەرمـووێ: ﴿ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٢﴾ ﴾[3] الملـك، هــەر کەسـێك ئیمانـی پـێ هەبـێ کـردەوەی چـاك ئەنجـام بـدا ئـەوا بـە فەزڵـی خـۆی دەیخاتـە بەهەشـتانێك کـە ئـاو بەژێریانـدا دەڕوات وەك چـۆن لـە کتێبـی ڕوون و ئاشـکرای خۆیـدا ئامـاژەی پـێ کـردووە، خـودای بەخشـەریش ئەگـەر پەیمانێـك بـدات وەفـای هەیـە بـۆ پەیمانەکـەی، نـەك هـەر پەیمانەکـەی دێنێتـە دی بەڵکـو بـە زیـادەوەش دەیـدات، هـەر کەسـێکیش کوفـری پـێ بـکات و بـاوەڕی پێـی نەبـێ خـوا

---

(١) واتـە: ئایـا گومانتـان وا دەبـرد کـە بەڕاسـتی ئێمـە ئێوەمـان بەبـێ مەبەسـت دروسـتکردووەو ئێـوە بـۆ لای ئێمـە ناهێنرێنـەوە؟

(٢) واتـە: ئێمـە ئاسـمان و زەوی هەرچیـش لەنێوانیاندایـە بـە گاڵتـە (بـێ مەبەسـت) دروسـتمان نەکـردووە.

(٣) واتـە: هـەر ئـەو خـۆی مـردن و ژیانـی بەدیهێنـاوە تـا تاقیتـان بکاتـەوە کێتـان کـردەوەی چاکـترو پەسـندترە.

ئێمــەو هەمــوو برایانمــان پەنــا بــدات، دەیخاتــە نێــو ئاگــرو بەهەتــا هەتایــی تێیــدا دەمێنێتــەوە.

ئەگــەر بــەو شێوەیەی شایســتەیە بیــرت لەخــۆت و لــە نیشــانەو بەڵگەكانــی غەیــری خــۆت كــردەوە، زانیــت كــە هەمــوو شــتێكی دیكــەی غەیــری خــوا بەڵگــەو نیشــانەیەكن لەســەر بوونــی خودایەك كــە بــوون پێویســت (واجــب الوجــود)ە، خــودی دونیــاش تاكــە مەنــزڵ نیــە، بەڵكــو هــۆكاری گەیشــتنە بــە ئاخیــرەت، زانیشــت كــە ئاخیــرەت خۆشــبەختی هەتــا هەتاییــە بــۆ ئیمانــداران و بەدبەختــی هەتــا هەتاییشــە بــۆ بێبــاوەڕان، بەگوێــرەی ڕواڵەتیــش ئاخیــرەت ئەنجامــی دونیایــە، بۆیــە دونیــا بكــە وەســیلەو پەلــە بكــەو هەوڵــی جــددی بــدە بــۆ بەدەســتهێنانی ڕەزامەنــدی پــەروەردگارت و جێبەجــێ كردنــی فەرمانەكانــی، كار بــۆ دونیــا مەكــە مەگــەر لــەو ســۆنگەیەوە نەبــێ وەك هــۆكارو وەســیلەیەك و بــەو ڕێگایــەش كــە شــەرع بــۆی دانــاوی.

ئاگاداربــە ڕۆڵــە! ئەگــەر لــەوە گەیشــتی كــە باســمان كــرد، ئــەوا گــوێ بگــرە بــۆ ئــەو قســەیەی تــر، زۆر بەجوانــی و بــە شایســتەیی بیــری لــێ بكــەوە ئــەی ســەعید! كاریشــی پــێ بكــە، چونكــە كار پێكردنــی هــۆكاری بەدەســت هێنانــی ژیانێكــی ئەبەدییــە لەلایــەك، لەلایەكــی تریشــەوە ڕاســت و ڕێــك ڕۆیشــتنە لەژیانــی دونیــا، ئەوەی دەمــەوێ پێــت بڵێــم ئەوەیــە:

بزانــە كــە خــوا بەهەشــت و دۆزەخــی درووســت كــردووە، شــتانێكی دیكــەی زۆری دروســت كــردوە كــە خــۆی نەبــێ كــەس

نازانـێ وەك: فریشـتەكان و ئینسـانەكان و جننـەكان و هەمـوو گیانـداران و بـێ گیانانیـش، هیـچ یەكێـك لـەو درووستكراوانەشـی ڕانەسـپێراوە بـە ئەنجامدانـی عیبـادەت، غەیـری ئینسـانەكان و جننـەكان، وەك دەفەرمـووێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾[1] الذاریـات، ئینسـانی درووسـت كـردووە حـەزە دەرونیەكانیشـی تێـدا دروسـت كـردووە، لـە مەیـل و ئـارەزووی بـۆ خـواردن و پۆشـاك و قسـە كردنـی دونیایـی و ڕوانینـی حـەرام، هەروەهـا ئـارەزووی داوێـن و حەزكـردن بەمـاڵ و پۆسـت و پلـەو پایـە، هەروەهـا خۆبەگـەورە زانیـن و ڕق و حەسـادەت و نەمیمـی و غەیبـەت، هەروەهـا كات كوشـتن و حـەز كـردن بـە تەمبەڵـی و پشـوودان، تەمبەڵـی نوانـدن لـە پەرسـتش و خـۆ مانـدوو نەكـردن، ئەمـە سـەرەڕای دەسـەڵاتی شـەیتانە جننـی و ئینسـیەكان، پاشـان ڕایسـپاردوون بـەواز هێنـان لـەو ئـارەزووە دەرونیانـە، مەگـەر بـە ڕێگایەكـی شـەرعی، ڕایسـپاردوون بـەوەی شـوێن هـەواو ئارەزووەكانیـان نەكـەون و گوێڕایەڵـی ئامۆژگاریەكانـی شـەیتانە ئینسـی و جننیـەكان نەكـەن، وەك دەفەرمـووێ: ﴿ إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴿٦﴾ ﴾[2] فاطر، وە دەفەرمووێ: ﴿ فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَىٰ ﴿١٣٥﴾ ﴾[3] النسـاء، هەروەهـا دەفەرمـووێ: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ﴿٩﴾

---

(١) واتـە: بێگومـان مـن پـەری و ئادەمیـزادم درووسـت نەكـردووە تەنهـا بـۆ ئـەوە نەبێـت كـە مـن بپەرسـتن و فەرمانبـەردارم بـن.

(٢) واتـە: چونكـە بەڕاسـتی شـەیتان دوژمنتانـە، ئێـوەش بـە دوژمنـی خۆتانی دابنێن.

(٣) واتە: نەكەن شوێن ئارەزووی نەفس بكەون.

وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾[1] الشمس، کەوابێ ئینسان ڕاسپێردراوە بە خۆ پاکو چاك کردن و جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و دوور کەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکان، بۆیە پێویستە هەوڵ بدەیت و بەو شێوەیەی کە شایستەیە تێبکۆشیت بەرامبەر بە شەیتان و نەفس، بەیارمەتی خوای بەبەزەیی.

هیچ شاراوەش نیە ئەو تێکۆشانە پێویستی بە زانست هەیە، ئەو پاڵەوانەی کە زۆرانبازی لەگەڵ دوژمنەکەی دەکات ئەگەر زیرەك و شارەزا نەبێ لە یاساو بنچینەکانی شەڕکردن و، فێڵەکانی شەڕ نەزانێ، ئەوە هەر لەسەرەتاوە ژێر دەکەوێ.

ئێستا ئەگەر بمانەوێ بگەڕێینەوە بۆ دینەکەمان و گوێڕایەڵی خاوەنی خۆمان بکەین و ببینە بەڕێزترینی ئۆممەتەکان پێویستە لەسەرمان خۆمان شارەزا بکەین لە دین، بەو چاوەو بەشێوەی هەقیقی خۆیشی سەیری دونیا بکەین کە چەند بێنرخە، ورد بینەوە لەو فەرمایشتە صەحیحەی کە ئیبن و عومەر خوا لێیان ڕازی بێ بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شانی گرتم و پێی فەرمووم: {لە دونیادا بەشێوەی غەریبەیەك یان ڕێبوارێك بژی}، لە گێڕانەوەی ترمزیدا ئەمەشی بۆ زیاد کردووە {خۆت وەك یەکێك لە خەڵکی گۆڕستان هەژمار بکە}.

---

(١) واتە: بەڕاستی ئەو کەسە سەرفرازە کە نەفسی پاك و پوختە کردووەو ئیمان و ترسی خوای تیادا ڕواندووە، بێگومان نائومێد بوو ئەو کەسەی نەفسی خۆی ناپوخت کردو ئالودەی گوناهو تاوان و خراپەی کرد.

دوای ئـەوەی حیکمەتـی درووسـت بـوون و هەقیقەتـی خـۆت زانـی، زانیـت بەندەیەکـی فەرمانپێکـراوی لەلایـەن خاوەنەکەتـەوە کـە دەبـێ پارێـزکار بیـت و کار بـۆ دوارۆژت بکەیـت، زانیـت دونیـا ئالەتێکـە بـۆ کارکـردن بـۆ ئاخیـرەت، هەروەهـا زانیـت کـە ڕاسـپێردراوی بـە حوکمـە شـەرعیەکان لەهەمـوو بـارو دۆخێـك، ڕاسـپێردراوی بـە ئەنجامدانـی هەمـوو ئـەو کردەوانـەو تێیانـدا سەرپشـکی، وریابـە لەهەمـوو هەنگاوێـك کـە دەیهاوێـی و قسـەیەك کـە دەیکـەی، دەبـێ هەمـووی بـە نیەتێکـی بـاش و چـاك بێـت، ئەگینـا دەبێتـە یەکێـك لـە گوناهـەکان ئەگـەر نیەتـت گونـاح و تـاوان بـێ، ئەگـەر ئـەو شـتانەت هەمـوو زانـی ئـەو کات بـەدڵ و بـە نیەتێکـی پاکـەوە ڕوو لەخـوا بکـە، وابکـە مەبەسـتەکانت بـۆ ڕەزامەنـدی ئـەو بـێ، ئەوانـەت خـۆش بوێـن کـە ئـەو خۆشـی دەوێـن، واز لـە نەفـس و شـەیتان بێنـە، ئـەو دووانـە دەیانـەوێ لـە نـورو ڕوناکیـەوە دەرت بهێنـن بـەرەو تاریکیـەکان، خـوای گەورەش دەیـەوێ لـە تاریکیەکانـەوە دەرتبێنـێ بـۆ ڕوناکـی، خـوای بـەرزو مـەزن دەفەرمـووێ: ﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ ﴿٢٥٧﴾ ﴾[1] البقـرة.

---

(١) واتـە: خـوا پشـت و پەنـاو خاوەنـی ئـەو کەسـانەیە باوەڕیـان هێنـاوە، لـە تاریکاییەکانـی (گومـان و سـتەم) دەریـان دەهێنێـت و دەیانبـات بـەرەو نـوورو ڕووناکـی، ئەوانـەش کـە ڕێبـازی کوفریـان گرتۆتە بـەر، یارمەتـی دەرەکانیـان تەنها تاغوتەکانـن لـە نـوورو ڕوناکـی دەریـان دەهێنـن بـەرەو تاریکاییـەکان دەیانبـەن، ئا ئەوانـە نیشـتەجێی نـاو ئاگـری دۆزەخـن و بـۆ هەمیشـە تیایـدا دەمێننـەوە.

ئەگـەر ڕاسـتگۆیانە ڕووت کـردە خـوا، پێویسـتە سـەرەتا خـۆت فێـری زانسـت بکـەی، گێڕدراوەتـەوە کـە: {خـوا لـە دۆسـتێکی نــەزان وەرناگــرێ، ئەگــەر لێــی وەرگرتایــە شــارەزای دەکــرد} مەبەســت لــە نــەزان ئــەو نەزانەیــە کــە نەزانــە بــە زانســتە پێــدراوەکان (وەهبیــەکان)، هەرچــی نەزانینــە بــە بنچینەکانــی زانسـتە زاهیریـەکان کـە خـۆ شـارەزا کـردن و فێـر بوونیـان واجبـە ئـەوە ئـەرك و واجبـی سـەر هەمـوو مسـوڵمانانە، لـە پێویسـتیەکانی فێربوونـی ئـەو جـۆرە فێربوونانـە ئـەوە نیـە فێرخـواز وەلـی بێـت، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: {زانسـتخوازی فـەرزە لەسـەر هەمــوو مســوڵمانێك}.

بـەڵام ئـەو زانسـتانەی کـە وەسـیەتت بـۆ دەکـەم لێیـان دوور بکەویتـەوە سـێ جـۆرن: حـەرام، ناپەسـند، ڕێگـە پێـدراو (مبـاح)، ئـەوەی یەکەمیـان کـە حەرامـە بریتیـە لـە فەلسـەفە[1]، شـەحوزە، سـیحر، بورجـەکان، تەبائیعیـەکان، هەرچــی زانســتە ناپەســندو مەکروهەکانــە وەك: غــەزەل و شـیعرە بەتـاڵ و بـێ سـەروبەرەکان،

---

(١) دواتــر باوکــم پشــتی بــەو بۆچوونــەی جمهــور دەبەســت لــەوەدا کــە دیراســە کردنــی فەلســەفە درووســتە، بــۆ ئــەو کەســانەی کــە خاوەنــی زانسـت و زانیـاری فراوانـن و ڕاسـتیەکانی هەقیقەتـی عەقیـدەی ئیسـلامیان لەمێشـکیدا چەسـپیوە، هـەر لەسـەر ئـەو بنچینەیـەش دواتـر گرنگتریـن بەشـەکانی فەلسـەفەی پـێ گوتـم کـە بریتییـە لـە (المقـولات العـشر)، لـەو بـارەوە خاوەنـی (السـلم) دەڵـێ:

والقولة المشهورة الصحيحة　　جوازه الكامل للقريحة
ممارس السـنة والكـتاب　　ليهتدي به إلى الصواب

هەرچـی سێیەمیشـە کـە بریتیـە لـە زانسـتە ڕێگـە پێـدراوەکان ئـەو زاستانەیە کـە شـتی پـڕو پـوچ و ناپەسـندی تێـدا نیـە.

ئەگــەر دەتــەوێ فێــر بیــت لەڕۆژانـــی فێربوونتــدا هۆشــیاربە نەفسـی خـۆت بگـرەوە لـە سـەرپێچی و تـاوان، وەك هەنـدێ لـە قوتابیانـی ئـەم سـەردەمە مەبـە، کـە لا ناکەنەوە بـەلای ئەو شـتانەدا کـە زانسـت و فێـر بـوون لەسـەریان پێویسـت دەکات، ئـەوەی فێـری بوونـە پشـتگوێی دەخـەن، ڕۆژانـی پشـوو وەك و شـەوو ڕۆژی هەینـی دەچـن بەشـوێن هـەواو ئارەزوەکانیـان، ئاگایـان لـەوە نیـە کـە خۆیـان بێبـەش کـردووە لـە پاداشـت و گەورەیـی ئـەو کاتـە، لەولاشـەوە خەڵکانـی ئاسـایی چاویـان لـێ دەکـەن و شـوێنیان دەکـەون لەبـەر ئـەوەی گومانـی باشـیان پـێ دەبـەن و وای دەبینیـن کـە ئـەوان ئەهلـی عیلمـن، لەبـەر ئـەوە خۆیـان گومـڕا بوونـەو خەڵکیـش گومـڕا دەکـەن، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی کـە شـەوو ڕۆژی هەینـی دوو کاتـن بـۆ تاعـەت و پاڕانـەوەو صەڵـەوات دان، بـەڵام بەهـۆکاری گاڵتـەو گـەپ و زێدەڕۆیـی خۆیـان بێبـەش دەکـەن لـەو فـەزڵ و بەخششـە گەورەیـەی لـەو کاتـەدا هەیـە.

ڕۆڵـە! پوختـەی قسـان ئەوەیـە مـن وەسیەتت دەکـەم بـە شـوێن کەوتنـی قورئـان و سـوننەت، لەهەمـوو هەڵسـان و دانیشـتنێکدا، واز لـە بیدعەکانـی خەڵکانـی ئـەم سـەردەمە بێنـە، بیدعـە شـەریکی هاوبەشـدانانە بـۆ خـوا، زۆر وریابـە لـە پاکـی نیەتـت لـەو شـتانەدا کـە فێـری دەبیـت یـان خەڵکـی فێـر دەکەیـت، بـەردەوام نامـۆو غەریـب بـە لەنێـوان هاوەڵانـت، ئـەو غوربـەت و نامـۆ بوونـە

شــتێکی ســتایش کــراوە، لەبــەر ئــەو فەرموودەیــەی پێغەمبــەری خــوا ﷺ کــە دەفەرمــووێ: {ئایــن بــە غەریبــی هــات، بەغەریبیــش دێتــەوە وەك چــۆن بــە غەریبــی هــات، خۆشــی و ســەرفرازی بــۆ ئەوانــەی لــە غەریبانــن}، لەهیــچ کات و ســاتێکدا بــێ ئــاگا مەبــە لــە خــوا.

نەفســی خــۆت پــاك بکــەوە لــە شــتە ناپەســندەکان و نەخۆشــییە قەلبیــەکان، وەك تــوڕە بــوون و ڕك و کینەو حەســودی و خۆ بەپەســند زانیــن و ڕیــاو فەخــر بەخــۆ کــردن و ســوور بــوون لەســەر دونیــاو تەماحــی و ڕژدیــی و خۆشەویســتی پلــەو پایــە، چونکــە لــە فــەرزە عەینیەکانــە کــە ئەمانــە بناســیت و بزانیــت، وە شــارەزای هــۆکارو چارەســەریەکانیش بیــت.

ئــەی ڕۆڵــەم! وەســیەتت دەکــەم بــە: لەگــەڵ خــۆدا تێکۆشــان و خــۆ ڕاهێنــان و دوعــا کــردن و پاڕانــەوە لەخــوا کــە یارمەتیــت بــدات، لا مەکــەوە بــەلای قوڕســی ئــەو کارانــە لەســەر دڵ و دەروونــت، چونکــە زۆربــەی میــوەکان بــەر لــەوەی پێبگــەن تفــت و تــاڵ و ناخۆشــن، پاشــان پێدەگــەن، دونیــاش هەرچەنــدە ســەرەتاکەی شــیرینە لــەلای ئەهلــی دونیــا، بــەڵام خواردنێکــی ژەهراویــە لــەلای بەرچــاو ڕۆشــنان، گوێڕایەڵــی خــواش هەرچەنــدە لەســەرەتاوە قوڕســە بەتایبــەت لەســەر نەفســی فەرمانکــەر بــە خراپــە، بــەڵام شــیرینە، بەڵکــو هیــچ شــتێك نیــە لــەو شــیرینتر بێــت لــەلای خاوەنانــی نەفســی ئارامگرتــوو موتمەئیننــان، واز هێنــان لــە دونیــا هــۆکاری پشــوودانی جەســتەیە لەدونیــاو ئاخیــرەت، بــەڵام

زیـاد خۆشویسـتنی دونیـا دەبێتـە هـۆکاری کەوتنـە نێـو حـوزن و دڵتەنگــی و خەفەتبــاری خاوەنەکـەی.

ئـاگادارت دەکەمـەوە لـە خۆشویسـتنی پلـەو پایـە، کـە بریتییـە لــە هەوڵدانــی ئینســان بــۆ ئــەوەی گەورەبــێ لەدڵــی خەڵکیــدا، چارەسەریەکەشــی ئەوەیــە بزانیــت ڕازی کردنــی دڵــی خەڵکــی لەخـۆت هیـچ سـودێکت پـێ ناگەیەنـێ، لەبـەر ئـەوەی ئینسـانەکان باقــی نییــن و نامێننــەوە.

سـەیری فیرعـەون ناکـەی چەنـدە بەگەورەیـان دەگـرت تـا ئـەو ڕاددەیــەی دەیانپەرســت، بــەڵام دواتــر چیــی؟ خــۆی و ئەوانــەش کــە دەیانپەرسـت بـەرەو کـوێ چـوون؟ ڕۆڵـە! هەرچەنـدە بتـەوێ بەگــەورە بگیرێــی لەنێــو دڵــی خەڵکیــدا ناگەیتــە دەیەکــی ئــەو گەورەییـەی ئـەو، بـەڵام ئەگـەر لەگـەڵ دەروونـی خۆتـدا تێبکۆشـی بەتەقـوای خـواو ڕازی کردنـی خـوا لەخۆت، ئـەوا ئینشـائەڵڵا ژیانی ئەبـەدی بەدەسـت دەهێنیـت، ڕازی بوونـی ئـەو دەبێتـە هۆکارێـك بۆ ڕازی بوونـی خەڵـك لەتـۆ، دڵـەکان هەمـووی بەدەسـتی ئـەون چۆنی بـوێ ئـاوا وەریاندەگێـڕێ.

بەدەســت هێنانــی پلــەو پایــە هۆکارێکــە بــۆ بەدەســت هێنانــی کەماڵێکــی وەهمــی نــەك هەقیقــی، ڕێــزو پێــزت لــەلای خەڵکــی کارێکــی وەهمیــەو هیــچ هەقیقەتێکــی نیــە، وەك کەفــی ســەر ئــاو وایــەو زوو لەنــاو دەچــێ، وەك چــۆن زانیــاری هەبــوون بــە زانســتە گــۆڕاوەکان کەماڵێکــی وەهمیــەو زوو دەگــۆڕێ بــۆ نەزانیــن، بــۆ وێنــە زانیاریـت هەبـێ بـەوەی زەیـد لـە ماڵەوەیـە، بـەڵام کـە لەماڵ

دەرچـوو زانینەكـەت دەگـۆڕێ بـە نەزانیـن، بـەڵام زانسـتت بـە زانیارییـە سـابت و جێگیـرەكان وەك زانیارییـت بـە بوونـی خـوا، خوایـەك كـە بەهەمـوو سـیفاتێكی تـەواوو وەسـف دەكـرێ، پاكـە لـە هەرچـی سـیفاتێكی كـەم و كـوڕو ناپەسـند، ئەمـە كەماڵـی هەقیقییـە نـە لـە ژیانـی دونیـاو نـە لـە كاتـی مردنـدا لەنـاو ناچـێ.

پاشـان ئـەی ڕۆڵـە! ئەگـەر زانیاریـت پەیـدا كـرد بـە هەقیقەتـی نەخۆشـیەكانی دڵ و هۆكارەكانـی و چارەسـەریەكانی، زانیـاری بـەم شـتانە فەرزێكـی عەینیـە لەسـەر هەمـوو ئیماندارێـك، ئـەو كاتـە دەزانیـت كـە پێویسـتە هـەوڵ بدەیـت جیهـاد بكەیـت لەپێنـاو پاككردنـەوەی دڵـت لـە نەخۆشـیەكان و لـە وەسوەسـەی شـەیتان.

پاشـان پابەندبـە بەكـەم قسـە كـردن، بەتایبـەت لـە شـتە حەرامـەكان و ناپەسـندەكان پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: {هـەر كەسـێك بـاوەڕی هەبـێ بەخـواو بـەڕۆژی دوایـی بـا قسـەی بـاش بـكات ئەگەرنـا بێدەنـگ بێـت}.

هەروەهـا ڕۆڵـە! ئەگـەر دەتـەوێ ڕێـگای پێشـین بگریتەبـەرو نەبیتـە ئامانجـی ئیبلیـس، ئـەوا دڵـت پـاك بكـەوە لـە گونـاح و تـاوان، كـەم قسـە كـردن بەگوێـرەی توانـا لەخۆتـدا بەرجەستە بكە، بەتایبـەت غەیبـەت و نەمیمـی كـردن، كـە لـەو ڕۆژگارەی خۆمانـدا خـۆ لـێ لادانیـان زۆر زەحمـەت بـووە، نـەك هـەر زەحمـەت بـووە بەڵكـو بۆتـە میـوەی سـەر سـفرەی دانیشـتنەكان و میوانداریـەكان، هەرجـارەی كـۆ دەبنـەوە خۆیـان سـەرقاڵ دەكـەن بـە بـاس كردنـی عەیـب و عـاری خەڵـك، یـان قسـەی یەكێكـی دیكـە نەقـڵ دەكـەن

بەخراپـە بـۆ ئـەوەی تـر، خـوای بـەرزو مـەزن دەفەرمـووێ: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ﴿٨٣﴾ ﴾[1] القصـص، هەروەهــا دەفەرمــووێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ ﴾[2] الحجــرات، هەروەهــا لەبــارەی خراپــی غەیبەتــەوە دەفەرمــوێ: ﴿ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ ﴿١٢﴾ ﴾[3] الحجــرات.

پاشــان هانــت دەدەم لەســەر ئــەوەی دڵــت پەیوەســت نەكــەی بەغەیــری خــوا، مەگــەر كەســەكە نێردراوێــك یــان پێغەمبەرێكــی خــوا بــێ، یـان دۆسـتێكی خـوا بـێ، خۆشەویسـتیت تەنیـا بـۆ خـوا بـێ لەغەیـری خـوا كەسـی ترت خـۆش نـەوێ، تەنیـا خۆشویسـتنی ئەوانــە نەبــێ كــە بەهــۆی خۆشویســتنیان نزیــك دەبیتــەوە لەخــوا، باقــی و لەنــاو نەچــوو هــەر خوایــە لەهەمــوو كات و ســاتێك، ئــەو خوایــە توانــاو دەســەڵاتی هەیــە بەســەر هەمــوو ئەوانــەی دەیانــەوێ زەرەرێكــت لــێ بــدەن، یاخــود ســودێكت پــێ بگەیەنــن، هــەر شــتێكی غەیــری خــۆی لەژێــر قەهــرو دەســەڵاتی ئەودایــە، هیــچ

---

(١) واتــە: (جــا بــا خەڵكــی دڵنیابــن) كــە: ئــەو ماڵــی قیامەتــەو ئەو بەهەشــتی بەرینەمــان ئامــادە كــردووە بــۆ ئــەو كەســانەی كــە نــە لــووت بــەرزی و گەورەییــان دەوێــت لــە زەویــدا نــە فەســادو گوناهــو خراپــە.

(٢) واتــە: لەڕاســتیدا هــەر ئیمانــداران بــرای یەكن كەواتــە: هەر كاتێــك لەنێوان دوو براتانــدا ناكۆكــی پەیــدا بــوو ئێــوە نێوانیــان چاك بكــەن و ئاشــتیان بكەنەوە، هەمیشــە لەخــوا بترســن و پارێزكاربــن، بــۆ ئــەوەی ڕەحمتان پــێ بكرێت.

(٣) واتــە: ئایــا كەســتان خۆشــی دێــت لــەوەی گۆشــتی بــرای خــۆی بــە مردویــی بخــوات؟! دیــارە كاری واتــان زۆر پــێ ســەخت و ناخۆشــە.

کەسێ توانـای گەیاندنـی زەرەرێـك یـان سـودێکی نیـە بەبـێ ئـەو، ئەگـەر کەسێکی تـرت پێـش خسـت بەسـەر ئـەودا ئـەو کاتـە ئـەو پێشخســتنە گێلـی و نەفامییــە، بەڵکـو شـێتاتییە.

ئەگــەر ســەرپێچی ئەوشــتەت کــرد کــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ هێناویەتـی ئـەو کاتـە نەکـەی بلێـی خـوام خـۆش دەوێ و وازم لەدونیــا هێنــاوە، بەڵگــەی خۆشویســتنی خــوا جێبەجــێ کردنــی فەرمانەکانــی و دوورکەوتنــەوە لــە قەدەغــە کراوەکانیەتــی، نــەك بەتەنیــا مەیلێکــی دەروونــی بــێ و بــەس.

پاشـان چەنـدی دەتوانـی لەخـوا بترسـە، تـۆ نازانـی لەسـەر کام لا کۆتایـی بـە ژیانــت دێ، تــۆ ئەگــەر لــە ژیانتــدا بەبەردەوامــی گوێڕایەڵـی خـوای پـەروەردگارت کـرد نازانـی ئایـا لێـی قەبـوڵ کــردوی و یــان ڕەتــی کردۆتــەوە، لەگــەڵ ئەوەشــدا خــوای پــەروەردگار دەفەرمــووێ: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ﴿٩١﴾ ﴾ الأنعـام، هیـچ کات وات لـێ نایـە شایسـتەی بەهەشـت بیـت بەهـۆی تاعـەت و گوێڕایەڵیـت، ئەگـەر هـات و بەئەنـدازەی هەمـوو ئینسـانەکانیش تاعــەت بکەیــت، تــۆ نازانــی توڕەبوونــی خــوا بەهــۆی کامــە گوناهــەوە توشــت دەبــێ، خــوای پــەروەردگار پەنامـان بـدات، بـا زۆرتریـن ترسـت لـە عاقیبـەت خراپـی بێـت، خـوای پـەروەردگار ئێمـەو هەمـوو ئیماندارانـی لـێ پەنـا بـدات، بـۆ ئـەوەی ئـەم ترسـە ببێتـە هۆکارێـك بـۆ هۆشـیار بوونـەوە و ئامـادە بوونـت بـۆ مـردن.

پاشـان ئـاگاداری ئەنجامدانـی نوێـژە فەرزەکانـت بـە بەهەمـوو ڕوکــن و مەرجەکانیــەوە، بەتــرس و ملکەچــی و شــەرم و حەیــاوە

ئەنجاميـان بـدە، وەك ئـەوەی کە خوای گـەورە دەبينيـت، لێپێچينەوە لەگـەڵ خۆتـدا بکـە لەبەردەسـتيدا، خـۆ ئەگـەر تـۆ ئـەو نەبينـی ئـەو دەتبينـێ، بترسـێ لـەوەی لێـت وەرنەگـرێ، بەڵکـو ئەگـەری ئـەوە بۆخـۆت دابنـێ کـە لێـت تورەیـە بەهـۆی بـێ ئەدەبـی و بـێ شـەرميت، هەسـت بـە فـەزڵ و منەتـی ئـەو بکـە بەسـەر خۆتـەوە، بـەو هەمـوو گوناهـەوە مۆڵەتـت دەدا ڕازو نيـازی لەگەڵـدا بکەیـت، دەسـت بگـرە بەنوێـژە سـوننەتەکان، هـەر کەسـێ بەیەکجـاری واز لـە سـوننەتەکان بێنـێ وايلێـدێ شـاهێدی دانـی ڕەت دەکرێتـەوە.

پاشـان وەسيەتت دەکـەم بـە پابەنـد بـوون بـە نوێـژی بەکۆمـەڵ، زانايـان دەربـارەی ئەنجامدانـی ڕاجياييـان هەيـەو بەسـەر سـێ بۆچوونـدا دابـەش بوونـە: فـەرزی کيفايـە، سـوننەتی موئەککـەدە، فـەرزی عەيـن، تـا دەتوانـی وازيـان لـێ مەهێنـە مـادەم هيـچ عوزرێکـت نيـە لـەو عوزرانـەی کـە لـە کتێبـە فيقهيەکانـدا هاتوون.

تـا دەتوانـی مەبـە بـە ئيـمام لەکاتێکـدا کەسـێکی تـر شـياوترە لەتـۆ بـە ئيمامـەت کـردن، ئەگـەر کەسـێکی شـياوتر نەبـوو ئـەو کات تـۆ واز لـە ئيمامـەت مەهێنـە بـۆ يەکێکـی تـر، بـەڵام بـا مـەرج و ئادابەکانـی ئيمامەتـت هەمـوو تێدابـێ بـەو پـەڕی ڕێـك و پێکيـەوە، چونکـە ئيمامـەت زەمانەتـە.

پوختـەی ئـەوەی کـە دەمـەوێ ئامـۆژگاری تـۆی پـێ بکـەم ئەوەيـە کار بـە سـوننەت بکـە لەهەمـوو هەڵسـان و دانيشـتنێکتدا، کار بـەو بيدعانـە مەکـە کـە خەڵکـی دايانهێنـاوە، چونکـە بيدعـە شـەريکی هاوبـەش دانانـە بۆخـوا وەکـو گوتمـان، ئـەم نزيکـی و

لەتـەك یەكـتر بوونـەی بیدعـەو هاوبـەش دانـان، وەك پەتـی ڕاوچـی وایـە كـە ڕاوی پـێ دەكات، بیدعـە وێنـەی ئـەو پەتەیـە لـە ڕاكێشـان و پەلكێـش كردنـی شـیرك، بۆیـە بـا ئـەو كردەوانـەی كـە بەجەسـتە ئەنجامیـان دەدەی یاخـود بـە مـاڵ، هەمـووی لەسـەر سـوننەت بـێ.

پاشـان ئـەی ڕۆڵـە! زێدەڕۆیـی و درێـژ دادڕی لـە قسـە كردنـدا هیـچ سـوودت پـێ ناگەیەنـێ، بەڵكـو هـەزار بەڵگـەو نموونـە سـوود بەكەسـی گێـل و مێشـك بەتـاڵ ناگەیەنـێ، كەسـێك گوێبگـرێ بـۆ كەسـێكی تـر، ئامـادە بێـت بـۆ فەرمانبەرداریـی كردنـی، یـەك نموونـە بەسسـە، لـەو نموونـە ڕادەمێنـێ و بەهۆیـەوە لـە تاریكـی دێتـە دەر، بـاش بیـر بكـەوەو گـوێ بگـرە، بـۆ ئـەوەی بەرزتریـن پێگـە بەدەسـت بهێنیـت و بـەردەوام كاری پـێ بكەیـت، خـوای بـەرزو مـەزن دوو ژیانـی درووسـت كـردووە:

یەكەمیان: (ژیانێكی ئەبەدیی)، كە بریتیە لە ژیانی ئیماندااران لەبەهەشت و بێباوەڕان لە دۆزەخ.

دووەمیان: (ژیانێكی فانیی)، كە بەم نزیكانە دەڕواو نامێنێ، ئەویش بریتییە لە ژیانی دونیا، ئەو ژیانی دونیایەش بریتیە لە شتی بێ سوودو یاری و گاڵتەو گەپ و پێشبڕكێ كردن لەسەر زیاد كردنی منداڵ و پارەو سامان.

تەماشـای هـەردوو ژیانەكـە بكـە، بیـر لەهەردووكیـان بكـەوە، كامەیـان دەمێنێتـەوەو چێـژ بەخشـترە؟ وەسـفەكانی بەهەشـت سـەرژمێری ناكرێـن، نیعمەتـی گـەورە بریتییـە لـە: بینینـی خـودای

بەدیهێنــەری هــەردوو جیهــان، لەگــەڵ بینینــی موحەممــەدی هەڵبژێـردراوو هەمـوو پێغەمبەرانـی تـر سـەلامی خوایـان لێبێـت، بـەڵام هەرچـی ژیانـی دونیایـە بـەم شـێوەیەیە کـە دەیبینـی، تەنانەت بـۆ کەسـانێك ئەگـەر وەکـو فیرعـەون و نەمرودیـش بژیـن خاڵـی نییـە لـە کـەم و کـوڕی و دڵ تونـدی و خـەم و خەفـەت، ئـەی دەبـێ بـۆ کەسـانی دیکـە چـۆن بـێ؟ لەگـەڵ ئـەوەش لـە کۆتاییـدا دەچنـە دۆزەخ و بەنەمـری تێیـدا دەمێننـەوەو تـا ئەبـەد سـزا دەدرێـن، هـەر جارێـك پێسـتەکانیان دەسـووتێ دووبـارە پێسـتی نوێیـان بەبـەردا دەکرێتـەوە.

تـۆ ژیانــە هەتــا هەتاییەکــە هەڵبژێــرە هەرچەنــدە ژیانێکــی پاشـخراوە، لەوانەیـە بـازرگان ئەگـەر کـەل و پەلەکـەی بـە قـەرز بـدات خێـری زیاتربـێ لـەوەی بـە نەقـدی بیفرۆشـێ، واز لـە ژیانی پێشــخراوی فانــی بێنــە، مەشــڵێ: هەردووکیــان دونیــاو قیامــەت بەدەسـتمەوە دەگـرم، ئـەو دووانـە کـۆ نابنـەوە، چونکـە ئـەو ژیانەی پێشـخراوە بـە شـوێنکەوتنی ئـارەزوەکان بەدەسـت دێـت، ئەوەشـی کـە دواخــراوە بــە وازهێنــان لــە ئــارەزووە قەدەغــە کــراوەکان و پارێـزگاری کـردن لە ئیهان بەدەسـت دێ، پێشـتر باسـهان کـرد کردەوە بەشـێکە لـە ئیـهان، زانـاو وەلیـە گـەورە هەڵبژێـردراوەکان گوتوویانە: هـەر کەسـێ تووشـی بـەڵای واز هێنان بـێ لـە ئادابـەکان، دەکەوێتە نێـو وازهێنـان لـە سـوننەتەکان، هـەر کەسـێکیش بکەوێتـە نێـو واز هێنـان لـە سـوننەت دەکەوێتـە نێـو وازهێنـان لـە واجبـات، هـەر کەسـێکیش بکەوێتــە نێــو واز هێنــان لــە واجباتــەکان دەکەوێتــە نێــو ئەنجامدانــی قەدەغــە کــراوەکان، هــەر کەسـێکیش بکەوێتــە

نێو ئەنجامدانی قەدەغە كراوەكان دەكەوێتە نێو واز هێنان لە فەرزەكان، هەر كەسێكیش توشی بەڵای وازهێنان لە فەرزەكان بێ، دەكەوێتە نێو بەسووك تەماشا كردنی شەریعەت، هەر كەسێكیش بكەوێتە نێو ئەو بەڵایە دەكەوێتە نێو كوفر، پەنا بەخوای گەورە، لەسەر ئینسان پێویستە لەهەموو كارەكانیدا پارێزگاری لە ئادابەكان بكات، بەگوێرەی توانا، خوای پەروەردگار تەكلیف لە بەندەیەكی ناكات بە شتێك بەندەكە لە توانایدا نەبێ، تەماشاكە ئەی ڕۆڵە! چۆن وازهێنان لە كردەوەی بچووك دەبێتە هۆكاری نەمانی ئیمان، خوای پەورەردگار ئێمەو ئێوەو برایان پەنا بدات لە لێسەندنەوەی ئیمان.

پاشان خوای پەروەردگارت خۆش بوێ، بەتەنها گوێڕایەڵی كردن بەس نییە، وەك پێشتر باسمان كرد كە هەندێ كەس لەمەدا تێكەوتوون، بەڵكو دەبێ ئەم گوێڕایەڵی كردنە پابەندت بكات بە خۆشەویستیەكی توندوتۆڵ تا ئەو ئاستەی هەست بە چاودێری و حزوری ئەو بكەیت، خۆشەویستییەك بۆ زاتی ئەوبێ، نەك ئەگەر پێت ببەخشێ خۆشت بوێ، ئەگەر لێشت بگرێتەوە واز لە گوێڕایەڵی كردنی بهێنی، ئەوكات ئەگەر وابوویت ئەوا ئەو ئایەتەت لەسەر جێبەجێ دەبێ كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَ ﴿١١﴾ ﴾[1]

---

(١) واتە: هەندێك لە خەڵكی هەیە تەنها لەیەك حاڵەتدا خوا پەرستی دەكات (ئەویش ئەو حاڵەتەیە كە دنیا بەدڵی ئەو بێت) ئەگەر تووشی

الحج، ئەگەر خۆشەویستیەکەت تەنها بۆ زاتی ئەو بێت، با پەرستشەکانیشت هەر بۆ زاتی ئەو بێ، بە پێچەوانەوە ئەگەر وا نەبوویت ئەوا: ئەو حاڵەی تێیدایت ناگۆڕێ ئەگەر ژیانت بەهەزار قۆناغیشدا تێپەڕێ، با خۆشەویستیەکەت لەو جۆرە بێ وابزانیت لەگەڵ ئەوەشدا کە گوێڕایەڵی دەکەیت تا ئەبەد بە ئاگر سزات دەدا، بەڵام تۆ هەر گوێڕایەڵی دەکەیت و خۆشت دەوێت و سەرپێچی ناکەی، ئەگەر خۆشەویستی خۆت بۆ خوا بەستایەوە بە بەدەست هێنانی قازانج و دوور خستنەوەی زەرەر، ئەوە خۆشەویستیەکی مەرج دارە، لەوانەیە ئەو مەرجانە نەبینی یان بۆت نێتە دی، ئەوکات خۆشەویستیەکەشت نامێنێ و دەڕوا، با خۆشەویستیت بۆ خوا بێمەرج بێ، بۆ ئەوەی تا ئەبەد ئەو خۆشەویستیە بمێنێتەوە، ئەوە سەرمایەی هەموو خێرو چاکەیەك و دوور خستنەوەی هەموو زەرەرێکە، وەك گوتراوە: هەرچی غەیری خوایە لەدڵتدا بیهێنە دەرەوە، با ڕۆشتن و ڕێگە گرتنەبەرت بەرەو خوا بێ، ئەو کات خۆی هەموو زەرەرو زیانێکت لێ لادەدا، هەموو خێرو چاکەو قازانجێکیشت پێ دەدا.

پاشان ببە بە پاسەوان لەسەر دەرگای دڵت، بۆ ئەوەی شتێکی تری تێنەچێ، زۆر زیکری خوا بکە بەدڵ و بە زمانت،

---

خێرو خۆشی بوو دڵی پێی خۆشە، خۆ ئەگەر تووشی تاقیکردنەوەیەك هات سواری سەری خۆی دەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە ئا بەو حاڵەتەی دنیاو قیامەت لەدەست خۆی دەدات.

هانــا بــۆ پێغەمبــەری خــوا ﷺ ببــەو[1] (تەوەسســولی) پــێ بكــە، پێغەمبــەری خــوات ﷺ خــۆش بــوێ و زۆر صەڵەواتــی لەســەر بــدە، وەك جێبەجــێ كردنــی فەرمانــی خــواو، بەگــەورە گرتــن و ڕێزدانانێــك بــۆ پێغەمبەرەكــەی ﷺ، زۆر خــۆت مانــدوو بكــە بــە گوێڕایەڵــی كردنــی پــەروەردگارت بــە مــاڵ و بــە لاشــە، زۆر هانــای بــۆ ببــەو لێــی بپاڕێــوە، لــە كاتــە ناسكەكانی وەك نیــوە شــەوو بــەرە بەیــان، دوای فــەرزەكان و دوای ڕۆژوو شــكاندن و (دە) شــەوی كۆتایــی ڕەمــەزان، (دە) ڕۆژی یەكەمــی مانگــی زیلحیججــە، بەتایبــەت ڕۆژی عەرەفــە، هەروەهــا یەكــەم شــەوی مانگــی ڕەجــەب و شــەوی ناوەڕاســتی مانگــی شــەعبان، شــەوی میعــراج و شــەوو ڕۆژەكانــی هــەردوو جەژنەكــەو ڕۆژو شــەوەكانی تەشریــق (أیــام التشریــق)، زۆر ســووربە لەســەر بــەڕۆژوو بوونــی هەنــدێ لــەو ڕۆژانــە، شەوەكانیشــیان زینــدوو بكــەوە بە تاعــەت و پاڕانــەوە، داوا لەخــوا بكــە عاقیبــەت خێریــت پــێ ببەخشــێ، وە یارمەتیــت بــدات بــۆ ئــەو كردەوانــەی كــە نزیكــت دەخەنــەوە لــەو.

دەســت بگــرە بــە ئەنجامدانــی دوو ڕكعــات یاخود زیاتــری نوێژی چێشــتەنگاو، ئەگــەر بــۆت لــوا، دەســت بگــرە بــە ئەنجامدانــی

---

(١) پێشــتر باســمان كــرد ئــەو كەســەی وریــا كــردەوە كە گوتــی: یا ڕەســولەڵلا، پێــی گــوت بڵــێ: یــا اللــە، ئــەم ئــاگادار كردنەوەیەشــی پێچەوانــەی ئــەو قســەیەی ئێرەیــە كــە دەڵــێ: هانــا بــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ بكــە، لەوانەیــە لێــرە مەبەســتی لــە هانــا بــۆ بــردن ئەوەبــێ كــە بڵێــی: خوایــە مــن هانــا بــۆ پێغەمبەرەكــەت دێنــم تــۆش بیكــە بــە هانــا بۆبــەری مــن و بــەدەم هانــا بــۆ بردنەكەمــەوە بــێ.

شـەونوێژ، لـە شەونوێژەكانیشـدا دڵـت سـەرقاڵ بكـە بەخـواوە نـەك بەدونیـا، ئەگەرنـا نووسـتنت باشـترە لـە شـەونوێژەكەت، هەروەهـا ڕۆژانــی (بیـض) بـەڕۆژوو بـە (چـواردەو پانـزەو شـانزە)ی هەمـوو مانگێكــی عەرەبــی، بـەڵام بـە پلـە ئـەم كارانـە بكـە بـۆ ئـەوەی لەسـەرت قـوڕس نەبـێ، هەنـدێ لـە ڕۆژوەكان بگـرە، هەروەهـا شـەونوێژیش بەهەمـان شـێوە بەپلـە لەسـەریان بـەردەوام بـە، تا وای لێدێـت خویـان پێـوە دەگـری، بەهەمـان شـێوە هەمـوو ئەركەكانـی دیكـەش پلـە بەپلـە ئەنجـام بـدە تـا دەبێتـە بەشـێك لـە سرووشـتی تـۆ.

لەسـەر ئـەو شـێوەیەی باسـم كـرد لامـەدە هەتـا ئـەو كاتـەی دەمریـت، خـوا بەخشـەرە داواكاران بێئومێـد نـاكات، هەروەهـا بـەردەوام بـە لـە خوێندنـەوەی قورئـان و زیكـرەكان ئەمانـە دەبنـە هۆكارێـك بـۆ عاقیبـەت خێـری، هەروەهـا بـەردەوام بـە لەسـەر ئەنجامدانــی زیكرەكانــی بەیانیــان و ئێــواران.

والحمدلله على الإيمان والإتمام وعلى سيدنا محمد أفضل الصلاة والسلام

## لە كۆتاييدا

پاشان، ئەمە چيرۆك و بەسەرهاتەكانی ژيانی باوكم بوو، بەڕۆحێكی بێ لايەنانە نووسيم، بە گوێرەی توانا واقيعی ژيانی ئەووم وەك خۆی وێنا كرد، بێ هيچ زێدەڕۆيی كردن و بەگەورە گرتن و فەخرو شانازی نواندنێك، وەنەبێ لەترسی سەرزەنشتی خەڵكی ئەو مەنهەج و شێوازەم بەكار هێنابێ، بەڵكو لەترسی باوكم ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەم شێوازە نوسينەم بەكار هێنا، من لەهەموو خەڵكی شارەزاتر بووم بە سروشتی ئەو، دەزانم چەندە ڕقی بوو لە زێدەڕۆيی كردن و موجامەلە كردن.

هەندێ پێيان گوتم: ئايا شتێك لە كەڕامەتەكانی ئەو نانووسی؟

گوتم: كاری من ئەوەيە مێژووی ژيانی ئەو كۆ بكەمەوە، ئەو هەڵسوكەوت و كارانەی زانيومەو لێيم بينيوە تۆماريان بكەم، خوێنەر چۆنی بوێ دەتوانێ ئەو شتەی كە تۆمارم كردووە بچێ پشكنينی بۆ بكات و لێی بكۆڵێتەوە.

ئێمە لە سەردەمێكدا دەژين قوڕسی و سەنگينی كەڕاماتی پياوچاكان سووك بووە لەسەر زمانەكان، ئێستا قسە كردن لەسەر كەڕامات بۆتە كاری ئەو خەياڵكەرانەی بۆ هەر كەسێ

بیانـەوێ بەباڵایـا ئـەدورن، بەهـاو نرخـی بەردەوامبوونـی هەقیقیـان لەسـەر فەرمانەکانـی خـوا تێـدا لەبیـر کردووە، خـۆ پارێـزی (وەرع) یـان لـە قەدەغـە کـراوەکان و خـۆ پاراسـتن لـە گومانلێکـراوەکان و ماڵـی حـەرام وون کـردووە، تەقـوا بۆتـە پۆشـاکێك تەنیـا بـۆ خۆجـوان کـردن و خۆ دەرخسـتن، هـەر کاتێـك بویسـترێ دەتوانرێ لەبـەر بکـرێ و دابکەنـرێ، زانسـت و شـارەزا بـوون لـە دیـن بۆتـە ئـەو کـەوێ و سـەڵتەیەی کـە شـان و پشـتی ئینسـان دادەپۆشـێ و جوانـی دەکات، هەرچـی زیکـرو یـادی خواشـە گـۆڕاوە بۆ تەسـبیح لەپەنجـە ئاڵانـدن، یـان پەنجـە تەقانـدن و بـەس، زەمانیـش لەگەڵیـدا واتـە لەگـەڵ زیکرەکـەدا ئـاوازی باسـکردنی دونیـاو باسـکردنی ئەم و ئـەو دەڵێتـەوە، بـەو شـێوەیەی کـە نەفـس و حـەزە شـەهوانیەکان ئـارەزووی دەکـەن.

مـن ئـەم لاپەڕانـەم بـۆ ئـەوە نەنوسـیوە ڕەواج بـە کەسـێك بـدەم، بانگەشـەو ڕێکلامیـش نییـە بـۆ خێزانێـك، بەڵکـو لاپەڕەکانـی ئـەم کتێبـە دوای قـوڵ بوونەوەیەکـی دوورو درێژو تێڕامـان و ورد بوونەوە نـووسراوە، بـۆ ئـەوە نـوسراوە بکـرێ ببێتـە پەنـدو وانـە بـۆ کەسـێك کـە پەنـدو وانـە وەردەگـرێ، ئەگـەر مـن بـە دەربڕینـی خـۆم ئـەم عیبارەتانـەم دەربڕیبـا ئـەو کاتـە دەبـووە شـتێکی ماکیـاج بـۆ کـراوو شـێوێنراو، کەواتـە باشـتر لەمـە ئەوەیـە بەکـڕی و بـە بێدەنگـی پێشکەشـی خەڵکـی بکـەم بـێ (کلـك و گـێ) بـۆ زیـادو کـەم کـردن و کۆمێنـت لەسـەر بـوون، دەربڕینـی دڵ و هەسـت و شـعور زۆر بەرزتـرو کاریگەرتـرە لـە دەربڕینـی نووسـەران و وەرگێـڕان.

منیش لەهەموو کەس لەپێشترم بە پەندو وانە لێ وەرگرتن، یەکەم کەسێك کە پێویست بێ لەسەری ئەم بەسەرهاتانە وەرگێڕێتە سەر ژیانی خۆی و بیکاتە ناوونیشانی ژیان و سلوکی خۆی، منم، بەتایبەت ئەم وەسیەتانەی کە لەکۆتایی کتێبەکە هێنام هەمووی بۆمن نوسراوە.

تا ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد، لەهەموو گۆڕانکاریەکانی ژیانم و جۆراو جۆری هەڵس و کەوتەکانم بەگوێرەی توانا خۆم پابەند کردبوو بە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو، کاتێ وەفاتی کرد بە ڕواڵەت پەردە کەوتە نێوان من و ئامۆژگاریەکانی، کەوتمە نێو هەست کردن بە تەنیاییەکی گەورە.

دوای تێپەڕینی چەند هەفتەیەك لە وەفات کردنی، لەخەومدا بینیم لە ژوورە بچووکەکەیدا دەهاتە دەرەوە ئەو پۆشاکەی لەبەر بوو کە هەموو جارێك دەیپۆشی، وەك نەریتی خۆی کە لە ژیاندا بوو گۆچانەکەی بەدەستی ڕاستیەوە بوو، بەڵام پشت و سەری ڕاست ببویەوە، بەرەو ڕووی چووم و دەستەکانیم ماچ کرد، لەخەوەکەمدا دەشمزانی کە مردووە، لەگەڵی ڕێم کردو پێم گوت: خۆزگە هەر سایەت بەسەرمانەوە دەمایەوە، خۆزگە هەر لەژێر سەرپەرشتی تۆ بووایەن و ئاگاداری کارو بارەکانمان بوای، خۆزگە بۆ هەمیشە چاودێریت دەکردین، ڕووی تێ کردم و گوتی: چۆن؟ منیش قسەکانم بۆ دووبارە کردەوە بە شێوەیەکی تر ئێستا بیرم نایە شێوازەکەی تر چۆن بوو، زۆر بە جەخت لێکردنەوە وەڵامی دامەوەو گوتی: هەروا دەبێ، هەروا دەبێ.

مــن دڵنیــام لــەوەی ئــەو چاودێریــەی ئــەو بەســەرمانەوە تــا ئەمــڕۆش هــەر بەردەوامــە، كۆتــا ئــەو بەڵگانــەش كــە وای هەژمــار دەكــەم ئاماژەیەكــی ڕوونــە لەلایــەن ئــەوەوە بریتیــە لــە دەستپێشــخەریم بــۆ نووســینی ئــەم كتێبــە.

خوێنــەری بەڕێــز! لەوانەیــە لەبیــرت بــێ ئــەو شــتەی كــە زۆر جەختـم لەسـەر كردۆتـەوەو لەسـەری وەسـتاوم لـەم كتێبـە ئەوەبـوو كـە باوكـم زۆر دەسـتەواژەی حەمـدو سـەنای خـوای گـەورەی دووبـارە دەكـردەوە، لەهەمـوو بۆنەیەكـدا بـەو پـەڕی تـام و چێـژ لـێ وەرگرتـن و هەسـت و شـعورەوە دووبـارەی دەكـردەوە، بەڵكـو هەنــدێ جــار بەبــێ بوونــی هیــچ بۆنەیــەك ئەمــەی دەگوتــەوە، دەیگــوت: ســوپاس بــۆ خــوا كــە منــی لــە دایــك و باوكێكــی مســوڵمان و ئیمانــدارەوە درووســت كــردووە، فێــری كتێــب و شــەرعی خوایــان كــردووم، وە ڕزق و ڕۆزی كــۆچ كردنــی بــۆ زەوی پیــرۆز پــێ بەخشــیم، ئــەو زەویــەی كــە خــواو پێغەمبەرەكــەی ﷺ ڕێزداریــان كــردووە، هەروەهــا بــە بوونــی منداڵــی پــاك و چــاك ڕێــزی لــێ نــاووم، دوای ئــەو تاقــە كوڕەشــم نــەوەكان و منداڵــی نەوەكانمــی پــێ بەخشــیوم، ڕزق و ڕۆزی پــێ داووم، ئەمــە ســەرەڕای ئــەوەی بەشــێوەیەك ســتری كــردم و داپۆشــیم كــە خۆشــم چاوەڕێــی ئــەوەم نەدەكــرد.

منیش ئێستا بەهەقی دەزانم بەسەر خۆمەوە بڵێم:

سـوپاس و سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی كـە لـە دایـك و باوكێكـی مسـوڵمانی ئیمانـدار منـی هێنایـە دونیـاوە، كتێـب و شـەرعی ئەویـان

فێر کردم، ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕێزی لێنام بە باوکێك کە هەڵس و کەوت و ڕێگاو عادەت و نەریتی لە دونیادا بریتی بوو لە بەگەورە گرتنی خوای بەرزو مەزن، بە ئومێدو هیوای ئەوەی خوای گەورە بەبەزەیی خۆی من و منداڵەکانم بخاتە نێو شەفاعەتی ئەوو، دوای شەفاعەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ، بەو موژدەیەی کە لەو فەرمایشتەیدا هاتووە ﴿أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ ﴿٢١﴾﴾ الطور، هەروەها موژدەی دووەم ئەو خەوە بوو کە بەر لە وەفاتی بینی، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە منی لەژێر چاودێری ئەم باوکەمدا گەورە کرد، فێری کردم و پەروەردەی کردم و کاری بۆ پاککردنەوەم کرد، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی بە پشك و بەشێکی زۆرەوە هیجرەتی بۆ ئەو زەویە ڕێز لێگیراوە پێ بەخشیم، لە شوێنەوارەکانی ئەم کۆچەش ئەوەبوو کە خوای پەروەردگار ڕێزداری کردم بە گەیاندنی قوڕئان و پڕبوون و تێربوون بە خۆشویستنی باشترینی دروستکراوانی، ئەگەر لەو شوێنەی خۆم بمابامەوە کە خاڵی بوو لە زانست و شەوق و ڕووناکی ئەم دینەو نەزانی تێیدا بڵاو بوو، ئەوا ئەمڕۆ من شوانێك بووم لە قەدپاڵی چیاکان، یاخود جوتیارێك بووم لە کێڵگەیەك، لەنێو تاریکی نەزانیدا ژیانم دەگوزەراند، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی وەسیەتی ئەو باوکەمی کە بۆی نوسیبوومەوە کرد بە زمانێکی گویاو منی پێ دەدواند، دوای وەفاتیشی ئەو وەسیەتانەی مایەوە بە ئومێدی ئەوەی دەستی پێوە بگرم، بەگوێرەی توانا تا مردن لێی لانەدەم، داوا لەخوای پەروەردگار دەکەم دڵم پاك بکاتەوە

لـە غەیـری خـۆی، بـۆ ئـەوەی نەبێتـە بەربەسـت لەبـەردەم هەوڵدان بـۆ بەدەسـت هێنانـی ڕەزامەنـدی ئـەو، تاوەکـو خـۆم حەبـس نەکەم لەدونیـای هیـچ تاکێـك یـان کۆمەڵێـك، بەپاڵنـەری ئـارەزوو تەمـاح تێکردنیـان یاخـود لـێ ترسـانیان، بـەم جـۆرەو بـەو حاڵـە شایسـتەی ئـەو دێـرە شـیعرە بـم کـە هەمـوو جارێـك باوکـم دەیگوتـەوە:

إذا صح منك الود فالكل هين ... وكل من فوق التراب تراب

ئەگـەر دێ و مـن خۆشەویسـتی تـۆ بەدەسـت بێنـم و، تـۆش منـت خـۆش بـوێ، ئـەو کات هەمـوو شـتێکی تـر ئاسـانە، خـۆ هەرچـی لەسـەر خۆڵـە هـەر خۆڵـە.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

# نـــاوەڕۆك

# ئەمە (باوکم) ە !

زانای پایە بەرز شێخ موحەممەد سەعید ڕەمەزان بووتی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) لە دوو توێی ئەم کتێبەدا باسی چیرۆک و بەسەرهاتی باوکی دەکات هەر لەسەرەتای لەدایک بوونیەوە تاوەکو وەفاتی، باوکی یەکێک بووە لە زاناو عاریفە گەورەکانی کورد، خەڵکی جەزیرەی بۆتانی کوردستانی باکوور بووە، پاشان لەبەر خراپی دەسەڵاتی ئەتاتورک خۆی و خێزانەکەی کۆچ دەکەن بۆ وڵاتی شام، لەوێش دەبێتە یەکێک لە کەسایەتییە گەورەکانی ئەم وڵاتە، ناوو شۆرەتی بڵاو دەبێتەوە بە زانستی زۆرو تەقواو خوا پەرستی دەناسرێ، شێخ بووتی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) هەروەک خۆی لە پێشەکی چاپی دووەمی کتێبەکەدا ئاماژەی پێکردووە ئەم کتێبە بەراوورد بە کتێبەکانی دیکەی دەنگدانەوەیەکی زۆری بەدوای خۆیدا هێناوەو بووەتە جێی سەرنجی نەک هەر کەسانی دیندار، بەڵکو کەسانی دوور لە دینیش باوەشیان بۆ کردۆتەوەو گرنگیان بەخوێندنەوەی داوە.

بەندە ئومێد دەکەم توانیبێتم لە ڕێگەی وەرگێڕانی ئەم کتێبەوە خزمەتێکم بەم زانا گەورەیەی کوردو خوێنەری کورد کردبێ، خوای پەروەردگار بیکاتە تێشووی قیامەت بۆ نووسەری کتێب و باوکی ڕەحمەتی و منی وەرگێڕیش بکاتە ڕێبوارو خزمەتکاری ئەم ڕێگای بەرەو خوا چوونە. (وەرگێر)


COVER DESIGN
07504808081

کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

07504671394 - 07824671394
فەیس بووك : کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
هەولێر - بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری ▪ نرخ : 6000